ژمارەی تایبەتی چیرۆك

# بەیان



ژ ١٤٨ تشرینی یەکەم ١٩٨٨



- محمد مولود مەم
- عەرەبی شەمۆ
- أحمد محتار جاف
- حسن قزلجی
- محرم محمد أمین
- لطیف حامد
- أمین میرزا کریم
- محمود أحمد ئازاد
- جمیل صائب



# وشەی پرشنگدار

**بە بێ خۆ بەستنەوەو بە بێ دوو دڵی‌و بە بێ ترس بنووسن ئەگەر چی دەوڵەت رازی بێت یان رازی نەبێت لەوەی دەینووسن...**

**سەرۆکی فەرمانده**
**صدام حسين**

# لەم ژمارەیەدا

# بەیان

**گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبییە**


سەر نووسەر

**مصلح جەلالی**

**سکرتێری نووسین : ئازاد شوان**

**دەستەی نووسەران**

د. احسان فؤاد
د. کاوس قفطان
د. عزالدین مصطفی رسول
مصطفی نەریمان
عبدالرزاق بیمار
محمد مصطفی حمە بۆر
احمد محمد اسماعیل
محمود زامدار
حسین احمد جاف
صبری بوتانی
أحمد عبدالله زەرۆ

**مۆنتیف و خۆش نووس نزار بەزاز**

ناونیشان

دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
وەزیریە تەنیشت « المعهد القضائی »
ت ٤٢٥١٨٤٦ پێنج خەتە


بەرگی یەکەم:
رابەرانی هونەری چیرۆك نووسینی کوردی، یادگاریان لە کۆری تایبەتی (بەیان)دا سەر لە نوێ دەدرەوشێتەوە.

بەرگی دووەم:
وێنەیەك لە ژیانی کوردەواری.


ئابوونەی ساڵانە لە ناو عێراقدا ۱۰/۰۰۰ دینارە


تکایە هەر نووسەرێك خەتەکەی خۆش و شاش و جوان نەبێ نووسینەکەی دەخرێتە پشت گوێ


نرخی ٤٠٠ فلسە

بەیان ژمارە ١٤٨ تشرینی یەکەم ١٩٨٨

# ئەم ژمارەیە..

دەستەی نووسەران و کارگێرانی ئەم گۆڤارە کەیف خۆش و شادمانن بەوەی ژمارەیە کی تری، تایبەت بە کورتە چیرۆک بخەنە بەردەستی خوێنەوارانی. بەمەش ئەرکێکی سەرشانی خۆیان بەجێ هێناوەو بە خزمەتی ئەدەبی کوردییان زانیوە ئێمە نالێین چیرۆکەکانی ئەم ژمارە تایبەتییە لەسەدا سەد ڕووی ڕاستەقینەی چیرۆکی کوردیلە کوردستانی عیراق دا دەردەخا. بەڵام بەوەی کە زۆربەی چیرۆکنووسە ناسراوەکان لەگەڵ شێوازی نووسینی جیاجیایان دا و بەشداری کردنی هەندێ چیرۆک نووسی لاو کە چەند ساڵێکە چوونەتە ژێر باری خەمی چیرۆکەوە تا ڕادەیەکی چاک باری چیرۆکی کوردیمان بۆ خوێنەواران و ڕەخنەگران و لێکۆڵینەرەوان دەست نیشان دەکات و دەخاتە ڕوو.

ئێمە بە تەماین ژمارەکە بخەینە بەردەستی دوو ڕەخنەگر کە بۆچوون و شێوازی ڕەخنەییان جودابێ بۆ ئەوەی بینرخێنن و هەڵسەنگاندنێکی بابەتییانەشی لەسەر بنووسن تا کارەکەمان سوود بەخش ترو تەواو تربێ. بەڵێنیش دەدەین هەندێ لەو چیرۆکانەی کە شیاوی ئەوەبوون لەم ژمارەیەدابن. بەرەودوا لە ژمارەکانی داهاتوودا بڵاوەکرێنەوە هەروەها ریزکردنی چیرۆکەکان بەم شێوەیەی لە بەردەستایە پێوەندیی بەکاری هونەریو چلەوە هەیە هیچیتر.

هیواداریین لەساڵی داهاتوودا بتوانین ژمارەی تایبەتیش بۆ شیعر ئەدەبیمناڵان و ڕەخنە دەربکەین ئەم کارەش بێ یارمەتیو پشتگیری ئێوەبە ئەنجام نادرێ.. دەبا وشەی پیرۆزی کوردی هەر گەشاوەبێ

هەر لێرەشدا سەری ڕێزو ئەوازش و چەپکە گوڵ لەسەر گۆڕی ئەو چیروکنووسانە دادەنێین کە لە بنیات نان و گەشەپێدانی چیرۆکی کوردیدا ڕەنجی مەردانەیان داو خەم و خۆزگەی مرۆڤی نەتەوەکەی خۆیانیان دەربڕیو ژیانێکی نوێ تریان بۆدەست نیشان کرد. هەزار ڕەحمەت لەگۆڕی فۆادتە مۆ، جمیل صائب، احمد مختار ، فائق کاکەئەمین، محمود احمد، علاء الدین سجادی عەرەبی شەمو، حسن قزلجی، لطیف حامد، امین میرزا کریم، مەمو هەموو ئەو بەهەشتیانەی لەڕازاندنەوەی باغچەی چیرۆکی کوردیدا گوڵیان چاندووە.

**أحمد محمد اسماعیل**

# خەونی شەوێك



إسماعیل رسول

لەوكاتەی سەرماوسۆڵی زستانە سەختەكە، خانووە گەرمەكانی گەرەكەكەی لوول دەدا؛ ئەو هێشتا لە نێو نوێنە گەرمەكەی دا ئەم تەنیشت و ئەو تەنیشتی دەكرد، ئەو بیرەوەریانەی كە هەر لە سەردەمی منالی‌یەوە تا لە تەمەنی پەنجا سالیش تێپەری كرد، لە گەلی دەژیاو كاوێژی دەكردەوە.. بەدرێژایی ئەم سالانە؛ لەكاتی بەئاگاهاتن و خەونەكانیشی دا، وێنەكانی ئەم بیرەوەریانەی دەهاتنەوە بەر چاوی؛ هەروەكو رووداوەكانی رۆژێك لەمەو بەر رووی دابێت..!

.. ئەمشەوەش هەروەكو شەوەكانی دیكە؛ بیر و ئەندیشەی بەرەو رابوردوویكی دوور دەچوو، ئەم ئێشەی كە لە پەناو پێچی دلی‌دا شاردبوویەوە، دووبارە دەی وروژاندەوەو ئەم ئارەزووانەی كە لە قوولایی دەروونی‌دا خەفە كرابوون، كە هەر لەسەردەمی منالێتیەوە تاسە جۆش دراوەكەی بۆ سۆز و خۆشەویستی و لاواندنەوە.. بۆ ماچێكی سوزناك لەسەر دوو گۆناكەی؛ ئاگری خۆشەویستی‌یەكی ئەوتۆی هەلایساند، كە گلپەكەی قەت نەكوژێنەوە.. زۆر بیركردنەوە، بەتەواوی مێشكی ماندوو كردبوو، هەستی بەسری‌یەك كرد، دەپرژێتە تەنی، دوو پێلوكەشی قورس دەبن و دەكەونە دوو گلێنەكەی چاوی؛ كەوتە ناو خەوێكی قوولی ئەوتۆ ئاگای لە هیچ نەما. بەلام پاش ماوەیەكی كورت، دوو گلێنەكەی لەژێر پێلوكانیان دا كەوتنە جوولە، هەناسەكانی بەخێرایی بەدوای یەك دا دەرۆیشتن: هەروەكو لەرێگایەكی دووری بێ پایان دا رابكات وابوو!.. گوێی لە تەقە تەقێك بوو، لە دەرگەی ژوورەكەیەوەبەرز دەبۆوە، یەكسەر راپەری و ترس دای‌گرت!.. دەبێ ئەوە كێ‌بێت؟!.. دزەو هاتۆتە ناو خانووەكەمان؟!. بە تۆقینەوە هەلسایەوە. بەلام تەقەتەقەكە وەستا. رۆبەكەی هاویشتە سەرشانی و گلۆپی ژوورەكەی پێ‌كردو بەرەو رێرەوەكە چوو؛ بەلام كەسی بەدی نەكرد. لە پەنجەرەكەوە سەیری دەرەوەی كرد، گوێی راگرت: بەلكو گوێی لە دەنگێك یا چرپەی پێ یەك دەبێت، بەلام هەرچەندە شەوقی فلۆرەنسەكان حەوشەی دەرەوەو باخچەكەشی رووناك دەكردەوە؛ هیچی نەهاتە بەرچاوو هیچیشی نەبیست..!.. بۆ ژوورەكەی گەرایەوە. بەلام خۆی نەخزاندە ناو نوێنەكەی؛ بەلكو لە سەری دانیشت و پالی بە رۆخی سیسەمەكەی، دایەوە؛ هەستی بە هێور بوونەوە كرد. لەوەش دلنیا بوو كە هیچ كەسێك خۆی نەكوتاوەتە ناو خانووەكەوە.. بەلام پاش تاوێك هەمدیس گوێی لە دەنگێكی بەرز بوویەوە كە پەردەی پەنجەرەكەی وەلادا؛ چاوی بە رەشەبایەكی بە تەوژم كەوت بە توندی چلەكانی دارخورماكەی تەنیشت تەیمانەكەیان دەهەژێنێتەوە لە دلی خۆی‌دا گوتی: لەوانەیە دەنگی تەنەكە ئەوتە بە تالەكە

بووبێ ، ڕەشەبا تووڕی هەڵدابێ . . ! . . .

ژوورەکەی گەرم بوو، چونکە هەر لەئێوارەوە سۆپا کارەبایی یەکەی نەکوژاندبۆوە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش ، پێنخەفەکەی ڕاکێشـایەوە سەر خۆی، پاش تاوێك خەو گرتی، دووبارە جیرەی دەرگاکە بە ئاگای هێنایەوە: هەردوو چاوی کرەوەو لە دەرگاکە ڕاما بەڵام حەپەسـان دای گرت! . . دەرگـاکـە تۆزە تۆزە دەکـرایەوە، پاشـان ئافـرەتێکی بەژنـو باڵا درێـژ هاتە ژووری؛ کراسێکی سپی درێـژی لە بەردا بوو، دامێنـەکەی گەیشتبوو، هەر دوو پێ یەکانی، پێـخـەفـەکـەی لە سەر خۆی وەلاداو لەسـەر نوێـنـەکـەی هەڵتـوروشکـا، پێڵوەکـانی هڵگلۆفی دووبـارە بە حەپـەسـانەوە سەیـری ئافرەتەکەی کردەوە . . قژەڕەشەکەی ژنەکە. بەسەر شان و ملی دا شۆڕ دەبـۆوەو وەکـو دارستـانێکی چڕ دای‌دەپـۆشـت، دوو هەنگـاو هاتـە پێشەوە، لە ناوەندی ژوورەکەدا ڕاوەستا . . ئەویش هێشتـا هەر سەیـری دەکـرد . . . دوو چاوە ڕەشـە گەورەکانی، کە برژانگـە ڕەش و درێـژەکـانی وەکـو پەرژین دەورەی دەدان، بە ئارەزووتـا سەوە تێی ڕادەمـان . . تیشکێکی بریقەداریان لێ‌دەهاتە دەرێ و خۆی دەخـزانـدە قوولایی دوو گلێنـەکـەی . . مـاوەیـەك چاوەکـانیـان لە یەکـدی چەقین، بەتێ‌ڕوانینێکی دوورو درێـژو سۆزنـاکـەوە، سەیـری یەکتـریـان کرد، بە حەپـەسـانـەوە پیـاوە پرسی :ـ ئافرەت تۆ کێیت؟! . .

ژنـە خەنی ، لەژێـر دوو لێوە لەیەك ترازاوەکانی‌دا ددانی سپی وەکو دوو ڕیـز دانـە مرواری بە دەرکـەوتـن ، تیشکێکی بە شەوق لە ڕوخـسـاری یەوە دەهـاتـە دەر، وای هەست پێ‌کـرد کەوا ڕۆژە بریسکـە دەداتەوەو تیشکەکەی ئاراستە دەکات. بەدەنگێکی ناسك و سۆزناکەوە . ژنەگوتی:

ـ ئەحمەد گیان . . گوایە نام ناسیەوە؟!

کابرا لەجێگاکەی بێ‌جووڵە مایەوەو بە حەپەساوییەوە سەیری دەکرد . . . ! .

ژنە هەنگاوێکی تر هاتە پێشەوە، دووبازووە درێژەکانی بۆی درێژ کرد :ـ دەڵێم وەرە پێش ، ئەی خۆشەویستەکەم . . . چەند بەتاسەم بوت؟! .

ئەحمەد بەدەنگێکی بەرزەوە قیژاندی:

ـ بەڵام تۆ کێیت؟! .

ـ نام ناسی یەوە؟! . . تو ئەوخوایە لە بیرت کردووم؟!

. . بیـرکـەرەوە، بزانـە من کێم . . ! دەڵێم وەرە پێش؛ دەمـەوێ بتخـەمـەئـامێـزم بتگـوشـمـە سەر سینگم ، کە ئارەزوو تاسـەی سـاڵانێکی دوورو درێژی . . دوورو درێژی تێ‌دا دەشارمەوە . . لەسـەر سیـسـەمەکەی هەڵسایەوە لە نزیکیەوە وەستا، بەجۆشەوە لە دەمـوچـاوە سپی‌یـەکـە ی‌و دوو برۆ ڕەشـە باریکەکەی کەوەکو دوو مانگی یەك شەوە، دەورەیـان لە دوو چاوەکـانی دەدا ؛ ڕادەمـا . بیـووره . . بیـوره . هەرچـەندە ڕوخسارت لە زەینم دا بزر نی‌یە ؛ بەڵام ساڵانێکی دوورو درێژە ئەم دیوی‌و باش نایێتەوە یادم . . ' . پاشـان بە هەردوو لەپی سەری گوشی‌و کەوتـە بیرکردنەوە! . . ئەم دەمـوچـاوە پرشنگـدارەو ئەم پرچە ڕەشەی سەر شانت ؛ وێنەیان لە ناخـی دەروونـم دا هەڵـواسـراوە . . ئـەی خوایـە، چۆن نایـەتـەوەیادم؟! . . ها . . هاتەوە بیرم . . هاتەوە بیرم . . کە بۆ لای ژنـەکـە خۆی هەڵکـوتا، بازووەکانی هێشتا بۆی درێژ کرابوون ، بەتیـژی قیـژانـدی ، و قیـژە کەشی لە هەموو سوچێکی خانوەکەدا دەنگی دایەوە:

. . دایە گیان . . دایە گایان . .

خۆی لە ئاوێنـە خڕوزلـەکـەی سەر مێـزە دارەکەی بەرانبەری . داو رمبـەی لیـوەهێنـا، پاشـان بەبێ هۆشی بەربووە . ! ژنەکەی کەدوو شەوە لە ژووری کچـەکـەی کە تووشی نەخـۆشی‌یـەکی کت وپـڕ هاتووە . دەنوێت، چریکەی پیاوەکەی ڕاى چڵەکاندو بەپەلە بەرەو ژوورەکـەیـەوە چوو. دەرگـاکـە بەتەواوی پێوە نەدرابوو؛ کە هاتە ژووری ، بە حەپـەسـاوی‌یـەوە چاوی بە مێـردەکـەی کەوت بەبێ هۆش کەوتۆتە سەر ڕایەخەکەو ناو چەوانی زامدار بووەو خوێنی لێ دەچـۆڕێتـەوە، لە تەکیـەوەش پارچـەوپـڕوچی ئاوێنـەوردوخاش بووەکە پەرش و بڵاو بوتەوە. ماوەیەك تێی‌ڕاما، هەستـێکی ترسناك شاڵاوی بردە سەر، بەتیژی قیژاندی و کوڕو کچەکەی بانگ کرد.

ئەوانیش لە بەر چریکە ی دایکیان هەموویان ڕایان کردە ژوورەکەو| پرسیان:

ـ دایە چی‌یە . . چی ڕووی داوە؟! .

ـ وەرن باوکتان . . خێرابن . . نازانم چی بەسەر هاتووە؟!

بەپەلە ئاویان پرژاندە سەر دەموچاوی و بە خاولی‌یەك ڕێچکەی خوێنی تێکـەڵاو بووی عارەقـەی ناوچـەوانیـان سڕی‌یـەوە، بە تونـدی دەستیـان هەژانـدەوە، ژنـە سەوی مێـردەکەی هەروەکو سەری منـاڵـێکی ساوا خـستـە باوەش ماچێکی سۆزنـاکی لە ناوچـەوانی کرد، دوو چاوەکـەی پڕی ئەشـك بوون و کەوتـە نووزە نووز:ـ مێردە خۆشە ویستەکەم نازانم چیت بەسەر هات.

ئەم دیمـەنـە هەمـوویـانی تۆقـانـد؛ کچـە دایە پرمەی گریان و کوڕەش ڕەنگی هەڵبـزرکـاو بەتـەواوی شڵەژا . . بـەڵام هێندەی پێ‌نـەچـوو، پیـاوە بەهـۆش هاتـەوە کە چاوی کردەوەو سەری خۆی لە باوەشی ژنـەکـەی‌دا دی، نواری‌یـە دووچـاوە ڕەنـگ هەنگوینیەکانی؛ کە ببوونە دوو گۆمی فرمێسك پاشان سەرنجی

دایە دەموچاوە توقیوەکانی دەوروپشتی. هەستی بە شلەژان کرد. یەکسەر راست بووەو پرسی:

- چی‌یە؟! چیتانە..؟!

پەرداخێک ئاوی سارد‌یان بۆ هێنا. بەیەک کەرەت هەڵیقوڕاند بازوویان گرتوو بردیانەوە سەر سیسەمەکەی. بەڵام ژنەکەی وازی لە پرسیار کردن نەهێنا:

- پیاوەکە پیمان نالییت چیت بەسەر هات؟!.

- داخەکەم. پی‌نەگەیشتم. پیی نەگەیشتم!.

- کی؟!

- دایکم.. دایکم..

- پیاوەکە دەخوت ... کەوە.. نازانم چیت بەسەر هاتوە؟!

.. گوایە نازانت ... ئیستا لە گۆرەکەی‌دا بووەتە مشتێک خۆڵ؟!.. ... شەو رۆژ مێشکت بەوەوە جەنجاڵە. خەونی پیوە دەبینی. ناوی هەر لەسەر زارتە!.

- ئافرەت. هێندە بەتاسەم بوی. وەختە بسووتێم.. من تەمەنم هەر سی سال بوو. کە ئەو مرد؛ هیچ شتێک لە بارەیەوە نازانم. غەیرەز ئەو بیرەوەریانەی کە باوکم بۆی دەگێرامەوە. یا لە پلە خەجیجی دراوسێ‌یە کۆنەکەمان و دەستە خوشکە دێرینەکەی دایکم. گویم لی‌دەبوو. کە ئەویش پێش دوو ساڵ ئەمری خوای کرد.. لیم دەپرسی!.. پلە خەجیج دایکم چۆن بوو.. جوان بوو؟. بە هە نیسکەوە وەرامی دەدامەوە:- بەڵێ کوڕم - خوا لیی خۆش بی - زۆر جوان و شۆخ و شەنگ بوو. وەکو سپیدار باڵابەرزو قەد باریک بوو. دوو چاوی گەورەو رەشی پیوە بوو؛ وەکو ئەستێرەی گەلاوێژ دەدرەوشانەوە. پرچێکی رەش و چڕیش. هەر لەسەر شانیەوە تا ناوەندی پشتی شۆڕ دەبووەوە... بەم جۆرە وەسفی ئادگاری دایکمی دەکرد پیی‌دا هەڵ دەدا. منیش گوێم دەدا قسەکانی. هەستم پی دەکرد وا دەروونم دەهەژێنێتەوە؛ وام دەزانی ئاوازی موسیقایەکی خۆشە دەپرژێتە ناو دڵم و تەمی خەم و کە سەری هەتیوی لە سەر وەلا دەبردم باوکم ئیستاش. هەر چەندە پیری چەماندوەتەوەو تەمێکی چڕی خستوتە سەر دووگڵێنە کەی چاوی و وای لی هاتوە لە تروسکە رووناکیەک زیاتر هیچی تر نەبینیت وبەزەحمەت روخساری خەڵک لەیەک جیاواز بکاتەوە هەمان حیکایەت و سەر گوزشتە کۆنەکانی کە پەیوەندی بە دایکمەوە هەبیت. بۆم دووپات دەکاتەوە.. من نازانم تا چ رادەیەک ئەم قسانەی راستن. بەڵام هەمیشە. لە روخساری و . لە جۆری گێرانەوەی بیرەوەریەکانی‌دا؛ خۆشەویستی‌و وەفاداری ئەو بەرانبەر بە دایکمی لی بەدی دەکەم...

- ها.. وەفاداری؟! کەواتە بۆچی دووبارە ژنی هێناوە؟! پاش مردنی چی بۆ کرد؟!.. چەند جار چووەتە سەر قەبرەکەی؟!.. لیی بپرسە. شوێنی قەبرەکەی لە کوێ‌یە؟!.. بەڵام پیاو کەی وەفای بۆ ژن هەبووە؟!

پیاوە هەناسەیێکی هەڵکێشا. جارێکی تر خۆی بە پێخەفەکە لوول دایەوە. لەژێریەوە گریا... هاتەوە یادی کە ئەو بەتەواوی شوێنی گۆرەکەی دایکی ناناسیت!. هەر ئەمەشە بووە بە کەسەرێکی زل لەسەر دڵی؛ چونکە بە درێژایی چل ساڵی رەبەق سەری لە گۆرەکەی نەداوە.. کە هێشتا منداڵ بوو. ئیواران دەچووە گۆرستانە نزیکەکەی شارۆچکە دوورەکە. کە سەردەمی منالەتی لی بردەسەر؛ لەتەنیشت گۆرەکەیەوەو لەسەر زەوی‌یە بەگیاو گوڵەکە. رادەکشاو لەشە لاوازو بچکۆلەکەی تی وەردە ئالاندو بەکوڵ دەگریا. تاو ئەو کاتەی برادەرە بچووکەکانی هاوتەمەنی خۆی. لە گۆرەکەیان رادەبچرکاندو دەیان بردەوە ماڵەوە. کە گەورەش بوو و گەیشتە تەمەنی هەشت نۆساڵی‌و چووە قوتابخانەو لای مەلا قورئانیشی خەتم کرد. هەمیشە سەری لەگۆرەکە دەداو چەند جارێکیش لەسەر ئەم گۆرە قورئانی خەتم کردو بە دیاری بۆ گیانی پاکی نارد. بەڵام هەر لەوکاتەی ئەم شارۆچکەیان جی هێشت و خۆیان نگومی عەشاماتی شارە گەورەکان کرد و باری قورسی ژیانیان خستە سەر شان و ئەویش گەیشتە تافی لاوی‌و ژنی هێناو خیزانێکی نوێی کەوتە ئەستۆ. چیتر نەگەرانەوە شارۆچکەکە بەڵام خەیاڵی دایکی بۆ هەر کوی‌یەک بچووبایە وەکو سیبەری خۆی لیی جیاواز نەدەبۆوە. ئای کە کوڕێکی بی ئەمەک بووم؟.. چۆن ئەم ماوەیە دوورە تی‌پەڕی‌و هەڵیکم نەرەخساند تا سەر لە گۆرەکەی بدەم؟... دەبی گۆرەکە مابیت.. بەڵام چۆن بیدۆزمەوە؟!...

ژنەکەی. خۆی و کوڕو کچەکەی لە ژوورەکە چوونە دەرەوەو لە دوای خۆیان دا دەرگاکە یان پیوەدا. دایکە پیانی گوت:

- باوکتان جی‌بیڵن. با بنوێت.

بەڵام باوکە خەو نەچووە چاوی. لە پەناو پێچی بیرەوەریەکانی بەدوای روخساری دایکی‌دا دەگەرا؛ دەی ویست ئادگاری لە گەڵ وینەی ئەو ئافرەتەی پێش سعاتێک لیی هاتە ژووری. بەراوورد بکات. رووداوێک هاتەوە یادی. لەوانەیە ببێتە بەڵگەیەک وروخساری دایکی بەبیر بهێنیتەوە: چونکە تەنیا رووداوە تاکو ئیستا وێنەکەی لە مێشکی‌دا چەسپاوەو هیچی تریشی نایەتەوە یاد!... ئەویش پەنجا ساڵ رووی دا؛ ئەوساکە منالێکی بچووک بوو. لە گۆرەپانە خوڵاوی‌یەکەی پێش

مالیان لەگەڵ ڕەوە منالیك یاری دەکرد کە چریکەو هاوار لە مالیان دەهاتە دەر. دیتی: پیاوژنی گەڕەکەکە بەهانای چریکەکەوە دەچن وخۆیان دەکوتنە مالەکەیان یەکسەر لە گەمە کردن وەستا. منالەکان هاواریان کرد: . ئەحمەد ئەوە لە مالتان چ قەوماوە؟!. بە پەشۆکاوی یەوە بەرەو مالیان غاری دا. لەبەر دەرگای حەوشەیان کۆمە لیك پیاو بە خەمباری یەوە ڕاوەستا بوون. یەکێکیان ویستی بیگرێت. بەلام ئەو خۆی ڕاپسکاندو هەڵی کوتایە ژوورەوە: کە چاوی بە جوستەی ئافرەتێکی ڕووتی درێژکراو لەسەر دارە مەیتێك کەوت. ڕەق وەستاو حەپەسا. چەند ئافرەتێك دەورەیان لەلاشەکە دابوو و دەیان شوشت و بە جام ئاویان دەڕژاندە سەر. . تاوێك لەم دیمەنە ڕاما و لەپڕ قیژاندیو خۆی هاویشتە سەر جوستە ساردوسڕو ڕەقەبی گیانەکە. کە پرچە ڕەش و چرەکەی بە سەر شان و ملیدا شۆڕ ببوەو هەر دوولای دار مەیتەکەی داپۆشی بوو سنگە ڕووتەکەشی وەکو بەفری کوێستان سپی دیار بوو. بەلام دەموچاوی زەرد هەلگەڕابوو. بەتوندی سەری هەژاندەوە.

دەمە بچکۆلانەکەی بە گونا زەردهەلگەڕاوەکەیەوە نووساند. پاشان دایە چریکەیێکی تیژ دایە.. دایە.

باوکیشی شێتانە لە حەوشەکەدا هەلدەپەڕیو بە دوو دەست کەللەی دەکوتایەوە. دەگریاو هاواری دەکرد: ئامینە ڕۆ . . ژنە خۆشەویستەکەم ڕۆ. . دایکی ئەحمەد ڕۆ. . پاش ئەوە ئەی زانی چیدی ڕووی دا. چونکە ئەوە تەنیا دیمەن بوو لەزەینی دا مابوەوە. هیچ شتێکی تریش دەربارەی دایکی نایەتەوە یاد غەیرەز ئەوەی کە لە سالانی دوایی‌دا لەم و ئەو گوێی لێ دەبوو.

. . ڕۆخی پێنخەفەکەی لەسەر دەموچاوی وەلاداو بەدەنگێکی بەرز گوتی:- بێ گومان ئەو ژنەی لیم هاتە ژوور دایکم بوو. . ئا خۆی بوو: هەمان جوستە بوو کە لە سەر دارەمەیتەکە درێژکرابوو. هەمان ئادگار بوو. . بۆیە هاتبوو لومەم بکات. بەلام دایەگیان: بڕوات پێم هەبێت. کە تۆ هەمیشە لە دڵ و دەروونم دا بوویت شەو ڕۆژ وێنەکەتم دەهێنایەوە بەرچاو نیگارتم لە زەینم دا بە شێوەی جوانترین ئافرەت لەم دونیایەدا دەکێشا. کە مەزنترین خۆشەویستی لەناخی دەروونی دا حەشار دەدات. . دایە گیان لیم ببوورە. چونکە تێچڕانی ژیان و ڕێبازە سەختەکەی. وای لێ کردم بەتەواوی بەئەرکی کوڕایەتی هەڵنەستم. . دڵنیا بە بە شوێن گۆڕەکەت دا دەگەڕێم و دووبارە هەڵی دێنمەوە. لە دەورو پشتێشت درەخت و گوڵ و ڕیحان دەڕوێنم. دەیکەمە مەزاریکی نایابی هەمیشەیی. بۆ خۆم و نەوەکانم. دەبینی چیت بۆ دەکەم. . بەلام بەداخەوە. هیچ وێنەیەکی تۆم لا نی یە لە پێشەنگی ئەو قەفەزەی بۆتی دروست دەکەم. هەلیواسم . ئارامت هەبێت: ئەم کێشەیەش چارەسەر دەکەم. نیگارکێشێکی کارامە ڕادەسپێرم. نیگارەکەت هەروەکو لەزیارەتی دوایت دابینیم. بکێشێت. . لەوی هەڵی دەواسم. تابلۆیەکی تریشت لە ژوورەکەی نوستنم. لە سەر سەرمەوە. هەلدەواسم. . هەر سبەینێ دەچمە شارۆچکە دوورەکەو لە گۆڕستانەکەی دا بەشوین گۆڕەکەت دا دەگەڕێم. . دلنیا بە من بەلێنی ئەوەت پێ دەدەم.

❋ ❋ ❋

. . . ڕۆژی دووەم چووە مالی باوکە پیرەکەی. بەهاتنیگە شایەوەو خۆشنوودی گرتی. کوڕە ئەوەی دوێنێ شەودی بووی . بۆ باوکی گێڕایەوە. باوکە بە پەرۆشەوە گوتی: بەڵی کوڕم. خۆیەتی. هەمان بەژنو بالا. هەمان چاوو هەمان پرچە ڕەشەکەیەتی. چەند دلۆپێکی فرمێسك بەسەر ڕوومەتە لۆچاوییەکەیدا ڕێچکەی بەست. بە هەنیسکەوە گوتی:

- لەکاتی ڕوح دان دا بوو کە ناوی تۆی دەهیناو دەی گوت: «کوا ئەحمەد. پیاوەکە زۆر ئاگات لیبێ. . بەساوایی بۆتی بەجێ دیلم. نەکەی دلی بشکێنی». تو بۆ ئەو مانگێك بووی ژیانیت ڕۆشن دەکردەوە. ڕەحمەتی خوای لی بیت. کە جوانەمەرگ بوو هێشتا لە تافی جحیلی دا بوو. تۆ کوڕە گەورەی بووی. .

- کەواتە باپیکەوە بچینە شارۆچکەکە. لە گۆڕستانەکەی دا. گۆڕی دایکم بدۆزینەوە. . من بڕیاری ئەوەم داوە. قەبرەکەی سەر لەنوێ دروست بکەمەوە. بەشێوەیەك لایەق بە خۆی بێ.

- کوڕم چاووم تروسکەیەك نابینێت. چۆن بتوانم گۆڕەکەی دەستنیشان بکەم. بەلام من وەسفی شوێنی گۆڕەکەیت بۆ دەکەم ناونیشانی چەند کۆنە دۆستێکمت دەدەمێ. ئەگەر ئەوانیش زیندوو مابن: بەلکو یارمەتیت بدەن. کوڕە بەرەو شارۆچکە دوورەکە کەوتە ڕێگا. لەوێ خۆی بە نامۆیی دی . . شارۆچکەکە بەتەواوی گۆڕابوو. زۆربەی خانووە قوڕەکان نەمابوون. لەجیاتیان خانووی بە کەرپووچ و چیمەنتۆ دروست کرابوون شەقامە گشتییەکەی دی بە خەلکی

■ چیرۆك

# پێشبینی



نور الدین صالح «بێخەم»

کەبەراستە شەقامەکەی سەرووی شاردا گلۆر بوویتەوە، خۆر سێ چارەك کەم یا زیاتری مابوو بۆ ماڵ ئاوابی کردن لە دارو بەردو خەڵــکی شار. لەنــاکــاو. . :«بـۆ مرۆف دژی مرۆف بێت؟». دەستێکت خزاندە نێو قژەکەت و شانێکت هەڵتەکاند. لە سەرەتادا ویستت بە سادەیی بۆ وەڵامەکەی بچێت، کەچی پرسیــارەکــە وەکــو زەنگی کلێســا دووبـارەو سێ بارە دەبــووەوەو بواری بیرکردنەوەی نەدایت. وەك درکەزی چەقیبە مێشکت و کێچ ئاسا دەمی ئاژنیە خوێنەکەت. مەودای بیرکردنەوەت ئاڵۆزا . نەتــزانی روو لە کوێ بکــەیت و بەرەو کام مەنــزڵ سەری کاست هەڵگــری . چەنـد شوێنێکت دایە بەر تیــری چاو . . باخچەی گشتی. . گۆڕستان . . مەیخانەکان. . بەڵام چوونت بۆ هەر خانــەیــەك لە خانــەکــان بەراکــردن لە واقیــع دەزانی. نوچێکت دا. جگــەرەیــەکت سپاردە لێــوەکــانت. لەوەڵامێــك دەگەڕای کاڵای پڕ باڵای مرۆڤایەتی بێت. کەچی دەستگیرت نەبوو. ویستت ئەو پرسیلرەش وەکو سەدانی تر وێڵ و ئاوارەی نێو دورگەی مێشکت بکەیت. بەڵام نەت توانی . تۆ مێشکت دورگــەیــەکی کاکی بە کاکی یە چەنـدان جار پرسیــارو وەڵامی ژەنــگ گرتــووی نێــو ئێسکــرابخــانەی ژیانت تێدا سەرگە ردان

■

تێچکرابوو . فرۆشیارە سەرپێیەکان، بەدرێژایی شەقامەکە لە پشت عارەبانەکانیانەوە وەستابوون . بەکۆمەڵ کڕیار دەورەیان نیــیــان دابــوو. لەوبــەرو ئەو بەری جادەکــەش. دوکــان و پێشــانگــاکــان ڕیــز کرابــوون. ئەویش بەدوێش داماوی ماوەیەك ڕویشت. بەکپی لەگەڵ خۆیدا دوا : هەموو شوێنێکی تیدا گۆراوە ئەم شارۆچکە کۆنــە نەمــاوە، کە بریتیبــو لە کۆمەڵێك خانــووی قوڕو گوزری تەســك و تروســك و تولــە ڕێگــای خوڵاویی . هیچ شتێکی وەکو جاران نەماوە. غەیرەس کویرە کانی یــەکــە نەبێت. کە بەهــاوینــان ئاوی چلك دەکــردو ئەوەتــا مزگەوتێکیان لەکیەوە دروست کردووە . گۆماوەکەی قەراخ شارەکەش نەبێت. کە هەر وەکــو جاران ئاو لەدەیــان چاوگــە بچــوکــانی ژێرەوەی هەڵدەقوڵێت تەنیا جۆگە لەیەك لەبەری . . وەخت و کێڵگەکانی سەوزەوتوتن ئاو دەدات . . لەوێ ماوەیــەك وەستــاو لە شەپۆلــە بچــوکــەکــانی گۆماوەکە رادەماو بیــرەوەریکــو سەردەمی منالەتی دەهێنایەوە بەر چاوی . پاشان گەڕایــەوە ناو شارۆچکــەکــە بەدوای خانــوە کۆنەکەیاندا گەڕا. زۆری حەز دەکرد جارێکی تر چاوێکی پیدا بخشێنێ. بەڵام بۆی نەدۆزرایــەوە. بەدوای کۆنــە دۆستەکانی باوکیدا گەڕا. هیچیان نەمابوون . بەڵام بە سۆراخ کردن کوڕی یەکێکیانی دۆزیــەوە کە لە تەمــەنی خۆیدابــوو. بردیــە ماڵــەوە. نانی نیــوەڕۆیــان پێکــەوە خوارد. بە دوورو درێــژی دەربــارەی ئەم مەبەستەی بۆی هاتووە. دوان. پاشان پێکەوە چوونە گۆرستانە کۆنــەکــەی قەراخ شارۆچکــەکــە . گۆرستــانەکە بیووە خەرابە: زۆربــەی قەبــرەکــانی لەگــەڵ خاکا بیوون بە یوك. کێلەکانیشی پیوە نەمابوو . ماوەیەك لە قەبرەکەی دایکی گەڕان. بەڵام نەیان توانی شوێنەکەی بدۆزنەوە. . !.

. . دایــە پرمــەی گریــانێکی ئالی بەئێش. کابــرای لە گەڵی. سوورەتی فاتیحــای خوێنــدو بۆ گیــانی هەمــوو مردووەکانی ژێر خاکی قەبــرستــانــەکەی نارد. پیــاوەش بەبێ ئەوەی بگــا بەو ئــاواتــەی بۆی هاتبــوو. گەڕایەوە شارەکــەی خۆی: بەڵام لە ناخی دەروونیدا گۆڕی دایکی سەر لە نوێ هەڵکەندو تەرمی ئەو ئافرەتەی کە وەکو فریشتە لە شەویکی دژواری زستان دا لــبی هاتــە ژوور. تیــیدا نیشت و کردیــە مەزارێکی جوان ئەرەنگین. هەر وەکوئە خەیالیدا نەخشەی کێشرا بوو.

١٩٨٨/١/٢

کردووه. لەوە دەچێ ئەمجارەیان داوەکە ووردتر چنرابێ و بواری دەرباز بوونت بۆ نەبێ. هێمای ماندوو بوون بەروخسارتەوە دەرکەوت. بە چەند شەقاوێك درێژی شەقامەکەت شەقار کرد. کەپێت نایە سەر شوستەکە نوسراوی سەر دیواری کۆگاکە سرنجی بینینتی بۆ خۆی کێش کرد. .[لەسەدەی بیستەمدا هەرکەسێ ئاسودەیی بوویت، ئەوا بە هەڵە لە و سەدەیەدا لە دایك بووە]. تیارامایت، لەپڕ دەستی ڕێزت خستە سەر سینگ و بەسەر گەواهیت بۆ نوسراوەکە دا. . بەلام: «کێ دەڵێ ڕاستە. .؟ خۆ لەوانەشە ڕاست بێت!! ئەی ئەوە نیەیە پێشبینی ئەوە کراوە کە ساڵی 2000 مرۆڤ و مرۆڤایەتی ڕیشە کێش دەکرێن و ئامێری ئەلکترۆنی جێگەیان دەگرێتەوە. . !!ئاخر. . مرۆڤ بەو مەزنی و پیرۆزی یەی خۆیەوە. . . ئامێ. . . نا. . نا. . » تووی باوەڕو گومان لە مێشك و دەروونتدا چەکەرەیان کردو بەتورەیی‌یەوە جگەرە کەت بەزەوی دا دا. وەرسی پشتی پێ‌هەڵکردی و ڕێت دایە بەر هەنگاوە تورەو گورجەکانت. بەرەو ماڵ بوویتەوە. . . . هەر کە خۆت کرد بە ژووراو دەرگاکەت داخست، لە باڵای ژوورەکەت ڕووانی. . وەکو نەهەنگێکی زەبەلاح هاتە پێش چاوت کە ئامادە بێت بۆ هەڵوشێنت ـ سەرێکت ڕاوەشاندو دەستێکت بەروخسارت دا هێناو لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشتی. جگەرەیەکی ترت ئاگردا. لەگەڵ یەکەم مژی جگەرەکەت . . سیلاوی قین و تورەیی بواری ئارام بوونیان نە دایت و شێت ئاسا ڕاپەڕیت: «تاکو چاو چنۆکی. . درۆ تاوان. . خوێن. . جەردەیی. . ئابڕو تکاندن. . پیشەی هەرە پیرۆزی مرۆڤ بن. . نەك ئاسودەیی بگرە کەسایەتی. . شەرەف. . دەبنە سفری پشت فاریزەو هیچ کێش و سەنگێکیان نامێنێ . . «کە ڕووت وەرچەرخان لەگەڵ ئاوێنەکەی پشتەوەتدا یەکدگیر بوونەوە، بەتفێکی خەست ڕوخساریت ئاو پرژێن کرد. . : » تەنانەت ئاوێنەش درۆ دەکات و ئەرکی تەنها نیشان دانی ڕوخسارەو ناوەرۆك دەشارێتە وە». پڕ بەسی یەکانت هەناسەیەکت هەڵکێشا. هەستت بە قورسایی سەرو لەشت کرد. وەك لەبەرەژانێکی قورسا چەند حەبێکی «ڤالیۆمت» پێ درابێ، هێواش هێواش ئەندامانی لەشت بەرەو کرژبوونەوە چوون. بەسستی‌یەکەوە ڕووە و قەرەوێڵەکە بوویتەوە. لەسەر دەم ڕاکشای. هەر ئەوەندەی لەیەکەوە تاکودە» بژمێری. . . . کەوتیتە جیهانێکی سەیرو سەمەرەوە. هەرچەندت کرد نەت توانی بڕوا بە چاوی هەستی خۆت بکەیت جیهانێکی خەیاڵاوی .بەلام لەڕەنگ و بەرگی جیهانی بوون. لەو جیهانەدا. . .[چی بەرخ و کاریلە هەبوون . هەموو سەرمە قولانج هەڵواسرابوون و بەزمانی مرۆڤ هاواریان بۆ ڕزگاری خۆیان دەکرد. مرۆڤەکانیش ئاژەڵ ئاسا دەیانمران و کەلبەیا ن لەیەکتری دەساوی. . . !!!هەرچی ڕیش سپی‌و فیس لە سەرەکان بوون، بەدوای یەکدا دەست لەسەر زەوی و لنگ لە حەوا بەرەو ڕووبارو دەریاکان ملی ڕێگەیان گرتبووە بەر. . ڕووبارو دەریا کانیش ڕەنگی خوێنیان پۆشیبوو. . !! گورك و ڕێوی سەردار بوون و لەسەر پەلك هاواریان بۆ پاکی‌و بێ‌تاوانی خۆیان دەکرد. . !! لەوڕوڕ ڕا دەنگێکی بە زوڵاڵ هاواری دەکردو دەیووت:

«لە گوێی گا نووستون بۆیە کە ڕێوی
لەسەر ئێوە، وەها شێرە وەکو سەگ».

لەگەڵ ڕاپەڕینت کەوتیتە سەر زەوی‌و هاوارت کرد: «نا. . نا. . نابێ. . کەی ڕەوایە. . . ».

ئالەو کاتەدا (هیوا)ی برات پەلاماری دەرگاکەی داو پەڕەم هاوارو ناڵەتەوە هات. بەسەرتا نوشتا یەوەو بە تە کانێك هەڵیگرتی:

ـ هێرش گیان، ئەوە چی‌یە بۆ وا ئەکەیت؟

توانای وەڵام دانەوەت نەبوو. ماندوو شەکەت. شەلالی ئارەق بوو بوویت. لەتەختی تەوێڵتەوە دلۆپ دلۆپ بەلاجانگەکانتەوە دەهاتنە خواری‌و لەکەناری سمێڵت دا قەتیس دەبوون. (هیوا)یش لەسەریەکە دەستی بەسەرو چاوت دا دەهێنا و بەردەوام دەیپرسی:

ـ بۆ پێم ناڵێی. . چیتە. . چی. . ؟

سەرت بەسەر سینگتا شۆڕکردەوە، دوو دلۆپ فرمێسك بەسەر کراسەکەت دا تەرایی خۆیان نواند. سەرت هەڵبری و بەدەست ئامازەی پەرداخێ ئاووت بۆی کردو ئەویش بەپەلە بۆی هێنایت و نات بەسەرتەوە. هیوا بە دیوجامەی ڕوخسارت داهە لێروانی. هەستی بە هێور بوونەوەت کرد بۆیە پرسی:

ـ کاکە هێرش . . . چیتە. . خێرە وا ئەکەیت. . ؟؟

ـ خێر. . بۆ چاك ماوە تاکو خێر بمێنێ. . ؟؟

هیوا بە هێمنی‌یەکەوە دەستی نایە سەر شانت و

ـ نا. . کاکە هێرش وا ڕەشبین مەبە.

بەتەوسێکەوە لێیت ڕوانی:

ـ هە. . . ڕەشبین. ئەزانی زۆر گاڵتەم دێ بە تۆو ئەوانەی وەکو تۆش بیر دەکەنەوە.

- باشە، بوو لەبەر چی؟
بە دەرکردنی جگەرەیەك جەمامی ماندوو بوون و بێزاریت رەواندەوەو دوکەلەکەیت «پف»کردە سەرو چاوی هیوا دا و:
- نازانم. بەلام زور جار بیردەکەمەوەو دەلێم من .. تو.. ئەو خەلکە بوچی دەژین؟ئاخر ژیانێك هەر باوێشك و خوخواردنەوە بێت نەبوونی چاکترە.
- ئاوها.. ئەو پەری رەشبینی و داروخان.
- چاکە.. دیارە تو زور گەشبینی و هیوات بە ژیان زورە. باشە.. ژیان بەلاتەوە چی‌یە؟.
هیوا وەکو تیسکەی تفەنگ گزارەی کیشا:

- هەرچی‌یەك بێت.. بەلام زور بروام بەو قسەیە هەیە کە دەلێ [ژیان وەکو نیسکی دەم سەگ وایە، چەنێ بیلێسیتەوە ئەوەندە چیژی زیاد دەکات. لەگەل ئەوەشدا ئازاری دەم و لیوی زیاتر دەدات].

خوێیش نەتزانی بو وا بە وەلامەکەی هیوا فینکی یەك بە ناخ و میشکتدا گوزەری کردو بزەیەکت کردە رازی‌بوونی:
- دەم خوش.. ئەزانی خەریکم سەری کشتەکی ئەو پرسیارە نەحلەتی‌یەم دەسگیر دەبیت. کەواتە گرفتەکە چاوچنوکی‌و کیشەی برسیتی‌یە..
هیوا هەستایە سەرپی‌و

- هەرچەنی نازانم ئەو گرفتەی تو مەبەستە چی‌یە، بەلام دەلێم. ئەگەر برسیتی‌یەکە، برسیتی بیرو میشك بێت ئەنجامەکەی چاکتر دەبیت وەك [٢] برسیتی سك.
نوحزنی‌یەك پالی بە تورەیی‌و قینی ناوەوەت ناو ئامیزت بوی والا کردەوە. تیر شانی یەکتریتان گوشی. هیوا بریاری دا چا یەك بکات و کاسیتیکم «داریوش»تان کردە پستە [٢]ی پاشماوەی دریژی ئەو شەوەتانەی

کرکوك - امام قاسم
- شباط - ی ١٩٨٧

نیبتی
(١) دیرە شیعری شاعیری گەورەی کورد حاجی قادری کویی‌یە
(٢) پستە - شەو چەرە.

## چیروکی خەیالی زانستی

# ئەوقەڵەی خۆشەویستی

● رەوف حەسەن ●

ئەوە بو دوو هەفتە دەچێت «جوان» لە گیانی خوی بێزارە، هەر ئەوە نی‌یە لە کراسەکەی بێتە دەرێ.. بەتایبەتی ئەم دوو، سێ روژەی دوایی‌و، ئەوە ئەم شەو هەر مەپرسە چەند شپرزەو هەراسانە.. هەر شەوی سەری سالی خوش بوو، کە بە شاجوانە ژنی گەردوون هەلبژێردرا.. ئیتر دوای ئەو شەوە پەستی‌و پەژارە دایگرتووە.. جارجار وای لی‌دێت بیر لەوە بکاتەوە، هێرش بەرێتە سەر مەزنترین مەلبەندی زانستی.. بەو نیازەی هەموو کەرەسەکانی ناوی بشێوێنێت و خویشی دووچاری مەترسی بکات.. کە ئەویش مەلبەندی «ئیڤا ٧٠»ی جێی چاندن و گورینی هەزاران خانەی مێشکی مروڤەو کەوتوتە خوارووی ئەرمەنستانەوە.. چونکە لاوێکی نەگریس هەموو روژێك چەند جارێك پیوەندی فیکری دووراودووری پیوە دەکات و، تا رادەی بێزارکردن سەردەکاتە سەری.. لەخەو رای دەپەراند، زنجیرەی بیرکردنەوەی دەپچراند، لەکاتی کارکردنیدا لە کونترولی «رووەکە پیشەسازی‌یەکان»دا، هەر ئەوە نەبوو کێلگە ئامێرەکان ژێرەوژوور پی‌بکات..

[ ـ ئەم لاوە بۆچ وام پێدەکـات؟! بۆچـی ناوونیشـانی خۆیم ناداتێ؟! ئەگـەر خۆشی دەوێم بۆچی نایـەتە تەلام! قەیناکات، من دەچمـە لای. . تۆ بڵێیت هینـد دزێـوبێت رووی نەیـەت بێتـە بەردەمی شاجـوانی گەردوون. . ئەمیش قەینـاکات، خۆ دەیتوانی بەرەفتـاری جوانی بمکاتە هاورێی خۆی. . بەڵام بەم رەفتارە بەدو نەگـریسـانـەی وام لێدەکـات رقـم لێی بێت و، کاروا بروات دەیقەومێنم و کارێکی شێتانە دەکەم. ]

«جـوان» بۆ ئەوەی ئەم ختـوورانـە لەبیر بباتەوە، وەك زۆربەی شەوانی رابـردووی. . دەستی نا بە دوگمـەی M.S ی دەستیـدا.. H.H.K 3. EO ئەمجا 0710 ی لێدا. . ئیتر بەدڵ و بەگیان تێکەڵاوی ئەو کارەسـاتـە جەرگبـڕانـە بوو کە سەدان ساڵ لەوەوبـەر بەسـەر نەتـەوەکـەیـدا هاتبـوون و لەسەر دیواری ژوورەکەی بەشێوەیێکی بەرجـەستـەیی دەیبینین. . لەو ساتانەدا لەخۆی دەپرسی: [ـ کەی پرۆژە مەزنـەکەمان دەکەوێتە کار. . پرۆژەی ـ دادپەروەریی رەها ـ تا ئەو درنـدانـەی کاتی خۆی ئەم تاوانـانـەیـان کردووەو تۆڵـەیـان لێنەسێنراوە، تا زیندوویان بکەینەوەو تۆڵەیان لێبسێنینەوە!؟] لەم ساتەدا لەپڕ پێوەندی فیکری پێوەکرا. . «جوان» بە بێئاگا قیژاندی

ـ بەسە، بەس. . بە جارێك لە تامت دەرکردووە.

ـ جینی گیان تۆ بەسە. . بەس بەو دیمەنە مێژووییە خەماوییانەدا بروانە.

ـ دەزانیت ژیانت لێ تاڵ کردووم. . دەمەوێت لەوانەوە فێری ئارام گرتن بیم، چونکـە هەر ئەوەنـدە بزانـە کارێکی وا دەکەم هەرگیزاو هەرگیـز نەتـوانیت پەیـوەندیم پێوە بکەیت. . ئەوەش بخەرە ژوور سـەرت سوێیشت بێتەوە نابمە هاورێت.

ـ جینی گیان هەر منم وا هەراسانم کردوویت یان هی دیش سەردەکەنەسەرت؟!

ـ هیچیان وەك تۆ بێتامیان نەکردووە. «باش بوو پچرا»

ـ نا. . نا نەپچراوین. . دەتوانیت پێم بڵێیت ئەوانە کێن کە. . .

ـ تۆ مافی ئەوەت نییـە ئەم شتـە تایبـەتییـانەم بزانیت!. سوێیشت بێتەوە پێت ناڵێم!. بەڵام با ئەوەش بزانیت هەر لەسەری ساڵەوە لە دەرەوەی زەوی و سەر زەویـدا ٢١٤٣ کەس پەیوەندیی پیرۆزبایی و دڵسـۆزیـان پێـوە کردووم. . ئەوانـە ١٨٠٧ کەسیـان هاورێی نوێمن و ناونیشانەکانیانم داوە بە دایەنە رۆبۆتەکەم.

ـ جینی گیان. . خەوت نایەت؟!

ـ بۆ تۆ دەزانیت خەو چییە؟!

ـ بەراستی پێت بڵێم، لەم ماوەیـەدا نازانم خەو چییـە. . هەنـدێك جار لە تاقیگەکەمدا هەر ئەوە نییە بەپێوە خەوم لێبکەوێت.

ـ ئێ. . باش بوو زانیمان. . واتە خەریکی داهێنانی زانستیت. . وانییە؟

ـ ئۆهـ. . خانم. . شتێکی سەمـەرەم بەدەستـەوەیـە. . لەوانـەیـە گاڵتەم پێبکەیت. . خەریکم وەك سەدان ساڵ لەمەوبەر، دوو دڵ دروست دەکەم، کە بەتیرێك پێکرا بن.

ـ لەوە دەچێت شێت بیت. . ناوونیشانەکەتم پێ بڵێ تا بەفریات بکەوین.

ـ پێم وتیت JE7.142857 .. هاڤانا.

ـ ئەمـە ناونیشـان نییـە. . ئەمـە هێمـایێکـەو هیچی دی. . ئەی شێوەت چۆنە

ـ نا. . جینی خان. . هەی شاجوانە ژنی گەردوون. . جارێ کاتی ئەوە نەهـاتـووە، تەنـانەت کاتێ پەیوەندی فیکریت لەگەڵدا دەکەم ناوێنەیش بەرامبەر خۆم دانانێم. تەنیا مایکرۆفلیمی تۆ نەبێت. .

ـ کەواتـە تێگـەیشتم. . منت خۆش دەوێت. . دەبـاشـە با یێکدی ببینین و بگـەینـە ئەنجـام. . نازانم بۆچی لەگـەڵمـدا رێـك ناکەویت؟! دواییەکەی هەر تاوانێکم پێدەکەیت.

ـ جیـنـی خان. . ئارام بگـرە. . زانـسـت کارێـکـی مەزنـی بۆ پێکهێناوین. . بەڵام تەگەرەی بچکۆلەشی لە بەردەمماندا داناوە. . با بەهەراسان کردنی یێکدی چاری بۆ بدۆزینەوە.

ـ ئەمەی تۆ دەیڵێیت ئەوپەڕی شێتییە. . خەڵکی هەراسان ـەکەن تا هەرێکـە لای خۆیـەوە هێـرش بەرێتـە سەر نیڤـای نارچەکەی و هەمووی تێك بدەن و لەم رەفتارە بەدانە رزگارمان بێت ئەمەیە چار هەی رەزا قورس!

ـ زۆر تووڕەیت خانم. . جارێ شەوشاد.

«جـوان» سەیـری کرد لە مێـژەوە فلیمـەکـە تەواوبـووە. . بەپـەلـە دوگمەی M.S ی لێدا

ـ رۆبۆتی مەڵبەندی E70 لەگەڵتدایە، بفەرموون.

ـ JE7. 142857 م بۆ بدۆزەرەوە.

ـ کام ناوچەو کیشوەر؟!

ـ H10. A 3

پاش 5.2 چرکە

ـ جیـك. . جیـك. . لەم دووسـەد سالـەی دواییدا لە ئەمەریکای خوارووداا هیچ کە سێکمان بەو ناونیشانە نییە

- ئەی لەهەموو گەردووندا؟!

پاش 2.5 **چرکە**

- نی یە

«جوان» هەناسەیێکی هەڵکێشا . . ویستی هەرچۆنێك بێت خانە نوێیەکانی مێشکی بەشتێکەوە خەریك بکات . . خۆ ١٣ ڕۆژە هەواڵی باوکی نازانێت . .

- ئۆهـ . . جینی خان . . ببووره . . دوای پیرۆزبایـیەکانی سەری ساڵم، سێ جار پێوەندیم پێتەوە کرد . . وا دیاربوو زۆر سەرت قاڵ بێت . . ئاسایییە کچم . . شاجوانی جیهان دەبێت هەردەم بازاڕی گەرم بێت .

- بازاڕی گەرمی چی؟! هەراسانیان کردووم . . کەی دەگەڕێنەوە؟

- خەمت نەبێت . . فریای جەژنی لە دایك بوونەکەت دەکەوم . . شەوی 15.1.58 سەعات ١٥ . ٣٠ . ٢١ . . لەتەك هاوڕێکانمدا، زانا ڕووسی و ئەمەریکایی و چینی و ژاپۆنی و هیندی و ئەڵمانییەکانیش دێنم . . دەزانیت خاتوونە ئەڵەمانییەکەمان شاجوانی گەردوونی ساڵی ٢٢٤٧ . . بەهەرحاڵ . . کارەکەمان هێندەی نەماوە . . چینی سەرەوەی هەوامان پڕکردەوە لە «ئۆزۆن» . . پینەوپەڕۆمان کرد . . چەتیو نەوەك لەوشەوەدا تیشکی کوشندە بکاتە ئاهەنگەکەمان . . شەو شاد .

- بە تەمانم . . لەگەڵ هاوڕێکانتدا . . شەو شاد .

هەستا چووە ژووری نوستن . . لەبەر ئاوێنەکەیدا خۆی ڕووت کردەوە، قژە خاوەکەی بەسەر شان و مل و سنگیدا پەخش بیوەوە، زەردەخەنەیێکی خەماوی گرت .

[دوو هەفتەیێك لەمەوبەر، لەو ساتەدا، دواچرکەکانی ساڵی 2257 و چرکە سەرەتاییەکانی 2258 لێکدی نزیك دەبوونەوە، وەك ئێستاکە بەڕووتی لەبەردەم ئامێری جوان هەڵبژاردندا وەستابوو. لەو ئان وساتەدا بنکەی گەردوونیی کۆمپیوتەر بەهەموو گەردوونی ڕاگەیاند:

- ئاگادار بن . . ئەنجامی مەزنترین و پیرۆزترین ئاهەنگی ساڵانەی جوان هەڵبژاردن . . لەنێوان 999857715 ئافرەتی هەموو جیهاندا . . کە سەرتاپای ئەو ئافرەتانەن شانزە ساڵیان تەواوکردووە . . جگە لە 573 ئافرەت کە بەداخەوە بەشدار نەبوون . . چونکە لە دەرەوەی گۆی زەویدا بوون . . لەنێوانیاندا خاتو (JWAN.Y. S2 .KO .E70) بە شاجوانە ژنی گەردوون و بە بێهاوتا هەڵبژێردرا . . چونکە سەرەڕای گشت ئەندازەکانی لەش ولارو پێرەوەکانی جوانی، لەنێو زەردەخەنەکەیدا خەمێکی نازدار لە ڕوخساریدا دەدرەوشێتەوە، کە بە درێژایی سێ هەزار ساڵێکی مێژووی نەتەوەکەی تێکەڵاوی جینەکانی بووەو، سۆزو قەشەنگی و شەخسییەتێکی بێهاوتای پێبەخشیوە . . پیرۆزبایی گەرممان لە (JWAN) خان .

لەگەڵ هەواڵەکەدا وێنەی بەرجەستەیی بەهەموو گەردووندا بڵاوبۆوە . . ] جوان، کەمێك ئارام و شادی نۆشی . . هەر چووە سەر جێگەکەی

- جینی گیان . . JE7. 142857 لەگەڵتدایە .

- . . . . . . . . . . .

- جینی گیان . . بۆ وا تووڕەیت؟!

- هەرئێستا پێوەندی بە (E.O) دەکەم و، هەرەشەکەم دێنمە دی .

- جینی . . دڵەکەم . . خۆشم دەوێیت .

- من ڕقم لێتە .

جوان ویستی پێوەندی ڕاستەوخۆ بەسەرۆکی مرۆڤیی (E.O) وە بکات وەڵامی نەبوو . . بەناچاری (E70)ی وەرگرت .

- ڕۆبۆتی ئیڤا حەفتا لەگەڵتدایە . . فەرموون .

- JWAN.Y.S2. KO. E70 لەگەڵتدایە . . ئەگەر چارەسەریکم بۆ نەدۆزنەوە، ئەوا هەرەشەکەم جێبەجێ دەکەم .

- هەر گرفتەکەی E7.142857ی هاڤانایە؟!

- بەڵێ .

- 9.00 چرکە ئارام بگرە .

ڕۆبۆتی ناوچەیی پێوەندی بە سووپەر ڕۆبۆتی (E.O) وە کرد . . ئەویش بەپەلە فەرمانی بە ڕۆبۆت (E.70) دا، تا بازنەیێکی ئاگادارکردنەوەی نمرە - ٣ - بە دەوری مەڵبەندەکەدا بکێشێت . . ئەمجا پێوەندی بەسەرۆکی گشتی (E.O) وە کرد، پاس 9.00 چرکە :

- جینی خان . . ئێرنست. M. سەرۆکی مەڵبەندی گشتی لەگەڵتدایە . .

- زۆر پەرێشانم .

- دەزانم . . بەشیکردنەوەی شەپۆلەکانی مێشکت کە لە E.70 وە بە (S R. EO) گەیشت . . دەرکەوت، باری دەروونیت لە پلەیێکی ترسناکدایە، لەوە دەچێت کارێکی شێتانەت لێبوەشێتەوە . . ڕاستە ڕەفتاری هەرزەکارانەی (JE7.142857) کاری کردۆتە سەر بەختیاریت . . بەڵام دڵنیات دەکەم، لەم ڕۆژانەدا چارەسەری ئەو گرفتە دەدۆزرێتەوە . . چونکە جگە لە ٩٢ کۆمپانیا ٣٣٤ کەسیش

ـمـاشكـرا هەر خەريكن . . حەزدەكەم ئەم چەنـد رۆژەش دان
ـخوێندا بگريت . . هاكا چارەسەر داهێنرا بۆی . .
- ئيرنست . . لەسەری ساڵەوە تانيستا ١٣ رۆژە . . ئيتر ناتوانم .
- جينی خان . . تەنيـا دوو رێگـە هەيە . . يان ئەوەتا بێيتە مەڵبەندی EC و لەژێـر دەرێـای كاريـيـدايەو، ماوەی دوو سەعاتێك بچيتە نێو ـخيـرە مەزنـەكـەوەو، بەپێچـەوانە كاری پێبكەين، تائەو خانانەی بوت زيـادكـردنی وزەی هۆش و هەست دا نراون (M.A.S.C) لێتی وەربگـرينـەوە . . بەمـە بەشێكی گرفتـەكـەت چارەسەر دەبێت . . چونكـە ئەم ئامێـرەشمـان تازە لە توانـای‌دا نیيە كاربكاتە سەر ئەو خانـانـەی بەهـۆی تيشـك و ماتـەری كيميـاويـيەوە گۆڕراون وەك خۆيـانيـان لێبكـاتـەوە . . ئەم كارەش گەلێ مەترسی لەدوايـە . . سـەرەرای ئەوەی زيرەكی و توانای شاجوانی گەردوون دەچێتە پلەی كەسانێكی دوو سەدە لەمەو بەرەوە . . ئەمەت بە دڵە؟!
- بڵێم چی؟! ئەی چاری دووەم . .
- خۆت دەزانيت . . دووركـەوە . . بۆ ماوەيێـك بچـۆرە پەروانەی پلوتـۆ . هەرچـەنـدە كارێكی ستـەمـە شاجـوانی گەردوونمـان لێ دووربێت . . دەڵێيت چی؟!
- ئاخر دوو رۆژی دی جەژنی لە دايك بوونمە . .
- بەڵێ . . سەعات 21.30.15 ی شەوی 15.1.58. شاجوانی گەردوون دەبێتە ٢١ ساڵ شەو شاو.
- ئۆهـ . . چۆن دەزانيت؟! ئيرنست . . ئيرنست .

سەرۆكی گشتی پێـوەندييەكەی پچراندبوو . . (جوان) سەرسام بوو . [- دەبێت رۆبـۆتی EO هەمـووی تێگـەياندبێت . . لەوانەيشە ئيـرنست بايـەخم پێبدات و بيەوێت بمناسێت . . ئەگينا ئەو قسـە خۆشـانـەی لەچی؟! ستـەمـە! شاجـوانی گەردوونمـان لێ دووربێت . . ئەی لەپـر بۆچی پێـوەنـديی پچـرانـد؟ دەبێت لە مەبەستی بگەم . ] پێوەندی بە سووپەر رۆبۆتی مەڵبەندی گشتی‌يەوە كرد

- سەرۆكی مەڵبەند (ئيرنست)م بۆ وەرگرە .

پاش ١٠ . ٣ چركە

- جينی خان . سەرۆك وەڵام ناداتەوە .
- بۆچی؟! نووستووە؟
- نوستنی چی؟! خەريكی كاركردنە .
- دەمەوێت . . كاری پێويستم پێيەتی .
- خانم . . لەماوەی سێ چركەی بەردەوامدا . . بەهێزترين شەپۆلی كەهرۆ موگناتيزيم بۆ نارد . . پێی نەگەيشت . وادياره كەس ناتوانێت پێوەنديی پێوە بكات . جوان بە ماتەمينی‌يەوە لەسەر جێگەكەی پاڵی لێدايـەوە . . لەبـەرخـۆيـەوە . «- پێی نەگـەيشت!! بە هێـزترين شەپـۆلی سووپـەر رۆبـۆتی پێناگات . . منيش بە شەپۆلی ئاسايی مرۆڤێك ئاوام بەسەر دێت!! ئەمە رەوانيی . » شەو درەنگ بوو. لەو كاتـەدا ئەو شەوە خۆشـە بە بيـرهـاتـەوە، كە تازە پێی دەنـايـە ساڵی شەشەمی تەمەنی‌يەوە .

[ ساڵی ٢٢٤٢ . . لەگەڵ چەند منداڵێكی هاوتەمەنی خۆيدا بە ٥٠ . ١٧ چركـە گەيشتنە مەڵبەندی ئيڤا ٧٠، لەناوچەی دياربەكر، لەنێـوان جەزيـرەو ئەرمـەنستـاندا . . سەعات 20.30.00 دابەزين . . بەفـربـارين بەردەوام بوو . . لەنێو بەفرەكەدا دەستيان بەياريكردن كرد . . هێـنـد شادمـان بوو نەبێتـەوە . . ئەی پاش ماوەيێكی دی نايەنە نێو ئامێری مەڵبەندەكەوە؟! ئيتر دەبێتە مرۆڤێكی تەواو . . لە گەرمەی ياريكردندا بانگيان كرد . . لە ئامێرەكەدا چەسپ بوو . . پاش ٤٥ . ٢ چركـە هاتـەوە رێ . . ٢٨ خانـەی نوێ خراوەتـە نێـومێشكی . . بەهۆی تيشكی تايبەتی و ماتەری كيمياويشەوە 40004 خانـەی مێشكی گۆڕراوە . . ئەوەتـا ئيتر دەتوانێت پێوەندی فيكری دوراودوور بكـات . . وزەو تينی هەستكـردنی سەدان بەنـدەی جارانـە . هەرچی بيـركـاريش هەيـە . بەهـۆی ـوو خانـەی (كـەلكـولـەيتـەر)دا چەسپاوە . . زمانی S.ESPERANTO بە خـەيێك چەسپـاوە . . چ زمـانێكی دی دەوێت بەتـەنيـا يێـك جار بيستن تۆماردەبێت و پێی‌دەدوێت . . هەرچی شەپۆل و فوبونی رادەيوی و تەلـەفزيـۆنی و كەشتی ئاسمـانی و تيشكی ئاسـ(?)ـانی هەيە . . كەی بيـەوێت وەری‌دەگـرێت . . ئەمـانەو دەيان شتی دی . . هەمووی بەبێ ئامێـر . . تەنيـا يێك ئامێری گچكە هەيە بۆيارمەتيدان و كاتی پێـويستی . . ئەويش (M.S.C)ەو، لەشێوەی پارن(?)ـملوانكەو گوارەو كاتـژمێر و دوگمەو پێنووس و . . . . هتدايە . پەلەيەتی . . هەر لە ئێستـاوە دەيـەوێت پێـوەنـدی فيكـری بەرۆبـۆتـە دايـەنـەكـەيەوە بكاتە . . ] لەم خەيالانەدا بوو . . خەوی لێكەوت .

[ئـاهـەنگێكی گەورەيـە . . شاجوانە ژنی گەردوون جێی بايەخ پێدانی هەمـوانە . . بەوپەڕی شادمانی‌يەوە وەڵامی پيرۆزبايیەكان دەداتـەوە . . بە گەرمتـر ماچيـان دەكاتەوە . . وەك پەپوولە دانسيان لەگـەڵـدا دەكـات . . نوێترين چەپكە گوڵی پێشكەش دەكرێت . . بەجـۆرە گوڵێـك گوڵبـاران دەكـرێت كە دوای دەسكـاری كـردنی

رەگەزەکەی تیشك دەداتەوە، بە سەرسەرییەوە پەلکە زێرینە دروست دەکات. . لەپڕ زەردەخەنەی ڕوخسارو شادمانی دڵی ڕەوی‌یەوە. . ئەوەتا پیرێژنێك بەماتی‌ومونی‌یەوە سەیری‌دەکات. . نەخۆی گۆڕیوەو نەبانگ کراوە. . نەدیوو نەناس لەو پەنایەدا، ڕەپ وەستاوە. . لەوە دەچێت لە ئەستێرەیێکی دواکەوتووەوە هاتبێت. . جوان بەشپرزەیی‌یەوە بوی ڕوانی، خەڵکەکە ئاوڕیان دایەوە. . هەموو بێدەنگ بوون. . پیرێژن بزووت. . هاتە پێشەوە. . تا گەیشتە نێوەڕاست. . وەستا. . بەپەنجە درێژە ڕەقەڵەکانی بانگی جوانی کرد:

- وەرە پێشەوە. .

جوان سڵەمی‌یەوە. - پیرێژن قیژاندی

- وەرە پێشەوە. . ناشیرینی سپڵە!

بەشدارانی ئاهەنگەکە بازنەیێکیان لە دەوری هەردوکیان پێکهێنا

- پووری گیان. . بۆوا بەرقەوە سەیرم دەکەیت و بەسەرمدا دەقیژێنیت؟! چیت لێم دەوێت؟! من ناتناسم.

پیرێژن تیژتر چاوەکانی تێبڕی. . ئەمجا چاوی بە هەموو بازنەکەدا گێڕا. . ئەوان وەك بت چەقی‌بوون. . تەنیا جوان بەئاستەم دەبزووت. . وردە وردە لە پیرێژن نزیك بۆوە، خەمە دێرینەکەی هەموو ڕوخساری داپۆشی. . هێندەی دی نازداربوو. . بەهەموو جوانییە گەردوونی‌یەکەیەوە کەوتە پاڕانەوە!

- دایە گیان! بۆ لێم بەقینیت؟! تاوانم چی‌یە؟!

هەموو چاوەکان بە لێوە وشك هەڵاتووەکانی پیرێژنەوە گیرسابوونەوە، بەرلەوەی لێو هەڵبێنێتەوە، دەستی درێژکرد، پەنجەکانی لە قژە خاوو پەلکە زێرینە گوڵینە پرشنگدارەکەی سەری گیرکردو ڕای‌کێشا. .

- تاوانبار! چۆن ختوورەی وا بە دڵتدا هات؟!

- ختوورەی چی. [illegible] ناتناسم. خەڵکینە. . دۆستان فریام کەون. . کەس بە هانایەوە نەهات. . بە دەستی‌یەوە شل بوو. .

پیرێژن قژی بەرداو فرمێسك بە چاوانیدا دەهاتە خوارەوە. . ڕووی تێکردن:

- کەس هەیە من نەناسێت؟! کەس هەیە «ئیڤا ئانگیل» نەناسێت؟! ٣٢ساڵی تەمەنی جوانیم بە تێکۆشانیکی سەختەوە بەسەر برد. . لە زانکۆ دەکرام و، برسێتی‌و کوێرەوەری زۆرمان چێشت. . تا ئەو ڕۆژەی پشتی سەرمایەداریمان بە یێکجاری شکاندو، دوا پارچەی سەرزەویمان ئازادکرد. . لە ساڵی 2045 سۆشیالیزیمان بۆ سەراپای مرۆڤ داکوتا. . ویستم بیسەلمێنم: ئەگەر دەرفەت بە ئیمەمانانی پەروەردەی هەژاری‌و سەرگەردانی بدرێت. . ئەوا داهێنانی وامان لەباردایە خزمەتی هەموانی پێ بکەین و لە بنچینەوە مرۆڤ بگۆڕین. . ئەوەبوو لەژێر سایەی ئەو یەکسانی‌یەدا دوانزە ساڵ سەرومڕ کارم کرد. . لە ئەنجامدا نەخشەو بنچینەی چەند ئامێرێکم دامەزراند بۆ دروستکردنی خانەی زیندووی مێشك. . بۆ هەڵبژاردنی توانای وزەی فیکری، بۆ گۆڕینی سەدان خانەی دی بەهۆی تیشك و ماتەری کیمیاوی‌یەوە، لەسەرەتادا تەنیا شەش خانەی نوێم دروست کردو ٨٠٨ خانەشم گۆڕی. . دوای من ئەم زانستە گەشەی سەند. . بەمە دەرفەتێکی یەکسانم لەبەردەم هەمواندا ڕەخساند. . هەموو کەسێك لە تەمەنی پێنج ساڵی‌یەوە گشتی پێدەبەخشرێت. . خۆ ئەگەر بەڕێگەی ئاسایی سروشت بوایە. . ئەوا ٩٨٠٠٠٠ ساڵی دەویست. . ئەوەش لەیاد نەکەن. . ئەم داهێنانە کاردەکاتە سەر جینەکانتان و پاش نزیکەی ١٢٠٠ ساڵی دی، مرۆڤ بەم وزە فیکرییەی ئێستاتانەوە دێتە دنیاوە. . خۆشەویستەکانم. . ئەم خاتوونە نیازی وایە دەستدرێژی بکاتە سەر ئیڤا ئانگیل. . ئەمەیە وەفاداری بەرامبەرمان!

پیرێژن فرمێسکەکانی چاوی سڕی‌و، بەردەوام بوو. .

- ڕۆڵەکانم. . ئیمە هەرچی سەرگەردانی هەبوو چێشتمان. . تەنیا شتێك هەبوو دڵخۆشی خۆمانمان پێدەدایەوە ئەویش ئێوە بوون دەمان وت: هەرچی‌یەکمان بەسەردا دێت قیروسیا. . هیچمان بۆ خۆمان ناوێت. . بەس نەوەی نوێ دەحەوێنەوە. . فەرموون سەرنجێکی (H.H) بدەن. . بزانن چیمان بەسەردا هاتووە. . بێگومانیش بن، ئەوانە بەشێکی زۆرکەمی کوێرەوەرییەکانمانن. . تەنانەت خەم و ئازارەکانیشمان بۆ کردوونەتە دیاری، تا ڕوخسارتان قەشەنگتر بکات. . ئیتر چیتان دەوێت؟! ئیڤا واتە من. . واتە تێکۆشانی بێدەرەتانەکان!

خەڵکەکە بەرەو خاتو ئیڤا هاتن. . دەستیان کردە ملی. . لەهەموو لایێکەوە ماچیان دەکرد. . ئیڤا جوان بۆوە. . جوانتر بۆوە. . بووە شۆخە کیژێکی نازدار. . خەمەکانی سەر ڕوخساری دەدرەوشانەوە. . هەرچی پەلکە زێرینەی گوڵین بوو لە دەوری سەری خڕبۆوە. . «جوان» حەپەسا. . باوەشی بە «ئیڤا»دا کرد ماچی‌کرد. . بە دڵی‌یە نووساند.

- خاتو ئیڤا. . تۆ شاجوانە ژنی گەردوونیت نەك من. .

ڤیڤا، جوانی بە دڵیەوە نا . . دەستی سۆزی بە سەریدا هێنا . .
- بیوورن . . ئاهەنگەکەم لێتێك دان . . جێتان دێڵم . .

هێــدی‌هێــدی بەرەودوا کشــایــەوە . . بەرزبــۆوە . . لەوێنــەی چەپکەتیشکێکدا کشا . . هەموو هاواریان دەکرد . .

- مەڕۆ . . خاتو ڤیڤا جێمان مەهێلە . . مەڕۆ . . ]
جوان لەخــەو ڕاپــەڕی . . کات درەنــگ بوو . . دوای ڕامــانێکی کەم . . ڕۆبۆتە دایەنەکەی بانگ کرد . . بەدەم خوگۆڕینەوە :

- دەچم بۆهــاڤــانــا . . ڕۆبــۆتی کۆنتــرۆڵ ئاگــادار بکە . . سبەینێ دێمەوە، لەبیــرت نەچێ . . پێــوەنــدی بەهەموو دۆستانەوە بکەو، پێویستی ئاهەنگەش ئامادە بکە
- ئۆ . کەی .

هەرگــەیشتە دوا قاتی ئەپارتمانەکە . . دیمەنی شاری بەتەواوی لە بەردەمــدا بوو ئەو بەفــرە جوانــە بە کلووی گەورە گەورە دەبــاری . . چووە نێــو ئامێــرە تیــژڕەوەکــەیــەوە بەرەو هاڤــانــا . . نەگەیشتبووە سەردەریای سپی، کە سووپەر ڕۆبۆت پێوەندی کرد :

- بەیانیت باش جینی خان
- سوپاس .
- باری دەروونیت ئێستا چۆنە . .
- گەلێ باشترم .

- بێ‌گــومــان دوای خەوبینینــەکــەت ٨٧٪ی بارە دەروونی‌یــەکەت ئاسایی بۆتەوە . . لەو بڕوایەداین لە هەڕەشەکەت پەشیمانیت وا نی‌یە؟

- بەڵام هەر دەبێت چارێکی بۆ بدۆزنەوە . .
- بای . بای . .

«جوان» بەڕێگەی هاڤاناوە بوو لەپڕ . .
- جینی گیان . . ..JE7.14
- دەزانم هەمدیسان ! !

- دەنــا . . ویــســتــم پێــت بڵێــم : هاتنــەکــەت بێ‌ســـوودە . . نامــدۆزیتــەوە، منیش نامــەوێت بتبینم . . چونکــە ئەمــڕۆ ڕۆژی کارکردنێکی سەرومڕیمە . .

- ئەمــە بیــانــووێکی پووچــە . . بێ‌گــومــانم لە بەدفــەساڵی خۆتدا رووت نایــەت خۆت نیشــانی شاجــوانی گەردوون بدەیت . . کێ دەڵــێت بۆ لای تۆ دێم؟ ! دەچم لەوێ کاتی خۆم بە مەلــەکــردن و ڕابواردنەوە بەسەر دەبەم . .

- ئۆهـ . . جینی گیــان . . لەوانــەیــە ڕاست بکــەیت . . کاتێکی شاد . . پاش ٥٠ . ٣٩ خولکە لە هاڤانادا دابەزی .

* * *

دایــەنــە ڕۆبــۆت . . گشت پێــویستی‌یــەکــانی ئاهــەنگــەکــەی سازکــردبوو . . جوان تا بڵێیت دڵخۆش و ئارام بوو . . چونکە ٣٧ سەعــات دەبێت لە گەشتێکی خۆشی نێــو دوورگــەکــانی کاریبیــدا بووەو، هیچ پێوەندی‌یەکی «JE7.142857»ی بێزارکەر و نەگریــیشی نەبــووە . . هەر دۆســت و خۆشــەویــســت بوو دەگــەیشتن . . هەرپیــرۆزبــایی و چەپکــەگوڵی پرشنگدار بوو پێشکەشی دەکرا . .
هەر پێکی مەی بوو بەرێکدی دەکەوتن و دەزرنگانەوە . .

کات لە ٣٠ . ٢١ نزیــك بۆوە . . جوان هەر چاوەچــاوی بوو، باوکــی و هاوڕێکــانــی هەر نەگــەیشــتن . . پازدە چرکــەی دی تێپەڕی . . هەموو بە یەك دەنگ _ Happy Burthday to you

دووجــاریــان دووبــارەکــردەوە . . لە جاری سێــیــەمــدا باوکی و هاوڕێکانی بە چەپکەگوڵ و، شووشە ڤۆدکایانەوە فریاکەوتن . .

_ Happy Burthday to JWAN

و، بیــست مۆمیــان کوژاندەوە . . ڕوخســا[illegible]یمن و نازدارەکەی «جــوان» بەلاوێکــەوە گیــرســایــەوە کە لەگەڵ باوکیدا هاتبوو . . نە هەمــووان سەرنج ڕاکێشی‌تر بوو . . باوکی، یەکەیەکە هاوڕێکانی بە جوان ناساند .

- پرۆفیسۆر یۆری پیترۆڤیچ
- پرۆفیسۆر جۆرج مارکیز . . زانای ئەمەریکایی . . یا ئەرجەنتینی . .

- پرۆفیسۆر خاتو لی. هوان. لینگ. .
- پرۆفیسۆر ماساکۆ تۆکۆشیما. . زانای ژاپۆنی

- پرۆفیسۆر کریشنان سوبهاس
- دکتۆر خاتو مێریا لویزا. . شاجوانە ژنی سالی ٢٢٤٧

جوان دەستی گوشین و سوپاسی کردن. . مابۆوە سەر ئەولاوەی لەگەڵیاندا هاتبوو. . رووی لە باوکی کرد. .

- باوە. . ئەی ئەم لاوەت لەبیر چوو.
باوکی ئاوری دایەوە. . پێکەکەی لەلێوی نزیك خستەوە. . بەسەر سوورمانەوە.

- جێنی. . ببوورە.. نایناسم. .
- ئەی لەگەڵ ئێوەدا نەبوو؟!
لاوەکە هاتە پێشەوە. . دەستی بۆ جوان درێژکرد. .

- ئێرنست مۆرالیس. . سەرۆکی مەڵبەندی ئیڤازیرۆ. . لە دڵەوە پیرۆزبایت لێدەکەم. ئەم دیارییە بچکۆلەیشم بۆ هێناویت.

دەستی گوشی و، دیارییەکەی لێوەرگرت و سوپاسی کرد. . (ئەوڵە)یێکی گچکەی قژبوو. . لەپڕ، هەرچی شادی و گەشاوەیی و هەستاری هەبوو کوژایەوە. . دڵی کەوتە لێدانی پەلە. . چی ببینێت؟! (تەوقە)کە بریتی بوو لە دوو دڵی گچکە. . بەدەستوری سەدان ساڵ لەوەو بەر تیرێکیان لێدرابوو، ناوی «ئێرنست» لەمیان و «جوان» لەویان نووسرابوو، تەنیا دوگمەیێکی پێوە بوو. .

ئەو دوو دڵ و تیرە گەرچی شێوەیێکی تابلێی جوانی هەبوو، بەڵام کابرای هاقانای بە بیرهێنایەوە. . ئێرنست دەستی برد بۆ تەوقەکە لێ ئەناوا. . تەنیا جارێك دەست بەو دوگمەیەیدا بنێ.

هەرکە جوان دەڕ[illegible]ی پێدا نا لە ناوەراستی تیرەکەدا لەسەر شاشەکەی نووسرا: (JE7.142857).. ئیتر جوان بێگومان بووو، ویستی بیقەومێنێت. . بەڵام ئێرنست فریا کەوت
- جێنی گیان. . ئارام بە. .

لەم کاتەدا زۆربەی بانگ کراوەکان لێیان گرد بووبوونەوە.
- ڕۆژی جەژنی لە دایك بوونەکەتم کردە ئەو ڕۆژەی چارەسەری گەورەترین گیروگرفتی ئەم سەردەمەمان پێشکەش بەتۆو گشت مرۆڤایەتی بکەم. . ئەوە یێکەمین دانەی داهێنراوەکەمەو، تایبەتییە بۆتۆ. . پاش هەشت سەعاتی دی، لە هەموو شێوەیێکدا - ئەم شێوەیە نەبێت - بەهەموو لایێکدا بڵاو دەبێتەوە. . بە جارێك دەست بە دوگمەناندا. . هێمای (JE.7.142857) دەنووسرێت و خەرمانەیێکی حەوت سانتیمەتری لە دەوری سەر دروست دەکات شەپۆلی فیکری هاتوو لەوێدا دەوەستێت. . بەدووجار دەست پێدانان دەبێتە (JE7.285714) و لە دووریی چواردە سەنتیمەتر دەوەستێت. . ئیتر تا حەوت جار دەست پێدانان دەبێتە JE7.qqqqqq) و نەشەپۆلی هاتوو دەگات و نە شەپۆلی لەمێشك دەرچوو دەڕوات. . تەنانەت ئەگەر لە توانا پاراسایکۆلۆژییە سروشتییەکەشەوە بێت.

زەردەخەنەیێك گرتی و:
- جێنی خان. . لەو ڕەفتارانەم ببوورە کە بەرامبەرت دەمکرد. . ویستم بەهۆی تۆوە تاقیکردنەوەکەم. .

جوان دەمێك بوو گەیشتبووە ئەوپەڕی شادمانی و گەشابۆوە. . ئیتر بەر لەوەی بهێڵێت وتەکانی تەواوبکات. . باوەشی پێداکردو دەمی خستە نێو دەمییەوە ئەمجا پەلی گرت و ڕایکێشایە نێوەندی هۆڵەکەوەو پێکی ئێرنست و «تەوقەی خۆشەویستی» بەرزکردەوە. .

- ئەمە نۆشی ئەم لاوە قۆزو نەگریس و پایەبەرزەیە، کە تا ئەمرۆ لەهەموو گەردووندا بەتەنیا ڕقم لەو بوو. . بەڵام لە ئێستاوە، لەهەموو کەسێك زێترم خۆش دەوێت. .

هەموو پێکەکانیان هەڵدا. . سەما دەستی پێکردەوە. . ئیتر جوان بۆ ماوەیێکی کەم نەبێت دانسی لەگەڵ کەسدا نەدەکردو، بەپەلە دەگەڕایەوە باوەشی (JE.7.142857)ی قۆزو نەگریس.

کانوونی دووەمی ١٩٨٨

■ چیرۆك ■

# ڕۆژگار

حسین عارف

دەمەو ئیوارەی ڕۆژێکی پاییز بوو کە هەر یەکەیان لە قوڵێکەوە، بەرەو قەرخ شار ڕۆیشتن. دەمێکی دەمێك بوو یەکتریان نەدی بوو. داخوازیی یەکتربینینەکە لەمەوە بوو. ئەم بەیانی یەکەی داوای لە پووریکرد ئاگاداری بکا کە بە پەرۆشەوە حەز بە بینینی دەکا. ئەوبەر زۆر جاری تر بیری لێ کردبووەوە. بڕیاری دەداو دەیووت: «بۆچی گوایە چی دەقەومێ؟! خۆ دەست نادەینە یەخەی یەکتر؟!.

بوا دا شمان!.. نێ چاکتر. خۆ ئەو گری کوێرەیە لە دڵمدا دەکرێتەوەو بیرو هۆشم لە ئاستیدا ساف دەبێ». وەهای دەووت و بڕیاری دەدا کە لە نزیکترین فرسەتدا بیکا. کەچی کاتێ فرسەتەکە ڕێك دەکەوت، دوودڵیو ڕاڕایی لێی تێك دەداو دەیخستە جاری داهاتوو. جاری داهاتووش وا بە ئاسانی هەڵنەدەکەوت. ئەو لە بابەتی مرۆڤی جێ بەخۆنەگر بوو. هەر لەو کاتەوەی ڕەوتی ژیانی خۆی لە گرێژەنە برد، ئیتر بووە گەڕیدەیەکی شارانو نەدەگیرسایەوە. دەڕۆیشت و ئەو بزربوونەی بزر دەبوو، کەس نەیدەزانی کوێ چووەو چی دەکا!. دەبینرا.. جارو بار هەواڵی دەماودەم دەگەیشت و دەووترا کە لە فلانە شار یا فیسارە شارۆچکە بینراوە بەڵام قەت نەدەووترا کە جێگیر بووە. کەس نەیدەتوانی وا بڵێ. چونکە هەر هێندەت دەزانی خۆی لە ناکاوێکدا پەیدا دەبووەوە

ئینجا ئەمیشیان لە چەند ڕۆژێك زیاتری نەدەخایاندو بزر دەبووەوە!. ئەم لەدوا جاری پەیدابوونەوە لەناکاوەکانیدا بوو کە بەسەر دوودڵی و ڕاڕایی یەکەی خۆیدازاڵ بوو. جاری داهاتووەکەی بەگیر هێناو ئەم فرسەتیانی لەدەست نەدا.

سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژە کەپووری خۆی کرد بە ماڵداو دانیشت، ئەم هەروا ئاسایی لێی پرسی:

- هەواڵی گەڕیدەی شارانمان چییە؟!

کەچی پوور وتی:

- لە ماڵەوەیە.. ئەمڕۆ بەرەبەیان پەیدا بوو!.

ئەم وەك حەزەکە لە پڕێکدا لە ناخیدا بتەقێتەوە، خوڕپەیەك بە هەناویدا کپەی کرد. تەووژمێکی خوێن شاڵاوی بۆ سەرو ڕووخساری هێناو هەردوو لاجانگی گەرم داهاتن. چاوی بە بەرامبەریدا ڕوواو هیچی بۆ نەووترا. پوور وەکوو هەستی پێکردبیو سووکە ترسێکی لە ناخدا بزواندبێ، وتی:

- لەوە ناچێ زۆر گیر بخوا.. خۆت دەزانیت!.. ئەم نەیهێشت قسەکەی تەواو بکا. وەك لەبەر خۆیەوە قسە بکا وتی:

- حەز دەکەم بیبینم!.

پوور باوەڕی بە گوێی خۆی نەدەکردو [illegible] پەسا. ئەم ئەمجارە، بە ڕوونیو بە دڵنیاییەوە وتی:

- پێی بڵێ: بە پەرۆشەوە حەز دەکەم بیبینم.

* * *

یەکتر بینینەکە بۆ هەردووکیان، ساتێکی پڕ لە هەژانی ناخی دەروون بوو. دەتووت بۆ ڕمبازێنێکی ئەوتۆ هاتوونەتە بەر مەیدانی یەکتر کە هەرچی شیرو تیری ناخ هەیە، لە یەکتری یان بخەنە کار شوێنەکەش هەر ڕاست شوێنی ئەو جۆرە ڕمبازێنە بوو. ئەم بوو ئەویی دەستنیشان کردبوو. گردی سەیوان.. پاڵ گومەزەکەی شێخ مارف. بۆچی ئەوی؟!.

دەیزانی بۆچیو لە دڵدا زۆریشی لێ خۆش هات. . . [. . ئا. .
سەیوان و پاڵ گومەزەکە. . بەهاران و دەمەدەمی هاوین. . ئەویمان بۆ خۆمان قەدەغە دەکرد. نەماندەهێشت هیچ قوتابی‌یەکی‌تر توخنی بکەوێ. تا سەعیمان دەکردسەعیو تا یاریمان دەکرد یاری. ئینجا کە ڕووەو شار دادەنیشتین، ڕاست بینایمان ئاراستەیماڵەوە دەبوو. باڵەخانەیەك و ڕووی لە سەیوانە. هەردووکمان دەبینین ئەوەتا هەردوو دایك دێن و دەچن و هەڵدەسووڕێن. دوو خوشکن و شوویان بە دوو برادەری گیانی بەگیانیی یەکتر کردوە. خانووەکە موڵکی باپیری منە. ماڵی باپیرم لە خوارەوەدان. سەرەوەشیان واز لێ‌هێناوە بۆ باوکم و برادەرەکەی. موو بە بەینماندا ناچێ باپیر و نەنکم لەگەڵ باوکمدا. باوکم و دایکم لەگەڵ باوکیو دایکیدا. دواجار من لە گەڵ ئەوو ئەو لە گەڵ مندا، وەکوو باوکم و باوکی، دوو برادەری گیانی بەگیانیی یەکترین. . ].
ئەم ماوەیەك بوو لەوێ دانیشتبوو کە ئەو گەیشتە جێ. ساتە پڕ لە هەژانەکە بوو. سڵاوکردن لەو گێژەنەدا کارێکی بێ‌جێ بوو. سڵاوی نەکردو هات بەبێ دەنگ بە ژوور سەری‌یەوە ڕاوەستا. ماوەیەك بە خامۆشی مانەوە. تا ئەم پەردەی بێ‌دەنگی‌یەکەی دڕی. بە هێمنی‌یەوە وتی:
- دەیبینیت؟!
ئەویش کە پشتتر شان بە شانی ئەم چاوی ئاراستەی دیمەنەکە کردبوو، وەك ئەم لەسەرخۆ وتی:
- دەیبینم!.
- بەکام چاو؟!. . ئەوەکەی جاران یا ئێستا؟!.
- من دوو جۆر چاوم نی‌یە.
- یانی هەر ئەوەکەی جارانتە؟!.
- واش ناڵێم. . بەڵام ڕۆژگار کاری خۆی دەکا.
- هەندێ شت هەن ڕۆژگار کاریان تێ ناکا.
لە یەکتری چاك تێ‌دەگەیشتن. هەر یەکەیان دەیزانی‌ئەوی تریان لە کوێوە قسە دەکا. ئەو کەتا ئەم ساتە هەر بە پێوە ڕاوەستابوو، بە هێواشی لە تەنیشتی‌یەوە دانیشت.
پاڵی بە دیواری گومەزەکەوەداو قاچی ڕاکێشا. پاکەتە جگەرەکەی دەرهێناو جگەرەیەکی بۆ خۆی لێ دەرکێشا. ئینجا بەبێ ڕوو وەرگێڕان، پاکەتەی بۆ لای ئەم درێژکرد. ئەمیش بەبێ ئاوڕدانەوە بەلای ئەودا، جگەرەیەکی لێ دەرهێنا. هەر یەکەیان بە شقارتەی خۆی، جگەرەکانیان ئاگرداو کەوتنەمژلێدانیان. بە دوایدا ئەو کەوتەوە قسەو وتی:
- قسەکەت ڕاستە. . بە مەرجێ هەندە شتەکە بزانری کامانەن!.
ئەم وەك لە وەرامەکەی سەرسام بووبێ، بۆ یەکەمجار ئاوڕی بە لایدا دایەوەو سەرنجی دایە ڕروخساری. سەرنج لێدانەکەش زیاتر سەرسامی کرد!. لەو ساتەدا گومانێك بە مێشکیدا بروسکەی کرد لەوەی کە ئەم زەلامە ئەو خۆی بێ!. ڕاستە نۆ ساڵ بوو نەی دیبوو. بەڵام چۆن و بۆچی وای لێ بەسەر هاتووە؟! بەدەم ئەو سەرنج لێدانەوە، دیمەنی لەوەبەری هاتەوە بەر چاوی: (چاوو برۆیەکی ڕەشی گەش. ناوچەوانێکی پان و ڕوومەت و چە ناگەیەکی خڕی گۆشتن. قژێکی چڕی هەردەم داهێنراوو سمێڵێکی قەیتانی‌ی ڕێك بەڵی. . سەرو ڕووخساری لاوێکی شۆخ. . تەواو شۆخ)
دیمەنەکەی لەوەبەری ئەو، دیمەنی (شەوبۆ)شی هێنایەوە پێش چاو. ئەوەکەی شەوبۆ، بۆ جاری هەزار جارە بەسەرهاتەکەی لە بیرو هۆشدا ژیاندەوە. لە دڵی خۆیدا وتی:
[. . ڕاستە لە سەرەتادا لە گاڵتەیەکی منداڵانە بەولاترەوە نەبوو.

هەردووکمان حەزمان لەو دەکردو ئەویش حەزی لە هەردووکمان بوو وامان دەزانی سێ منداڵی ساواین و یاری‌یەکی ناو کۆڵان دەکەین ئێمە لە تەمەنی سیانزە ساڵیدا بووین و ئەو یانزە ساڵان. بەڵام خۆ ئەوە زۆری نەخایاند. خۆ هەرزوو ڕوون بووەوە کە ئەگەرچی من لە تۆ زۆر زیاتر ئەوم خۆشدەوێ، ئەویش زۆر زیاتر تۆی خۆشدەوێو تۆیت دەستەگوڵی. خۆ من لە پێناوی تودا، ئەو یەکەم عەشق و دوا عەشقەی خۆمم خەفە کردو دڵی خۆم مراند. هەروەکوو شەوبۆش، گڵتەی منداڵانەکەی بۆ تۆ تیکەڵ بە خوێن و گۆشت و ئیسقانی خۆی کرد. کەچی تۆ. . تۆ دوایی ئەو هەموو نامەردایەتی‌یەت لە کوێ هێنا؟!. . تۆ چۆن. . ].
- وەرامت نەبوو. . ! بەمەرجێ هەندە شتەکە بزانری کامانەن!
ئەم لە خۆی بە ئاگا هاتەوە. چاوی لە ڕووخساری لاداو ڕوانی‌یەوە بەرامبەری. ڕوانی‌یەوە مەڵبەندەکەی منداڵی‌ی خۆیان و شەوبۆ. دوای کەمێ ڕامان وتی:
- مەردایەتی.
ئەویش بۆ یەکەمجار لای کردەوە بە لایداو سەرنجی دایە زەردەخەنەیەکی کاڵی بە قێزو بێز گرتی‌و وتی:
- مەردایەتی؟!. . بێ خەبەریت!. . ئەوەی ڕۆژگار بەر لە هەر شتێکی تر کاری تێدەکا، مەردایەتی‌یەکەی لەمەڕ تۆیە.
- تۆ لە خۆتەوە دەڕوانیت. . بە گەزی خۆتی دەپێویت!.
- گەزی من گەزی ڕۆژگارەکەتە.
- دیوە گەندەڵ و ڕزیوەکەی.
- لە چاوی تۆوە وا دەکەوێتەوە. . لە چاوی منەوەنا.
چاوی پاك و چاوی پیس هەیە.
- چۆنیان لە یەکتر جیا دەکەیتەوە؟!.
- چۆن؟!.
ئەم پرسیارەکەی بەتەوسێکەوە کردو کەمێ بێدەنگ بوو. هەر بە تەو سێکیشەوە سەرنجی دایە ئەو. ئەویش لە لای خۆیەوە ڕوانی‌یە ئەم. ئەوە یەکەمجار بوو چاو ببڕنە چاوی یەکتر. ئەم بەبێ ئەوەی سەرنجی

ی لابدا. هەر بە دەم شێوە تەوسەکەوە وتی:
- تۆ شەوبۆ ناوێك دەناسیت؟!
ئەو بزەیەکی تێکەڵ لە توانج و گاڵتە پێکردن گرتی‌و وتی:
- ئەی تلپەکەیم بۆ تۆ بەجێ نەهێشت؟!. پیرۆز. . بە دایکی کورانت ی!.

ئەم لە ئاستی قسەکەیدا چاوی پەڕییە پشتی سەری. لەشی بوو بە پرچەیەك ئاگر. راپەڕییە سەر پێ. هەموو گیانی وەك بینی ئاو دەلەرزی. ماوەیەك بەو چەشنە بە پێوە مایەوە. تا لە ئەنجامدا دانی بە خۆیدا گرت و وتی:
- تێپەکە . . . وەرە. .
ئەو لە سەر . . . جێی خۆی نەجوولا. ئەم هەشت نۆ هەنگاوێك دوور کەوتەوەو چوو لە ئاستی گۆڕێکی هەڵبە ستراودا ڕاوەستا. ئاوڕێکی لێ دایەوەو بانگی کرد:
- وەرە. . وەرە بڕوانە.
ئەو هەروا بۆ ئەوەی بزانێ مەبەستی چی‌یە، هەڵساو چوو بە فیزێکەوە لە تەنیشتی‌یەوە ڕاوەستا هەڵی نەڕوانی!. . . گوێی بۆ قسە هەڵخست. ئا قسەکە کەوتە بەر گوێی. . لە شێوەی خوێندنەوەدا کەوتە بەر گوێی کە وتی (ئەمە گۆڕی خوا لێخۆشبوو شەوبۆی میرزا سەلیمی سابلاخی‌یە).
ئەوسا ئەو بروسکەیەك دای لە هەناوی . بروسکەکە شێوەی فیزو لووت بەرزی‌یەکەی لە رووخساری داماڵی‌و لە جێگەی، تەمێکی تێکەڵ لە ترس و سام و خەم و پەژارەی نیشاندە سەر. ملی لار کردەوەو ڕوانی‌یە کێلەکەی بەردەمی. ئینجا سەری وەرگێراو گێژ و وێژ ڕوانی یەئەم . ئەم لای نەکردەوە بە لایدا وتی:
- باش سەیری بکە. . لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا خۆی کوشت. . باشی بخوێنەرەوە.
ئەو کاتە. ڕۆژ لە دوورو ڕاست بەرەو ڕوویان، خەریك بوو ناودێوی کێوەکانی بەرامبەریان دەبوو. تیشکێکی زێڕینی خاوی، ئاراستەی ڕووخساریان دەکردو ڕەنگێکی زەردی ئەوتۆی پێ دەبەخشین . کە گەرد بە گەردی‌داخ و خەفەتی ناخی هەردووکیانی دەخستە ڕوو.
ئەم لەوە زیاتر گیر نەبوو. تەنیا وتی:
- هێشتا ماوتە. . چەند دێرەکەی ئەملاو ئەولایشی بخوێنەرەوە، ئەوسا نیدەگەیت هەندە شتەکە کامانەن! ئیتر بە هەنگاوی لەسەرخۆ بەرەو خوار بووەوە . کە پێی لە گۆڕستان دەرهاویشت و چووە ناو کۆلانەکەی بەرامبەری یەوە، ڕاوەستاو ئاوڕێکی بۆ دواوە دایەوە سەیری کرد ئەو هێشتا بە دیار گۆڕەکەی شەوبۆوە چەقیوە!.

١٩٨٨/١٠/٨

# تە ناکوژم



صديق شرو

دهوك

- نازەنین. . پیچەکێ لەزێ بکە تێشتێ بینە دەرەنگە نوکە دێ شێرکو ئێتە دیف من را.
- باشە عبدی هەتا تو خو پێك دئینی یال بەرتە، بەس تو نا بێژیە من توو شێرکو چەند حەژئێك و دوو دکەن؟
- نازێ من ئەو ژبرایێ خو خوشتر [illegible]یت، هەڤاڵ بۆ مروڤی گەلەکە ژ نانی فەرترە، گەلەك جارا بابێ من یێ گۆتی: کورێ من نان هەڤاڵە. گەلەك جارا هەڤاڵ ژ برای قەنج ترەو ئەز و ئەو چ ل ئێك و دو ناڤەشێرین. . .! تە دیت رۆژا من تو خاستی ئەوی چەند هایکاریا مەکر؟
- دایێ من خارنا تە ژبیرکر.
«بەژنا خۆیا بلند و تەر هژاند وەکی تاکێ شەنگەبیێ، پرچا زەرا داڤ وەکی ئارمیش لسەر ملێد خۆ بژاند لێك زڤری و قەستا ژۆرا زادێ‌کر. . .» زەنگلا دەرگەهی ل چرینێ‌دا.

- عبدی. . . سەحکێ کا ئەو کی‌یە. . ؟
- ما دێ کیبیت نازێ ژ شێرکوی پێڤە هاتیە ددیف من را وەکی هەرو دابچینە کارگەهێ.
«عبدی رابو پێ خو د شمکێ راکر و خراند قەستا دەرگەهی کر».

- رۆش باش.
- گیان باش.
- دێ وەرە ژۆر.
- ئەز دبێژم تە تێشت نەخاریە؟

- دێ وەرە ژۆر بەلکی توژی پاریەکی دگەل من د خوی.
- نەبرا دەیکا شیلانێ یا زیرەکە
- دێ وەرە ژۆر چ ئاریشا بو مە چێ نەکە هەما نازێ گوهـ ل تەبیت دێ رابیتە تە.

«هەردو پێکڤە کەنین و ب ژۆرکەتن. »
- بابێ شیلانێ ب خێرهاتی.
- خیران داربی. . «بەرسڤا وێ‌دا نە ژ دل هەر سەرێ خو ژی شێرکوی نە بلندکر کو چاڤێد وی ب چاڤێد نازەنینێ بکەڤن. »
- شرکو ئەڤە چیە برا هەچ وەکو تو ژ نازەنینێ یێ سلی. ؟
- نە. . . لمن ببورە
«نازەنین شەبرزەبو ب خارنێ ڤە. پەیالەکا چایێ دانا بەر شێرکوی»
- دێ بخو برا
- سوپاس نەشێم نوکە من یا خاری.
- پاریەکی بو خاترا من.
- نەشێم ب سەرێ تە عبدی. . !
- دێ پا چایا خو ڤەخو.
- وێ ژی نە شێم.
- خو ژەهر نینە مالا تە
- رابە درەنگە.

«نـازەنـین کەفتە زڤرکا خەم و هزرا ئەڤی چیە هوسا یێ گوهشی دێ یەڵلا ما من شوڵەیێ‌یە. » هەر دو دەرکەفتن عبدی خاتـرەکا گەرم ژ نازێ خاست هەکەر شەرم نەبا دا هەر دو رویێت وێ ماچی‌کەت

- عبدی ئەز گوری زوی بێ‌یە ڤە ئەزا ل هیڤیا تە.
- باشە.
ژ مالێ بە خارکەفتن دلێ عبدی خو نەگرت ژ قوتانێ و هەتا مەخسـەدا گوهوشینا هەڤالێ خو یێ هێژا نەزانیت.
- هەرێ شێرکو من دڤێت بو من دیارکەی کا بوچی توو نازەنین طایەك نینن ئەڤە هەیامەکە؟ تو زادێ وێ ناخوی. ئاخفتنێد تە هەر ب تیفکلن؟
- عبدی وەلەو رێکا مە یا کورتە بەلێ ئەز دێ تشتەکی بوتە بێژم.
- فەرموو شێرکو هندە پیاسێ بکەین هەتا جهێ دی یێ پاصێ.
- عبدی ئەڤە ژمێژە ئەز و تو هەڤالێد ئێك و مە چ ل ئێك و دو نە ڤەشارتیە و ئەز برایێ ئەمە
- خودێ د زانیت تو ژبرایێ من هێژا تری.
- ژبەر هندێ من نەڤێت تو یێ خاپاندی بی.
- خێرە شێرکو تە چ گوهـ لێ بیە؟
- عبدی من یێ دیتی ب هەر دو چاڤێد خو نە من گوهـ لێ بیە.
«دلێ عبدی سەد ئاواز گوتن ئەڤی چ دیتیە بو خاترا خودێ»
- بێژە.
- ئەز دێ بێژم بەلێ سەدا سەد تو دێ هەڤالینیا من هێلی و ژنوکە دێ ژێك ڤەبین.
«عبدی زەندکا شێرکوی گرت پێ د وی مانە ب عەردی ڤە
- شێرکو تە چ دیتی‌یە. ؟
- عبدی ئەڤە شەش سالە ئەز و تو لڤێ داهێرێ «کارگەهێ» پێکڤە خوش و نەخوشێد مە ئێکن من و تە نان و خوییا پێکڤە خاری.
«عبدی کەفتە زڤرکەکا هزرا من چ کریە - تو بێژی ئێکی تشتـەك گوتی‌یێ ئەوی خویشکەکا شویا یاهەی بەس ئەز ب چاڤێ خراب نا بەرێ خو دەمێ. . نەء وەدیارە وێ روژا هاتی ئەز و ژنا وی ب تنێ پێکڤە ل مالا وان د روینشتی و د ئا خفتین و بەس پا هنگێ دەینـەکریەو چ ددلێ من دا نینە بو وێ. . . ! قورچیا خو داعویرا و گوت:
- شێرکو زویکا بێژە تە ئەز دین کرم.
- عبدی. . . ژنا تە. . !! یا ل تە خاینەو حەژ ئێکێ دی دکەت ئو من بە ڤان چاڤا یا دیتی تولازەك تێتە دەف مالاتە.
- شێرکو. شێر. کو. . . تو. . تو چ بێژی. شێرکو ئەڤە تشتەکێ مەزنە تەگوتی!

- باوەر بکە هوسایە.

- شێرکو ئەز کەسەکی وەکی نازوی نابینم. ئەز نەڤێم باوەر ناکەم

- ب جەربینە عبدی..

- شێرکو وەدیارە حەژ تە دکەت تو یێ ل من غاین بی.

- عبدی من گونەهـ بار نەکە. خو تورە نەکە ئەم یێ ل سەر جادێ شەرمە ژبەر خەلکی بەلێ سوباهی نەهێ کاری و زێرەڤانیێ لێ بکە دا بوتە دیار بیت.

چاڤێد عبدی دسەری‌را سوربون روندکا جڤاتا خو گرێدا لێڤێد وی لەرزین.»

- عبدی خو تەنگاڤ نەکە بەلکی ئەز یێ خەلەتم

- شێرکو ژ من ڤەبە هەرە نە هیچی من و نە هیچی تە هەر ئەز تە نانیاسم. ما ژیانا من بو چی‌یە..

«ئەوێ روژێ کەسەرێد عبدی مشەبون کەنیێ ژ وارێ وی بارکر زڤریڤە دلێ شکەستی هزرێد خو کرن و گوت: هندە سالە ئەز و ئەو پێکڤە د ژین دوماهیێ ئێکێ دی دڤێت باشە نازو. مانێ شەرەڤا عەزیزە. بەلێ پا دێ چەوا لسەر تە ئاشکەرا کەم. عبدی ددلێ خودا هزار پێلان دانان و نژنین و هەرڤاندن. دوماهیێ رێکەك بخو دیت.»

- نازەنین.

- بەلێ عبدی

- ژیانا من - عەمرێ من - ئەز دێ سوباهی چمە وەغەرەکێ ژ دەرڤەی بازێری ب شولێ داهیرێ ئو سێ روژا دێ مینم ڤێجا هەکەر تە ڤیا هەرە مالا دەیکا خو یان مالا بابێ من هەکەر سەبرا تە ژی بهێت ل مالا خو بە.

- ئوهـ عبدی سێ روژ کەلەکن ما کەس نەبو پێشتەڤە بچیت؟

- هەر ئێك و شولێ خو.

- دێ باشە بەلکی ب چمە مالا دەیکا خو وان.

«بو روژا پاشتر عبدی چانتا خو هەلگرت.. نازەنینێ روندك ژ سیرەتێ خو زوهاکرن خاترا خو ژێ خاست. دوکانا مام سعید سی سەد مترا ژ مالا وی ویڤە تر بو عبدی چو دەڤ مام سعید ب هەجەتا ل هیڤیا ئێکی مروڤێ ویە کو ب مالا وان ناکەڤیت ئو ژڤان یێ دایێ لدەری وێ دوکانێ... روینشتە خارێ... سەعەتەك پێڤە نە چو.. نازەنین دەرکەفت ئو لدوماهیا جادێ غەوارە بو عبدی ڤەستا مال کر.. گوتە مام سعید وەدیارە ناهێت. چو مال ب کلیلا دی دەرگەهێ خو ڤەکر جهەك بو خو د مەزەلکا قاچ و ڤورا چێکر. سەعەتەك چو دو چون دەنگێ دەرگەهی هات نازەنین هاتە ژور. عبدی دکونا دەرگەهی را سەحکر یا ب تنێ بو. ناز رابو جلکێد خو گوهارتن پشتی گەرماڤوك هەلکری. بێهن ب خو داکرن.. پشتی بێهنەکێ دەنگێ دەرگەهـ گرتنێ هات.

- توهاتی. کەسێ تو نە دیتی..؟

- نازو ما ئەڤرو ب تنێ ئەز تێم کو تو بترسی؟

«دلێ عبدی ها نەمایە دێ ژ سینگێ وی دەرکەڤیت. هندە جارا یێ د بێژیت ئەز خانی بسوژم. ئەز ڤەستکەم هەردوا سەر ژێکەم. ئەوا هوسا غاین و ئەز نەڤێم هندە سالە. لەوا نەڤێت چ عەیال ژ من هەبن..! هندە سالە من دخاپینیت نەیا هێژایە سەرا وێ خو بێخمە زندانا ئەد زانم دێ چەوا وێ کوژم... دەنگێ هەردوکا «مط» بو چونە ژورا نڤستنێ عبدی چو ساتورەك ئینا هندی شیرەکی و ڤەستا دەرگەهێ وان کر خو هاڤتە ژور چ د بینیت..... ئەو نازە نازەنین لەشێ سپی و پیروز رویسکری لناڤ لەپێت ئێکێ بیانی. ژنکێ ژ بنێ‌پیا کرە هەوار.

- عبدی نە من نەکوژە. دەستێ تە ماچی دکەم چار چەڤا تەختی دخو وەرکر خو دڤورنەتێ ژورێ‌را حەشاند و خونخافت. کابرایێ دی ژی خودانێ پرچا ڤژ و بەلاڤ. چاڤ زیڤێ لێڤ توێز مال سەر تەختی دەڤێ وی هشك بو لەرزی و گوت:

- برا نە خەتێت منن ژنا تە ژمن نا ڤەبیت. «عبدی ساتورا خو راستکر»

- بەختێ تەمە من نەکوژە تە چ د ڤێت ئەز دێ دەمە تە.

- باشە ئەز تە ناکوژم.. عبدی ما بو لسەر هزررا خو ئو وێ رێکا بخو دیتی.

- بێژە پا تە چەند پارە د ڤێن؟

- من چارێکەکا دیناری ب تنێ د ڤێت.

- چەوا چارێکەك ما تودین بی

- ما تە شولە پێ یە

«مێرك رابو د خو خەبتی چارێکەك داڤێ جلکێد خو دبەر خو را حەشاندن. عبدی هەویا وی ژێ وەرگرت و گوتی دێ تو هەرە هەتا روژا تە تێت.... عبدی ژی گوتە ژنکێ رابە

ئەز تە ناكوژم چونكە من گەلەك تو دڤێی و كەسەك نزانیت
- نەب خودێ تو دێ من كوژی. تو بێ دیاری
- تەنا كوژم - بەس بێژە من چ ژ تە بێ كێم بو. ئو چەوا نوكە تو خوّل من ڤدد شێری؟ ئەڤە چەند سالە تو حەلالا من.
- عبدی ژێ چو دەر.. من عاڤكە. هەكەر تە دڤێت من بخو بكوژە

- باشە چەوا تو دسەر من را حەژ وی دكەی؟
- عبدی من وی حەژ ئێك دكر هێشتا عەمرێ من چاردە سال یا بێئاقل چ ژ دونیائێ نەدزانی ئەڤێنەكا كورە بو كو ل گەلەك كچكێد وەكی من بوینە قوربانی وێ حەژێكرنا خەلەت بەری كو ئەز شوی ب تە بە كەم من دگوتێ هەكە تو راست دبێژی من بخو بخازە هەر ژ من دروڤی ئەز نەچاربوم بخو ل شریكەكێ باش بگەرییم كو هەر كچەك ل دونیایێ بخو وێ هزرێ دكەت من گوت دا ئەز ببمە خودان مال و مێر و حال پاش من بوتە قەبیل كر وەختێ من تو دیتی

- باشە پا تو بوچی لمن خاین بوی؟
پشتی من شوی ب تە كری هەرو گەف لمن دكرن چونكە كاغەز و شكلێت من یێ ل دەف وی ڤێجا ژمن ڤەنەدبو هەرو دگوتە من دێ نیشا مێرێ تە دەم. من دڤیا ژێ بكرم چەند پارە ڤیابان دا دەمێ بەس ئەز ژبەندا وی خلاس ببام قەبیل نەدكر گوت من پارە نەڤێن من تو دڤێی. ئو من نەدزانی دێ چكەم ئەزا زەعیف بوم نەویرام دەنگ كەم

- باشە نازو من توعاڤكری...
«عاڤ كرن.. بەلێ پا برین هەر یا هەوددەت چونكە مەزنتر نینن ژڤێ لنك مێرێ خودان هەناز و شەرەف بەلێ پا هەدار سەرێشكا هەمی تەنگژایە بو دەرگەهێ ڤەبونا تەناهیێ و سەركەفتنێ مێرێ عاقل ژێ ئەوە خو نەكەتە قوربان هێشی نەگەهشتیە ئارمانجا خوێ»

روژ بو روژێ غیرەتێ نكلێت خو ددلێ عبدی دا برنە خار كرمێ تول ستاندنێ دغول غولی هەیڤەك پێڤە چو. روژەكێ:-

- نازو..

- بەلێ عبدی
- ئەم بوچی ئەڤرو دەیك و بابێ تە داخاز ناكەینە ناز خارنەكێ.؟

- بدلێ تەیە عبدی
- هەما بلا سوباهی بیت
سوباهی هات كەس و كارێد ژنكێ لدوریێد سفرێ خر بون عبدی لبەر كێلەكا خەزیرێ خو روینشت. نازەنین ژێ یا زادی رادئێخیت
- مام
- ها عبدی
- من چارێكەكا هەی
- چارێكا چ بابو

- یا دیناری... چیروكەكا ئەنتیكە یا بوهەی
«وەختێ نازێ گوهـ لێ بوی دەستێد وێ سست بون گوهێد وێ بەل بون دلێ وێ خاڤ بو عبدی بەرێ خودایێ كو یا داخباردبیت ئینا گازی كرێ

- نازێ..
- ها. ها. ها. عبدی
- بێ رەحمەت كا چاكیێ من بەریكا وی یا ژناڤ دا جو..كەكێ تێدا تو دنیاسی كیشكە كا بینە دا چیروكا وێ بو مێهڤانا بێژم
- نازەنینێ داخازا وی ب جێهـ ئینا. ئو چو ..رحدار..ی غەوارەبو

- مام ئەز بچیك بوم خوندكارێ سالا ئێكێ بوم وەختێ ئەز سەركەفتیم «ناجح» بویم بابێ من ئەڤ چارێكە دا من بەرێ بیست و دو سالا ئو.... «ئاخفتنا خو درست نە كریە شوڕێنەك دگەل ڤیریەكێ هات هەمی پێكڤە رابون دركەفتنە حەوشێ دیت نازەنین یا پاڤ بیە هەمما یا د لوكوزیت:-

- من خو كوشت... كە... سێ.. وەل... من نە... كر.
«عبدی ددلێ خودا گوت ئەڤە ئێك چو جارێ.....!» روندكێد خو ڤەمالین.

## چیرۆك



مصطفی صالح کریم

«دڵنیام لەوەی کەنان و نمەکی لەبەرچاوە»

بەدەم ڕێگــاوە لە بەرخــوّتـــەوە چەنــد جارێ ئەم ڕستــەیــەت دووبارەکردەوە، ئەمجا پاش کەمێ وتت: «چۆن چاکەی منی لەبیــر ئەچێتــەوە؟، ئێستــاکــە بەیــەك دەگــەین، دوای ئەوەی بە سەرهــاتی خۆمی بۆ ئەگێــرمــەوە چاوەکانی پڕ ئەبن لەفرمێسك، گەلێ دڵنەواییم ئەکات و پێم ئەڵێ: نامەردت نەکەن! بۆ زوو نەهاتی، ئێمە براین ئەمجا بەئارەزووی دڵی خۆم ئیشەکەم بۆ ڕادەپەڕێنێ، ئەرك و ئازارو ناخۆشی ئەم ساڵەی ئەو بیابانەم لە بیردەباتەوە، بۆ نان خواردنی نیوەڕۆش بە زۆر دەمباتە ماڵەوە، هەر بەوەشەوە ناوەستێ شەویش لە خۆشترین شوێن دەعوەتم بۆ ئەکات» گەیشتیە بەر وێزگەی پاسەکان، پێیان وتبووی سواری پاسی ژمارە [٣٢٤] ببە ئەتباتە بەر ئەو دایەرەیە، خەڵکێکی زۆر وەستابــوون هەر کە پاسێ ئەهــات و ڕوژمی خەڵکــەکە تۆشیان لەگــەڵ خۆیــانــا ڕاپێــچ دەکــرد، کە ئەتــزانی ئەو ژمــارەیــە نییە دەگــەڕایتــەوە دواوە. دوو کەس لە نزیکتــەوە ڕاوەستــابــوون، یەکێکیان بەوی تریانی وت: «

- تێ نــاگــەم ئوتێــل بۆ وای بەمەســەرهــاتــوە؟ بۆ ئەبێ ئەم پەرو ئەوپــەری بەغــدابکــەی تا ئوتێلێکی هەرزان بەهــاتێ چنگــە دەکــەوێ؟ «ئــای! ئەگــەر منــیش دەردی دڵــی خۆمــتــان بۆ هەڵــدەرێــژم! ئەگــەر ئەزانن بەدەست ئوتێلەوە چیم بەســەرهاتوە خۆتــان لە بیــرئــەچێتــەوە» بەرە بەرە ئەوڕۆژەت بیــرکــەوتەوە کە لەتــەك کەمــالی هاوڕێتــا گەیشتنــە شارۆچکــەکــەی ڕێی بیابانی ڕۆژئــاوا، لە ڕۆژە هەرە گەرمــەکــانی ئەو وەرزەبــوو، زۆرتــان هەوڵ دا کەلەیەکێك لەو دوو میوانخانەیەی هەبوون جێیەکتان دەست بکــەوێ، بەڵام بێ سوودبــوو، خاوەنی دووەمیــان تەنیا بەڵــێنی ئەوەی دانێ کەشــەو لەســەربــان جێی نووستنتــان بۆ بکاتەوە، بۆیە بەدرێژایی ئەو ڕۆژە بە جووتە جادەکانتان پێوا، تەنــانــەت لە چاخــانەکانیشا شوێنێکی واتان دەست نەکەوت کە برێ تێیــدا بحــەوێنەوە. شارۆچکەکە بەڕادەیە قەرەباڵغ بووبوو دەتوت، خەڵکی سێ شاری تێئاخنراوە.

دوو لاوەکەی تەنیشتت هەر لەنێوان خۆیانا لە گفتوگۆدابوون، یەکێکیان وتی:

- بەوشــەکــەتیو مانــدوێتییەوە دەگەڕێمە ئوتێلە کاول بووەکە دەمــەوێ سەرخــەوێ بشکێنم و تاوێ پشــوو بدەم، بەڵام حەرام بێ تەقــەی قاپقــاپ و زریکــەی خاوەن ئوتێــل و ژاوەژاوی خەڵکەکە ناهێڵن چاوڵێك بنێم.

خوت ئەزانی شوێنی ئیشەکەم دوورەبێ هەموو بەیانییەك سەعات پێنج بەخەبەربم.

لە دڵی خۆتــان وتت: «کــاکی برا، خۆزگــە پەلــەم نەبــوایەو بمتــوانیــایــە منیش ڕازی دڵی خۆمت بۆ هەڵــڕێژم، ڕەنگە کەمێ باری شانی هەردووکمان سووك ببوایە»

ئەمجــا بیــرت لە یەکــەم شەوی سەربــانی ئوتێلەکــەی لە مەرخــۆتــان کردەوە، کە بەهــەر حاڵێ بوو گوزەرانتــان کردو ڕۆژتــان لێبــووەوە. سەعــات پێنجی بەیــانی دووقــوڵی لەتــەك

هاوڕێکەتا لە چاخانەی ژێر ئوتێلەکە بەرچاییتان کردو چوونە شوێنی گرد بوونەوەی کرێکارەکان. . ئەوەندەی نەبرد پاسێکی ناقوڵا بە گرمەگرم هات یەکێ لەوانەی ناو پیرە پاس بە پەنجە ئیشارەتی بۆ کردن ئێوەش سەرکەوتن. شوێنی کارتان سەعات و چارەکێ ڕێگــا دوور بوو، هەر ئەوەنــدەتـان خۆش بوو کە لە شارۆچکە دەرچوون، پاسە خەڕەکەتان کردی بە تەپوتۆزێ چاو چاوی نەدەبینی. ئەوانەی ناو پاسەکە هەریەکەیان لەچکە سپــیــەکــەی سەری کردەوەو سەرو دەم و چاوی خۆیـــان پێ داپۆشی، بەردەمـاخێکی وایـان کرد کە تەنیـا چاویان بە دەرەوە بوو. ئێوەش چونکە یەکەم ڕۆژتان بوو، نەشارەزابوون، خۆتان بۆ ئەم گێژەڵووکەو تەپوتۆزە ئامادە نەکردبوو، لەبەرئەوە هەرچی خۆڵی ئەو بیـابـانـە هەیـە کەسی نە ئەدۆزیەوە لەئێوە زیاتر، کە بەئـاسـانی ببێتـە میـدانی گەرووتان، برژانگی چاوتان بەخۆڵ و بەفرمێسك سواغ درابوو، کە گەیشتنە ئەو هۆبەیەی دەبێ کاری تیابکەن دەتوت تازە لە ئاش هاتوونەتەدەرەوە.

تۆ لەم بیرەوەری‌یە تاڵەدا بووی کە دوو گەنجەکەی تەنیشتت بە خۆ ڕاپسکــانــدن سەرکــەوتنــە سەر یەکێ لەو پاسـانـەی بە لەنجـەولار گەیشتنـە وێـزگـەکـە، تۆ هێشتـا هەر لەچاوەڕوانی‌دا بووی کە کچێك و کوڕێك قۆڵیان لە قۆڵی یەك دا بوو گەیشتنە ژێـر چەتـرەکـە، بەئـەڵقـەکەی پەنجەکانیاناو بە باسی نەخشـەی ژیــانی دوارۆژیــانـا لە تازە دەزگیـران ئەچـوون کیـژەکـە زۆر بەنەرمی بە کوڕەکەی وت:

- دە بچـۆرە لای ئەوخـزمـەتـان، ئەوخـزمـەتـان، ئەڵێن: زۆر دەستی ئەڕوات باهیچ نەبێ بتگوێزێتەوە بۆ شوێنیکی باش.

تۆش هەمــان شت لیـی ڕوودای، هاوڕێـکـەت چەنــد مانگێکە سەری کردۆتە سەرت و پێت ئەڵێ: «کوڕی باوکم تۆ فؤاد باش ئەنـاسی، ئێ‌ستا پلەو پایـەیـەکی زۆر گەورەی هەیە، ئەو چووزانێ تۆ لەم حاڵەدای! بچۆرەلای‌و حاڵی خۆتی بۆ باس بکە، لەوباوەڕەدام بە تەلەفۆنێ هەردووکمان دەگوێزێتەوە بۆ ئەو شوێنـەی دەمـانـەوێ. . . دەبـڕۆ ناوی خوای لێ‌بێنەو سەرێکی بەغــدا بدەو هەوایـێـکـی باڵی خۆت بدە، بەڵکــو خوابکــات دەرووپـــەکمـان لێ بکـاتـەوەو لێـرە ڕزگـارمـان بێ. . . ئەرێ سیروان لێت بدەم ئەمبەی یان نەء؟» کوڕەکە بە دەزگیرانەکەی وت:

- باشە، بەقسەت دەکەم. . هەڵێکم دەست کەوێ ئەچمە لای بەڵکو شتێکم بۆ بکات.

«لـەسـەرەتـاوە ملم نەئـەدا بەڵام لە ئەنجـامـا بەقسـەی هاوڕێکەمم کرد واهاتووم. . بزانم گاڵ ئەهێنێ یان پەموو!» دیســان هەر خۆت لەگـەڵ ناخی خۆتـا کەوتیتـەوە ناو گێـژاوی بیرەوەری‌و ئەمجا وتت:

«تـازە هاتــووم، ئێستــا ئەچمــە لای، یادگــاری ساڵانی قوتـابێتی‌مـان زینـدوو دەکـەینـەوە، کەس نازانێ ئێمە چەندمان یەکتری خۆش ئەویست، هیچ گومانم لەوە نی‌یە کە چاوی پێم ئەکەوێ بۆ ساتێ ئەحەپەسێ، ئەمجا باوەشم پیێدا ئەکاو تێر ئەم لاو ئەو لام ماچ دەکا، لە نزیك خۆیەوە دام ئەنێ، ساردیەکم بۆ بانــگە ئەکــات، لە دوایــی‌دا ئەڵــێ: قاوەیــان ترش حەز لێ‌دەکەی، پاشان بەزمانە شیرینەکەی جارانی دەکەوێتە هەواڵ پرسینم. کوڕە بەخوا منیش تەمەڵم، نازانم بۆوا دوام خست؟ بۆ زووتر نەهاتم، ئەم ساڵە پڕ کوێرەوەریەم لە زیادەبوو! خۆ من لێـی ناپــاڕێـمــەوە! هاوڕێـمــە، منـەتی تێ‌دانی‌یــە، بە سەریەکمانەوە هەیە، ئەم داوایەم بە هیچ جۆرێ کار ناکاتە سەر کەرامەتم.»

دەنگە ناسکەکەی کچەکە بە ئاگای هێنایتەوە کە بەکوڕەکەی وت:

- وا پاسەکەمان گەیشت.

کە سەیـری ژمـارەکـەییت کرد خۆی بوو، هەمـان پاســە کە تۆش چاوەڕوانی دەکەی. بە پەلە سەرکەوتیت و جێگایەکت بۆ خۆت کردەوە. پاس کەوتە جووڵە، تۆش بەرە بەرە شادمانی لە ڕوخسارتا دەرئەکەوت، جۆرە خۆشی‌یەك لە دڵتا سەمای ئەکرد کە فەرامـۆشی پێ‌ئـەبـەخشیت. چەنـد جارێ پاسـەکـە وەستاو خەڵکی لێ دابەزین و خەڵکانی تریش سواربوون، تا بە چاوی خۆت ناوی ئەو دایـەرەیـەت خوێنـدەوە کە بۆی دەچـووی، بە خەتێکی گەورەی جوان نووسرابوو کە چاوت پێی‌کەوت گەشایتەوە، دوای سەد مەترێ پاسەکە وەستا، بە پەلە دابــەزیـت و بەرەو دواوە گەڕایــتــەوە سەیــرێـکی ناونیشــانی دایـەرەکـەت کرد، لێیێ دڵنیـابـوویت، چوویتـە ناو ئەسـانسێرە-کەوەو سەرکەوتیتە ئەو نهۆمەی دەتویست لە بەردەرگای ژووری سەرەك دایەرەکەدا خۆت لە کارگوزارەکە نزیك کردەوە، پاش سڵاو جگەرەیەکی بۆن داری لای خۆتانت دایە، تێت گەیاند کە دەتەوێ فؤاد بەگ ببینی، پێی وتی: ئاسایە، چونکە ئەمڕۆ

لەسەعات دوازدەبەو لاوەکاتی چاوپێکەوتنی هاوولاتی‌یانە، فەرموو بچۆرە لای سکرتێر ناوی خۆت بنووسە.

- نەء، نامەوێ ناوم بنووسم و لەگەڵ لێشاوی خەڵکەکەدا بچمەلای، ئەمەوێ هیممەتێکم بۆبکەی بمخەیتە دوای هەموویانەوە، بۆ ئەوەی بەتەنیا بیبینم و تێر لەیەك بخۆین.

- ئاخر، ئەوەندەی کات نی‌یە.

بۆ من کاتی هەیە، جەنابت نازانی ئێمە نێوانمان چۆنە، لەبرا ڕیاترین بۆ یەکتری، ئێستاکە چاوی پێم بکەوێ هەرخۆی ناهێڵێ وازوو بێمە دەرەوە. ئێمە خەڵکی شارێکین و خۆشەویستی یەکترین.

- باشە بەسەر ئەم چاوانەم، من ئەوەت بۆ ئاسان ئەکەم، بەو مەرجەی تۆش چاوێکت لەمنەوەبێ، مادام ئەوەندەتان بە سەریەکەوە هەیەپێی بڵێ لە پارەی ڕێزانەی ئەم جارە بێ بەشم نەکا، کۆشێ خێزانم هەیەو ئەرکی ژیانیش خۆت ئەزانی چەندگرانە.

- بەڵێن بێ هەر کە کەوتینە گفتوگۆ ئەمەی تۆشی پێ دەکەم.

- دەفەرموو لەسەر ئەوکورسی‌یە دانیشە.

لەتەنیشتیەوە دانیشتی، دڵت زۆر خۆش بوو، دەتەویست هەرچی لە دەروونتایە بۆ ئەم کارگوزارەی هەڵڕێژی.

پەرداخێ ئاوی ساردی بۆهێنای، خواردتەوە، ئەمجاڕووت تێ‌کردو وتت:

- کاکەگیان لەتەك ئەم کاك فؤادەدا (١١) ساڵ لەقوتابخانە پێکەوەبووین، هەرگیز لێك دانە بڕواین چ لە قۆناغی سەرەتایی‌و چ لە ناوەندی‌و دواناوەندی تا ڕۆژگار کارێکی وای کرد کە هەریەکەمان لەشوێنێ بگیرسێتەوە.

کارگوزارەکە بەدەم زەنگی سەرەك دەزگاوەچوو، هاتەوەو لەسەر سینی‌یەك دووقاوەی بردە ژوورێ... کە ئەم جارەیان گەڕایەوە قاوەبیەکیشی بۆ تۆهێناو سکرتێر بۆ کارێ ناردیە ژووری دارایی تۆش چویتە دەریای بیرەوەر یەکانتەوە. ئەو ڕۆژەت کەوتەوە بیر کە خۆپیشاندانێکی گەورەبوو، دوور لەو شوێنەی تۆ فؤاد بەدەماکەوتبوو، دۆنکی بەدەستەکان بەربووبوونە وێزەی، پێش ئەوەی بەجارێ لێی بوروژێن و شل کوتی بکەن، دایکت فریای کەوتبوو لە ژێرچنگیانی دەرهێناو خستیە ژێر عەباکەیەوەو گەیاندیە ماڵی خۆتان، فؤاد نیوەگیان کرابوو، دایکت بە دەوروپشتیا هات و خزمەتی‌کردو نوێنەکی گرتە ئەوشوێنانەی لەشی کە شین و مۆر بووبوەوە، نەشی‌هێشت تا دوای دوا ڕۆژ بچێتەوە ماڵی خۆیان ئەو سا زانیمان کە ئەوانەی ئەو ڕۆژە لەو گوزەرەدا بەردەست کەوتبوون هەموویان گیرابوون و لەدوایی‌دا حوکم دران.

بۆیە هەمووجارێ فؤاد ئەیگوت: قەرزاری دایەم، ئەو نەبوایە ئێستا پێستم گوروابوو.

لەو خەیاڵانەدا بووی کە کارگوزارەکە پێی‌وتی:

- ئێستا ئیتر دەوری چۆڵ بووە، فەرموو لەم دەرگایەیانەوە بچۆ ژوورەوە، بەڵام لە خۆشی خۆتان وات لێ نەیێ منت لەبیر بچێتەوە.

دەرگای بۆ کردیتەوە، هەنگاوت نا، سڵاوت کرد، پێش ئەوەی سڵاوەکەت بسێنێتەوە تەلەفۆنە سەوزەکەی سەرمێزەکە زریکەی لێ‌هەستا، دەستی بۆ بردو کەوتە گفتوگۆ، تۆ حەپەسابوویت! دیکۆری جوانی ژوورەکەی، کورسی‌و مێزەکەی، کتێبخانەکەی تەنیشتی، ئۆرتەی کاشانی ڕاخراو، تەلەفزیۆنی ڕەنگاوڕەنگ، هەوای ژوورەکەش ئەوەندە ساردو فێنك بوو لە دڵی خۆتا ئاواتی ئەوەت ئەخواست بە ئارەزووی خۆت لێی‌ڕاکشێی‌و بنوویت.

* * *

لەوکاتەدا کە بەگ تەلەفۆنی دەکرد تۆش لەبیرەوەری‌یەکی تایبەتی خۆتا ئەژیای بۆیە پچڕپچڕ ئەم قسانەت بەرگوێ دەکەوت [بەڵێ... ئا، دوێنێ شەو لە کۆشکی عەبباسی بووین... کابرای بەڵێندەر، ئەوەی جاری پێشوو تۆ هێنات، زۆری دۆڕاند، کوڕە سەیربوو پارەی فڕێ‌ئەدا... ئێ‌وا بوو، تەختمان کرد... ئا باشە... کاکە لەبیرمە، بەڵام پشووم نادەن، ناهێڵن ئیشی ئەم خەڵکە ڕایی‌بکەم، زمانم سواوە ئیمڕۆ ئەوەندەی وەڵامیان بدەمەوە. بەسەر چاو، [illegible]ە، هەر ئیمڕۆ ئیمزای ئەکەم... شەو، بابزانین، ئێوارە ئاگادارت ئەکەم]

* * *

هەر لەو کاتەدا کە ئەو تەلەفۆنی دەکرد تۆ لە پەڕەپەڕەکردنی یادگارەکانی ڕۆژانی ڕابوردووی هەردوکتانا بووی، ئەگەرچی ناوبەناویش گفتوگۆکەی بیرەوەریەکانتی لێ‌ئەشێوانی. چاوت بڕیبوە ئەو پیاوەی کە ئێستا لەم نازو نیعمەتەدایە لە دڵی خۆتا وتت: «قوربانیی منی لەبیر ناچێتەوە، ئەوە جارێ سەری بەم تەلەفۆنەوە قاڵە».

دەفتەری یادگارەکانی ناومێشکت لە پەرەیەك دا وەستا، وەك کاغەزی سپی بخوێنیتەوە «وائەزانم ئەمرۆیە، ئێوارەیەکی درەنگ بوو، خۆپیشاندانی حەو زەکەی ناو بازار بە تەقەو بە قۆناغە تفەنگ و بە قامچی کوژێنرایەوە ساڵ ساڵی ١٩٤٨ بوو شاری سلێمانی بەرگێکی خەمگینی پۆشیبوو، ئیرهاب وەك هەورێکی رەش بەری ئاسمانی شاری تەنیبوو، پۆلیس کەوتنە راونانمان، هەر کەسێکیان بەردەست بکەوتایە دوای سەروگوێلاك کوتاندنەوە باڵیان دەبەست و ئەیان گرت، من بە پێدزە لای گومرگە سووتاوەوە خۆم گەیاندەوە ماڵی خۆمان پاش چەند دەقیقەیەك لەکۆڵانەکەمانا دەنگەدەنگ پەیدابوو، گوێم لێبوو خەڵکی دەرودراوسێ بانگی زەلامێکیان دەکردو ئەیانوت: مەچۆرە ئەوێ، پۆلیسەکان بە دواتەوەن، خۆت بە کۆڵانێکی ترا بکە، کورە مەچۆ، چاویان لێتە، ئەتگرن، بەلایەکی ترا دەرباز بە. من لە خۆمەوە لە ژوورەوە دڵم کەوتە ترپەترپ، خێرا جلەکانم گۆڕیو بیجامەم لەبەر کرد.. ئەوەندەی پێنەچوو کاکم بە تەپەتەپ خۆی بە حەوشەدا کرد، کە لە پەنجەرەکەوە سەیرم کرد (فۆاد)ی هاوڕێم بوو. باوکم خێرا دەستی گرت و بردیە گەنجینەکەوە لە ناو زەخیرەکانا شاردیەوە. ئەوەندەی نەبرد کە قۆمیسەرو بارچاوەش و برێ پۆلیس خۆیان کرد بە ماڵا، راستەوخۆ بە باوکما هەڵشاخان و قۆمیسەرە دێزەکە پێی وت: کوا ئەو تەلەبە سەر چەوورەی ئێستا خۆی پێرەدا کرد؟ باوکم وتی: نە کەسمان دیوەو نە غەریبەش هاتۆتە ئێرە! فەرموون ئەگەر بڕوا ناکەن ماڵەکە بگەڕێن. هاتنە کەلەگیریەکە، بە جامەوە دانیشتبووم کتێبێکم بە دەستەوە بوو گوایا سەعی ئەکەم. کردیانە هەللا، ئەی ئەوە نییە دانیشتوە ئەڵێی: نە بای دیوەو نە باران. جەنابیشتان حاشای لێ ئەکەن. باوکم وتی: ئەمە (عەبدولسەلام)ی کورمە، هەر لە ماڵەوە بووەو نەچۆتە دەرەوە، تاقیکردنەوەی بەکەلۆریان نزیك بۆتەوە هەمیشە دوای قوتابخانە لە ماڵەوەیەو بە دەرسەکانیا دەچێتەوە.

قۆمیسەر ئەوەندەی تر رەش داگیرسا، وتی: پێشمان کەوە لای ئێمە سەعی بکە. خوشکەکانم شڵەژان، ئەلەرزین، دایکم فرمێسك لە چاویا هۆن هۆن دەهاتە خوارێ، لە ترسی ئەوەی نەوەك لە عەزرەت من بیدرکێنن و بڵێن: ئەو نییە، ئەوەی ئێوە ئەتانەوێ لە ژووری گەنجینەکەدایە.. باوکم خێرا چاوێکی لێ زیت کردنەوەو وتی: بۆ ئەیکەن بە هەرا؟ چی لێ ئەکەن؟ چی لە سەرە، هەر ئێستەو دێتەوە.

ئیتر کەس ورتەی لێوە نەهات، منیش خۆم گۆڕیو پێش پۆلیسەکان کەوتم و خرامەناو ئوتومۆبیلەکەیانەوە.»

تەلەفۆنە سەوزەکەی دانایەوە، کەمێ سەرنجی دایە دەم وچاوم پێش ئەوەی ورتە بکات زەنگی تەلەفۆنە سوورەکە هەردوکتانی بە ئاگا هێنا، دەستێکی بۆ برد لەگەڵ (هەلاو)دا سوورێکی بە کورسیەکەیدا [سۆزەخان، هەر باشە گوێمان لە دەنگیشت بێ، بەڵێ ئەو دەنگە لە ناو سەدان دەنگە دا جیائەکەمەوە.... مەگەر یەکێ زۆر گێل بێ... باشە... باشە چاوەکەم.... لە بەر دڵی تۆ کار نییە ئاسان نەبێ... ئەم پێنج شەممەیە.. باشە (بە پێکەنینەوە) مێردە مەیموونەکەشت دەهێنی؟] *

* لە کاتی تەلەفۆنەکەدا بیرت لەوە دەکردەوە چۆن راپێچ کرایو درای بە عورفی، بە پەلە سێ ساڵ بەند کرای، فۆادیش هەر دوای دوو مانگ لە تاقیکردنەوەی بەکەلۆری دەرچوو، چووە ئەو کولێژەی پێکەوە خەونتان پێوە دەبینی.. تۆ بوویت بە قوربانیی ئەو، لە جێی ئەوە چوویتە بەندیخانەوە، دوای بەربوونت ماڵتان شێوابوو، باوکت کۆچی دوایی کردبوو، ئەرکی بەخێوکردنی خێزانەکەتان کەوتە سەر شانی تۆ، بۆت نەکرا خوێندن تەواوبکەی. لە وەزیفەیەکی بچووکا دامەزرای، پەنات نەبردە بەر کەس. بەڵام ئێستا ناچاری شوێنەکەت ئەوەندە ناخۆشە پەنات هێناوەتە بەر هاوڕێی دێرینت

تەلەفۆنەکەی داناو سەیرێکی تۆی کرد، رەنگێکی ... ئەمجا وتی:

- ها چیت ئەوێ؟

- کاکە فۆاد ئەڵێی نامناسیتەوە؟

- مەرجە من هەموو کەسێ بناسم؟ زۆر سەیرە هەر یەکێ دێتە ئێرە وا خۆی پیشان ئەدات کە برای باوکمە.

- ئاخر، من هەرکەسێ نیم، ئێمە هاوڕێی رۆژانی تەنگانە بووین نان و نمەك لە نێوانمایە.

- ناشێ شەرە کەوچکم لەگەڵا کردبی

- بۆ کاك فۆاد لەبیرت چۆتەوە دەیان شەو دایکت قوبوولی ساوەری بۆ لێئەنایین و بە ترشیاتەوە بۆی دائەنایین و ئەیوت: سەلام حەز لە ساوەر ئەکات. ئەی لە بیرت نییە دەیان نیوەرۆ لە ماڵێ ئێمە دایکم هێلکەو قاورمەی بۆ ئەکردین و ئەیوت:

ئەوە لەبەر خاتری فؤادە، ئەو حەزی لێ ئەکات.
ئەی کاکە شەرە کەوچك لەوە زیاتر ئەبێ چۆن بێ.
- نایەتە بیرم. . . شتی وام هەرگیز لەبیر نی‌یە.
- ئەی خۆ ئینشاللا ئەوەت لەبیر نەچۆتەوە کە لە ماڵی خۆمان من بومە قوربانی تۆو لە جێی تۆ چوومە بەندیخانەوە [کە گوێی لە وشەی بەندیخانە بوو ڕەنگی هەڵبزرکا لە دڵی خۆیا وتی: «چۆن ئەم کابرایە لێم بۆتە شمڵی شەڕ، ئەیەوێ شەجەرەم بخوێنێتەوە ! ئێستا ئەمە پێویستە تۆ باسی بەندیخانەو مەندیخانەم لە لا بکەی! کابرا بە کرێم گرتووی؟» سەرێکی باداو وتی:
- من هەرگیز نەگیراوم، بەندیخانەشم نەدیوە.
- جەناب ناڵێم تۆ گیرای! قورەکە بۆ من گیرایەوە، من لەباتی تۆ گیرام.
- تۆ بە هەڵەدا چوویت. . ئەمانەی تۆ ئەیڵێی دوورن لە ڕاستی‌یەوە. ڕاستە خەڵکی شارێکین. ئەشێ لە قوتابخانەدا پێکەوە بووبین بەڵام ئەم گرتن و مرتنە لە باخەڵی خۆتیان دەرئەهێنی‌و من ئاگاداری نیم
- چۆن ئاگادار نی؟ دوو مانگمان مابوو بۆ تاقیکردنەوە، من لێی بێ بەری بووم و تۆش دەرچوویت و چوویتە کولێژ.
- دەوا بڵێ: ئەمەیە لە خەیاڵی داوی! تۆ قوتابی‌یەکی دواکەوتە بوویت و هیچت لە بارا نەبووەو منیش بە هەوڵی خۆم گەیشتمە کولێژو لە پاشان لیسانسم وەرگرت، دوای چەند ساڵی وەزیفەو هەوڵ و تەقەللا زەمالەیەکم دەسگیربوو، چوومە ئەورووپا بە شەونخوونی‌و ڕەنج و ماندووبوون باوەڕ نامەم وەرگرت و پاشان گەیشتمە ئەم پایەیە.
- بە هەوڵی خۆت، یان بە هەڵپەرستی؟
- لە سەری مەڕۆ! ئەمە قسەی ئەوانەیە لە ژیانا سەرکەوتوو نین، تۆ داخی ئەوەت لە دڵایە کە نەت توانیوە وەك من کۆشش بکەی‌و خۆت پێ‌بگەیەنی.
- نەخێر وانی‌یەو هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە، تەنیا ئێستاو لەم ساتەدا نەبێ کە پەشیمانم بۆ ئەو چاکەیەی لەگەڵ ناکەس بەچەیەکی وەك تۆدا کردم ورەنجم بە با چوو! وام ئەزانی ئێستا تۆ وا پێشوازیم دەکەی کە ئازاری رابوردووم لەبیر ئەبەیتەوە، نەم ئەزانی ئەو پیاوە نیت.
- بزانە چۆن ئەدوێی! کارێکی وا مەکە گاڵ بدەم بەتەکان بتکەنە دەرێ.
[لە دڵی خۆیا وتی: «توانای ئەوەشم نی‌یە ئەزانم دایەرەکەم دەهێنێتە سەرو ئەیمە بنێشتە خۆشەی ژێر زمانی فەرمانبەرەکان، ئەمجاوتی: ]
- باشە من تێنەگەیشتم تۆ چیت لە من ئەوێ؟ تۆ واز لە ناسیاوی‌و ماسیاوی بهێنە.
- جا کە تۆ نەمناسی ئیتر من چیت داوا لێبکەم؟ کە تۆ پیاوێکی وابی تف لە رابوردووی خۆت بکەی‌و چاو لە هەموو حەقیقەتێك بنووقێنی ئیتر من ئیشی تۆم بۆچی‌یە! من خۆم هەڵکێشاو وتم: فؤادی هاوڕێم بە تەلەفۆنێ ئەمگوێزێتەوە چووزانم بازاڕی دەهر بەم جۆرەیە.
- جارێ من هاوڕێت نیم، جگە لەوەش دەست ناخەمە ئەم جۆرە کارانەوە، خۆمی پێ لەکەدار ناکەم.

تا بردیتیەوە، هەروا بەقین و رقەوە خیسەت لێ‌دەکرد، ئەویش توانای نەبوو چاو ببڕێتە چاوت. دەستی بە گیرفانی کراسە سپی‌یە ئاوریشمیەکەیا کرد، دوو دە دیناری دەرهێناو لێی نزیك کردیتەوە:
- ئەوە بۆ مەسرەفی بەغدات
دەستت بۆ پارەکە بردو فرێت دا بەسەر سنگیاو وتت:
- من پێویستم بە پارەی گڵاوی تۆ نی‌یە، ئەوە هەر قابیل بە خۆنە چونکە دیارە تۆ لەژیانتا هەموو هەوڵت هەر بۆ ئەمە بووە. ئاخ خۆزگە بمتوانیایە تا هێزم تیایە شەقێکم تێ‌هەڵدایایە - یەك وشەی تر لە دەمت بێتە دەربانگە ئەکەم بەپێتەوە ئەخەنە ناو ئەسانسۆرەکەوە.

بە تووڕەیی دەرگاکەت کردەوەو زۆر بە توندی پێوەت دایەوە، بێ ئەوەی خۆت لە کارگوزارەکە بگەیەنی بە پەلە بەرەو لای ئەسانسۆرەکە چووی،
کارگوزار سەرسام بووبوو، بۆچی وا تووڕەی؟ چی بووە؟ ئاخۆ کارەکەی ئەویشت بەجێ هێناوە، بەڵام تۆ بەو تووڕەییەوە کە هەمووگیانت وەك شۆڕەبی ئەلەرزی خۆت کرد بە دەرگای ئەسانسێرەکەدا، کارگوزارەکە لەو برتەو بۆڵەیەت تەنیا یەك وشەی بۆ ساغ بووەوە کە دەتوت: [هەی حەرام زادە]!!

* * *

■ چیرۆك ■

# هاوار

احمد محمد اسماعیل

هەر کەبیـــری بۆ ئەوە دەچـــوو، با هاواریش بکـاو لە کەللەی سەر بقیرێنێ، نەکەس گوێی لێ دەبێ، نە بەدەنگی‌یەوە دێن، لە ناخەوە دەشڵەژاو موچرکی ترس و نائومێدی تەنی دەتەنی. . «بەم جەستەی پر ژان و ژۆمـــەوەو لە بارێـکی ئاوادا چیم بۆ دەکـــرێ؟». سەری بەرزکردەوە .«دوو بەژن نەبێ، ئەوەندەی لە دوو و نیوکەم نی‌یە . » لەوەی زیـاتـر ئاسمانی بەقەد ساجێك تۆزێ گەورەتر لێوە دیار بوو هیچی کەی نەبینی، ژێـــر پێی خۆڵێکی خەنـــەرەنگی نمـدار بوو، بەم لاو بەولایدا دەستی کوتا، هەندێ وردە چەو کەوتە بەرپێی ⁄ لە بەرزێتی بەژنێکـەوە بەردێکی قوقـز دیـار بـوو بۆ دەست پێـوە گرتن دەشـــیـا، ئیـتـــر تا ساجــەکـــەی سەرەوە بێ گرێ تا سەرەوە داسراو بوو. . بەلام ـ دەکرا پەلێ بۆ خۆی نەکوتێ. .«چی بکەم؟ دەك غیـــرەتت سەگ[illegible]ـــوا پیـــاو! ئەوەی پێم بکـــرێ دەیکـــەم، هیچیشم بۆ نەکرا ئەوا پیاو هەر جارێ دەمرێ، هۆۆۆ هۆۆۆوو!».

یەکـــەم هەڵپـــەی ئەو هاوارە بوو، بەلام بە نیـــوە چڵی‌و بێ هێـز لە گەروویـەوە هاتـە دەرێ، هەر وەك ماستێکی بزرکاو رژایە بەر پێی خۆی، ئێشێکی سەخت، باریکە ژانێك هەروەك گوێزانێك بە ناو لەپیـا بێنی پشتی سر کردبـوو، لە گەڵ هەنـاسـەدانیـا گوێـزانـەکـە دەکەوتە هات وچۆ. دەستی چەپی بۆ دواوەی بردو لەسەر کەلەکەی دانـا ویـستی ئەم جارە هەنـاسـەیـەکی قووڵ بداو هاوارێکی قایمتر بکات. .«چۆن نەمردم سێ بەژن قووڵی‌و حیسابی خۆت بکە، کە بەرێ کەوتم چاوەرێی هەمـوو شتێـك بووم ئەمـە نەبێ. . باشـە بە درێـژی ئەم چەنـد سەعـاتـە رێ‌یـە خۆجوجگێك، زیندەوەرێکم چاوپێ نەکـەوت. . کورە بابـە کێ ئێستا ئەم رێگا سەختە لەبەر خۆ دەنـــێ؟ هۆۆۆو هۆهــۆو. . ». لە نووکـــەوە دەســـتـی پێ کـــرد، سەرسـامی‌و ورِبـوونی کەوتنـەکـەی کەمێ فەرقی کـردبوو و رەوی بووەوە. .«شـەبـەقی دابـوو بەرێ‌کەوتم، دوو سەعاتێك هەی پێم لێ کردو هەر بە خۆشم نەزانی دواجـار وتم با پشـوویـەك بدەم، لە پاڵ گردێـك دا جگـەرەیێکم پێ‌کـرد، وتم چاشتێکی قایم دەگـەمە ملەکـەوە، قـەرەدیار نەبوو. . نابێ هاوارکردنم لە بیر بچێ نەکوئیە خواو راســان یەکێــك بێــرەدا گوزەر بکــات هۆۆۆو هۆهــۆو، جگـــەرەکـــەم تەواو کرد هەستـام زۆر نەرۆیشتم تەمـاشـام کرد لە دوورەوە تۆزێك دیار بوو. . » هەناسەیەکی دا، وەبیرهاتنی تۆزەکە تروسکـــەی ئومێـدێکی پێ بەخشی‌و بۆ چەنـد چرکـەیـەك ئازاری جەستـەی فەرامـۆش کرد، دایە بەر زەین. .«ئەگەر راستەو راست روولە من بکـــا، هەر سەعـاتێ دوو سەعـاتی پێ دەچێ، کورە بە سێ رازیـم، برۆ تازەردەش بۆئەو، هەر شەوم بەســـەرا نەشکێ. هۆۆۆ هۆهـۆهـۆو میللەت هۆۆو. »ئەمجارە کە دەنگی لێ هەڵبری بەقەد هاوارەکەی پشتی چریکەیە کی‌بۆ کردو چەخماخەیەکی‌دا، تا ئەو کاتـە دەستی هەر بەســەر سمتی‌یـەوە بوو، ئەمجارە لە حەژمەتا دەستی راستیشی بە پشتـەوە گرت، وەك ئازیـز مردە سەری بەســەر

سنگیا شۆڕکردەوە، بۆ چەند ساتێك لەو بارە مایەوە، بەزەیی بە خۆدا هاتەوە، گەرچی گەرماو سەرمای زۆر بینیبوو، بەڵام هەرگیز وەك ئەم جارە دەستێکی لە دواو یەکێکی لە بەرەوە نەمابووەوە. «ئەوە خۆ جێ پێیەکی نییە پیاو پێی لێ گیرکات و پیا هەڵگژێ» بە دار جغارە درێژەکەی باخەڵی لەم لاو لەولا بە قووڵایی کوڵەمستێکی هەڵ کەند. «باشە ئەی دەست بە چییەوە بگرم؟».

پیاو بۆ خوا بڵێ قەت گونی وا نەکەوتۆتە فاقەوە! لەناو ئەو چاڵە قوولەدا بە حاڵ جێ دەبووە، دەڵێی هەر بۆ ئەویان ئامادەکردووە، بۆ دڵ نیایی و هەر بۆ خاتری جوڵان لە خۆڕایی جار جارە بە دەوری خۆیا هێندی هێندی سوورێکی دەخوارد. هەمدیس سەری بەرز کردەوە. «خۆ من هاوارەکەم لەبیر کرد!» دەستی پێ کردەوە، هەر بەقەد ساجەکەش هەر ئاسمانی لێوە دیاربوو، بەڵام سپی تر دەچووەوە، دیار بوو خۆر بەرزتر بووەتەوە چاشتی تێپەڕاندووە. «باشە من تۆزەکەم لە کام ئاستەوە بینی، ڕووم لە ڕۆژهەڵات بوو. تۆزەکە کەمێ خوارتر دیاربوو. خوارو ژووریشم لێ گۆڕا. باشە، کە کەوتم ڕووم لەخۆری بەیانی بوو. ئێ تۆزەکە کەمێ خوارتر دیاربوو، ئێستا کامە قیبلەیەو کامە قیبلە نییە جا کێ دەڵێ ڕوولە من دەکاو ڕێک و ڕەوان بەلای جەنابما گوزەر دەکا، دواجار کێ دەڵێ گەردەلوول نەبوو و دەچووە ئاسمانا؟». نەیدەویست لە دڵەوە بڕوا بە خۆی بکات... «ڕەنگە چەند ڕێبوارێك بن، هەر کە ترپەی پێیانم گوێ لێبوو، یەکسەر دەست بە هاوارکردن دەکەم، هەر نایبڕمەوە کوڕە هۆوۆو هۆوۆو. حەز دەکەم تۆزەکە ئەسپێ بێ ئەشهەدو بیللا، ئێستا چوار ناڵەیەتی جڵەوی بە قەڵبوسەکەیەوەیە، یا هەر بە کێشی کردووە، یانی بۆ نابێ، ئەسپێکی سەرهەڵگرتووەو بیرەدا گوزەر دەکات.. کوڕە فریشتەیە خدری زیندەیەو دەیەوێ لەو چاڵەم قوتار کا. دێ، مسوگەر دێ، ئێستا شەلاڵە، دەی وادەزانێ ئەم بیرە ئاوی تێدایە سەری شۆڕدەکاتەوە، تینوویەتی، ئەوەندەی ڕەتاوە تینوویەتی، منیش خۆم ئامادە کردووە. خڕڕڕ پیرە جڵەو ڕێك و ڕەوان شۆڕدەبێتەوە، دەیگرم، لە مەچەکی دەئاڵێنم، پێم. من دەبێ لە هاواری خۆ نەکەوم دەنگی لێکردەوە..»

وا بیرنەکاتەوە چی بکا؟ ئێوە بڵێن چ بکا؟. پێیان گوت برۆ. تۆ برۆو هەقت نەبێ. تۆ شارەزای ئەم ڕێگاو بانەی، ئێمە دەڵێی؟ هەقتە. ئێمە توێشوو و ئەرکی ڕێگات بۆ مسوگەر دەکەین. دەڕۆی ناگەیتە سەرچاوەی ڕۆخانە ڕەزو باخێکت تووش دەبێ، مێوەهاتی دونیای لێیە، تەماع نەتگرێ، مەوەستەو دەستی ڕاست بگرە، ڕێك بە قەڵاکۆنێکت دەگەیێنێ، تێی پەڕێنە، هەر کە ئاودیو بووتیەوە زەوی و زارە بە پیتەکەو کانی دەست تەزێنت باوەش بۆ دەکەنەوە. ئەوجا با هەر باران نەبارێت چ پەکمان پێیەتی، ئیترخەمی نەهاتی دامان ناگرێ، تۆ کە گەیشتی ئێمەش ناوەستین و دێین، تۆ جارێ برۆ. لەم ئان و ساتەی ئێستایدا لە کۆستێك دایە یاخوا کەسی تووش نەبێ زەینی باش بڕناکات چۆنیان بەڕێ خست، ئەم هەندەشی کە لە بیرە ئازاری پشتی پێی دەبزرکێنێ. ڕاستییەکەی لە بیریشی مابێ لە ڕووی نایە ڕاستییەکەی بڵێ.. لەگەڵ کوێخا مەجیدا ڕێك کەوتن پەڵە زەوییەکانی نزیك کانییەکان بۆ کوێخا بێ، ڕەشوڵی بازرگانیش بە فرت و فێڵی کوێخای زانیبوو بەڵام بە زبان لووسی و دونیا دیدەیی خۆیەوە دەینازی کە هەزاری وەك «کارەسول» دەباتە سەر ئاوان و ئاویشی پێ نادا، ئەم لە هەزار ئاوی داوەو قولە پێی تەڕ نەبووە، گوایە کارەسول کێیە؟. بۆچی یەکێکیانی لە گەڵ خۆدا نەهێنا؟. «خۆزی یامەجە یا ڕەشۆلم لە گەڵدا دەبوو، بەڵام ئەوان چاوەڕێی خوانی حازرن.. ئێ کە من تیابچم ئەوانیش دەستیان بە گونم. خۆ بەو خوایە خواداری کردووە، هەر کە لەم چاڵە دەرچم...» سەرێکی بۆ ئاسمان بڵندکردەوە، ساجەکە هەر وەك خۆی بوو. «دەیبرێنەوە..» درۆ دەکا. چەند جاریان تووشی دەردە سەری هێناوەو لە ژێریشەوە ڕیش خەنیان پێ کردووە. کەچی هەر دەستیان لەیەك نەترازاند.. دەبیخۆ. «گۆڕی گیانم بێ، وەك مارمۆیلکە لێرەدا بۆخۆم دەتۆپم» ترسی لێ نیشت... «بەڵام تۆ بڵێی کەسم بەدەنگەوە نەیێ. ڕێبوارێك، خێر خوایەك، کوڕە کوێرێك، سەقەتێك گوایە بیرەدا گوزەر ناکات؟» بیری بۆ تۆزەکە چوو. «دەزانم ڕێبوار نییە، ئەسپە، ئەسپێکی سەرهەڵگرتووەو بۆ خۆی کەوتۆتە ئەم دەشت و هەردەیە. دێ. کاتێکت زانی وەك با هات، دێ و ئاڵەوێ، لای ئەو تاشە بەردە نەحلەتییەوە کە من ساتمەم لێ کردو پێم هەڵتووتا، ئاڵەوێدا دەوەستێ. کونە لووتی کراوەتەوە، بە فیزێکەوە سەیرێکی دواوەی دەکات، ئەسپی ڕەسەن ئەو جۆرە ئاوڕانەو... هەر هەیە تینوویەتی بۆ خۆی سەری نەوی دەکاتەوە... پیرە جڵەو خڕڕڕ دێتە خوارەوە، منیش لە دەستی خۆمی دەئاڵێنم. دەسڵەمێتەوە، باش دەکا کە دەسڵەمێتەوە، بەم لاو بەولامدا دەدا، وێی خۆم ڕاگرم، ئازاریشم پێ گەیشت خۆ ڕاگرم..»

کوێخاو ڕەشول، چاویان بەڕێوەبوو، هەریەکە لە ناخی خۆیدا شتێکی دەگوت:

- باشە ئێمە ڕەشۆل سەری خۆمان کز گرتبوو نەدەبوو بە بەشی خوا ڕازی بین؟! کەس بە ڕەنگاری کاری خوای پێ دەکرێ؟..

ناکرێ . . چ دەڵێی؟ .

- پیاو دەبێ بە گوێرەی قازانج وزیان هەڵس وکەوت بکا . وتیان ناوی خوای لێ بێنە . . ئەو بەیانییە ناوی خوای لێ هێنا . .

کەوتەرێ ، هەندێ ڕێگا ڕاستەکەو هەندێ جار قەدبر لا ڕێی دەگرت . کەوتە هەڵەو تەلانێکی سەختەوە . ئێوە قەت هەردەی زەنگنەتان بە پێ یان بڕیوە؟ . قەدەرێك بە تاوێی لێ هەڵگرت ، هانای بەرز بووەوە ، اللەوە یسییەکەی دەست پێ کرد ، فڕەی کلاوکورەی پاڵ پنجگێك لە نیوەی ئازێ ی زدا پێی بڕی ، چاوی بڕییە کلاوکورەکە ، جارێ نزم جارێ بەرزەفڕ تا لە چاو ون بوو ، لەولاشەوە - هەر بە دەنگە بیستی و نەیزانی لە کوێدایە - تیتر واسکێك غەمی تەنیایی خۆی بە دەشتەکەدا بلاودەکردەوە . بەرەو ڕۆژهەلات هەنگاوی دەنا شیوێکی پڕ لە کونار و قەرەچاری هاتە پێشی ڕێگەکەی بەردا ، بە دەستە ڕاست دا تولە ڕێیەکی گرت ، دەیزانی لە ڕێگە زۆر لاناداو هەر لە« ملەکەوە» ئاودیو بووەوە تولە ڕێگاکە ئاوێتەی ڕێگاکە دەبێتەوە ، بەلام زۆر ڕۆیشت ، ترسا ڕێگاکەی لێ ون بێ ، تاشە بەردێکی بچووکی هاتەرێ ، ویستی قەڵەم بازێك بدا ، ئەوەندەی خۆش بوو ، کە خۆی هەڵدا ئالێرەدا خۆی بینییەوە . هەمدیس سەری بەرزکردەوە . «بەلام تۆپێم بڵێ ئەم نەعلەتییە کێ لەم ناوەی قوت کردۆتەوە . بۆچییان بووە؟ . . بۆ منیان بووە . » خۆرەکە ڕاست کەوتە ئاست ساجەکەوە ، هەر بەقەد ساجەکەش تیشکێك ی زەردباو کەوتبووە [illegible]ەر شان و ملی . . هۆوۆو هۆو هۆو . زۆری نەبرد تیشکەکە لاچوو ، ساجەکەی جاران مایەوە . .«هەر شەوم *بەسەردا نەیەت* . [illegible] » وەك حیلەی ئەسپێکی بەرگوێ کەوت . . هاوار بکە[illegible] دەترسم بروێتەوە . نە ئەسپ بە دەنگی ئادەمیزاد ئاشنایە هۆوۆو هۆوهۆ . دەنگی سمکوڵانی دێ . . ئێستا دەگا ، خۆم ئامادە دەکەم . دێ لە تەك تاشە بەردەکە دەوەستێ ، تەماشایەکی دواوە دەکا ، ها ئێستا سەری شۆڕدەکاتەوە خرِ . . دەیگرم و بەری نادەم «هۆوۆوۆو . . وۆ . »

١٩٨٨

# چیروك :

# خەون و خوزی

● محمد سليم سواري ●

شەڤەکا تاریە . . هەمی شەڤ دتارینە . . . نێ هندەك شەڤ برۆناهیەکێ روهن دبن . . نێ هندەك تاریاتیا ڤێ شەڤا من ژی ، رۆناهیالەمێت جادێ یا دزی . . بەلێ تاریاتیا شەڤا من پترە ژ هەمی رۆناهیا بە رچاڤێت من ، ژبلی رۆناهیا چاڤێت یارا منا شەڤی . . .

رۆناهیێ لگەل تاریاتیێ مودەرکییە . . دناڤ بەرا وێ مودەرکیێ دا ، هەمی تشت نە وەك خونە . . هندەك تشت ژخو مەستر لێتێن . . هندەك دی ژخو بچوکتر . . کێم سیتافك وەك خو دمینن . . ترسا شەڤێ ژی پترە ژ ترسا رۆژێ . . شەڤ گەلەکا بسەهمە بو مرۆڤێت بێ غال و غەرەز و گونەهـ . . نێ بو مرۆڤێ گونە هکار و ژەنگی و دل رەق ، شەڤێ لنك وی چو ترسا خو نینە . . بوی شەڤ پەردەیە ، دا ژەنگ و دل رەقیا خو دبنڤە ڤەشێرت . . . بەلێ لنك مرۆڤێ سەرخوش ، وان هەمی گرانیا سەنگا خو نینەو نا مینت . . .

شەڤێ تاما خۆیا هەی . . . بەلێ هەکو سەرێ وی دگرت . . . تاما شەڤێ ژ رۆژێ تێت . . . گونەهێ توخییێ خوێ هەی . . بەلێ . . هەکو سەرێ وی دگرت . . لنك وی گونەها مەزن ئەوە، ئێك دلێ وی . . یان دلێ ئێکی بهێلت . . مرۆڤێت گونە هکار، گونەهێت وان نا وەرێن . . بەلێ هەکو سەرێ وی دگرت . . خودهەمی مرۆڤا وەردکەت وپێڤە ماچی دکەت .·. کەسێ ژوی ساڤاتر مرۆڤ نابینت.
هەر لەوێ شەڤێ تە دەستێ خولتولمبێرەکێ بلندکر، دا لنك تە راوستت . . پشتی هاژو ب دوسێ ئاخڤتنا قایل بوی . . تولسینگیو کابانیا تە لپشتێ . هاژو تولمبێرا خو . . هوین هەمی دپێلێت بای وەربون . . .

لەزا وی پتر با دئاراند . . تە دڤێت بگەهیە بنەجهێ . . . هاژوێ تولمبێرێ ژی دڤێت بگەهت . . وی ژی دڤێت بگەهت . . .
تە دڤێت لگەل کابانیا خو بگەهیە مال، دا شەڤێ بروناهیا چاڤێت وێ خەجوێ ژ روناهیێ مشت کەی . . . هاژو ژی پێ لەزێ دکەت ود ڤێت بگەهت، دا ژانێت رۆژەکا ئاڤابوی . . بروخ سەمیانا خوڤە ژبیرکەت . . وێ ژی دڤێت بگەهت، دا بونا ڤێ شەڤا تاری لگەل تە فرشك کەت . . وی ژی دڤێت بگەهت! بگەهتە کیڤە؟ تو ژی نزانی کا وی دڤێت بگەهت کیڤە! هاژو ژی نزانت! کابانیا تە ژی وەك وە هەردوکانە!! نێ لئەسمانا، عەڤرا ژی دڤێن بگەهن!

توێ دجیهانەکێدا . . چ جیهانە؟ بگەهیە مالا خۆ . . پتر ڤیانا خۆ بینی . . وئاڤە کێ بناگرێ غەریبیا هەمی عەمرێ خۆ داکەی . . جیهانا تە چۆ توخیب نینن، ژبلی ئەو ئاستەنگێت، ناهێلن تو بگەهیە هەمی ئومێدو هیڤیێت خۆ . . وێ جیهانێ چ ژ تە دڤێت؟ تە چ ژوێ جیهانێ ژی دڤێت؟ وتە گەلەك تشت ژێ دڤێن . . توێ پێتڤی وان هەمی تشتانی . . توێ هەژی وان هەمی تشتانی . . جیهانا کابانیا تە ژی توی . . ئەو چاڤێ تە پێ دبینت، کەسێ پێ نابینت . . شەڤیاتی دناڤ بەرا وەدا یا بیە دیوارەك . . دڤێت پتر نێزیکی تە بیت وچو دیوار نە مینن . . دا چو توخیب دناڤ بەرا گرێ جیهانا وەدا نەمینن! تنێ جیهانەك بمینت! جیهانا هاژوی ژی جیهانەکە . . وەك خۆ نامینت . . لگەل زێدە کرن و کێم کرنا چۆنا تولمبێرێ . .

هەمی توخییێت وێ جیهانێ تێنە گوهورین . . لگەل چۆنا سرۆڤە کی لسینگی، یان لپشتا تولمبێرێ . . جیهانەك دی لنك وی پەیدادکەت . . . ئێك ژیا دی جوداترە . . . جیهانا گەری دەی ژی . . . جیهانا مشەختیێ شەڤێ ژی جیهانە کە . . . وەك جیهانا کەس ژوە نینە . . و ب جیهانا کەس ژوە ژی نادەت و نا گوهۆرت . لنك وی خۆزی سەد خۆزیێت وی . . ونەخشێ وی بچتە سەر هەمی سەرا . تو بەرێ خو بدێ . . ب. سەر جادێ گاڤێت خو دهاڤێت . . ئەو بخوژی نزانت کا دێ چتە کیڤە هوین هەرسێ ژی نزانن کا دێ چتە کیفە! وی نە لبەرە بچتە مال! نا زڤرتە شونا سەرخوشیا خولێ هێڤێن کری! پێ هندەك گاڤێت راهژیای دهاڤێت . . ژوان گاڤا! نزا بو هندە هێدی هێدی دچت؟ نا را وەستت ، ترسا وی ئەوە هەکە ب وی راوەستیانێ سەرێ وی بەردەت . . وخوشی خولهیڤیا وی نەگرت و ئەوو نەخوشی بمینە بتنێ . . یان ژی هەکە لەزێ بکەت و ب عەردەکی بکەڤیت وپتر هشێت وی بهێنە سەری و بزڤریتە جیهانا خو . . گاڤێت وی چەند دگرانن . . دێ بێژی هەر پیێەکێ وی کتەکا ئاشی یا پێڤە . . دڤێت دوو چویچکا ب بەرەکی بکوژت . . وەکی خو بچت و چو ژێ نەچت . . چو ژێ کێم نەبت، ژبلی چەند دلوپە ئاڤا شیلی دبەتلێ بەریکا وی‌دا . . چەند جارەکێ ددەت سەر دەڤێ خو . . پتر پێ بجیهانا خوش دبت . . جیهانا نوکە ئەو تێدا . . وەك جیهانا وە نینە . . تو باوەربکەوی ژی نەڤێت وەك جیهانا وە بت . . وی بخو ئەڤ جیهانە بوخو یا هەلبژاتی . . بەلێ تە بخو جیهانا خو نە هەلبژارتیە . . نێ وی خاترا خو ژ جیهانا وە یا خازتی و گەردانا وێ ئازاکری . . بەرێ وی ل وە نینەو وە نابینت . . باش هوین پێ وی دبینن . .
ئەز دبێژم هوین هەرسێ . . یان ئێك ژوە پێ خوزیا لجیهانا وی رادهێلت . . هەکە ئەو وەك وە بایە . . . وە ئەو نە ددیت . . هەکە وە دیتبایە پێ هوسا نەدبو.
چەند دلوپەکێت ئاڤا شیلی، هەمی جیهان ب پەلەوانێت خوڤە ڤەگوهازتن بو هندەك جیهانێت دی . . دا هەر جیهانەکێ پەلەوانێت خو هەبن . . دا جیهانەکێ توخیبێت خو[illegible] . . هنگی هاژو ب هزرو بیرێت خوڤە چۆبو جیهانەکا دی . . دا هەر چار جیهان لنیڤا جادێ ڤ ئێك بکەڤن . . دا سەرخوشێ مە بیتە کەلەخ و لجیهانا مە بارکەت . . پێ خاتر خازی . . وبو جیهانەکێ . . کەس چو ژێ توخیب و سەرو بەرێت وێ نزانت . . دا هاژو ژی نەگەهتە جیهانا خۆ . . . دا توو کابانیا خۆ ژی ب سەرو بەرێت بەری نوکەڤە . . نەگەهنە جیهانا وە ئاخینك بۆ رادهێلان . . .

١٩٨٧/١١/٢٣
بەغدا

چیرۆك

# سەرچاوە



سەلام مەنمی

۱۹۸۸/۸/۲۸

هەرچونێ بوو، دوکانێکی بچووکی سێ گوشەیی لە سووچێکی شاردا.. دەستکەوب و چەند قالب سابوون و دووسێ دەستە شقارتەو سندوقێ چاو چەند شتی وردەی تری تیادانا.. هەموو بەیانیەکیەکیش سێ پلاستیك تەماتەی گوێ چەمی تانجەرۆی ئەکری‌و لەبەردەمی دوکانەکەیا دای ئەنان. بەڵام ئەوەندە وەڕس و بێزار بوو هەتا کیلۆیە کی ئەفرۆشت سەد ناشکوری

ئەکەوتە گلەیی‌و ئەی‌وت. ( تەمەنی من و ئەمەیان وتووە..؟! بۆ باوکم تری فرۆشتبوو هەتا خۆم تەماتە بفرۆشم!! پێشینیان باشیان وتووە: (مرۆڤ بەگەورەیی فێری پلاو خواردت بێ

دەست بولووتی ئەبات).. بە هەر فەلاکەتێك بوو دووکیلۆ تەماتەی فرۆشت و پشتی بە دوکانەکەیەوە داو لە گومی خەیاڵێکی قوولا ون بوو.. بیری وەك باڵندە فری‌و لەسەر

بەردە نۆیژە کانی سەرچاوەی (داریکەلی)نیشتەوە وتی: (ئەوجاڵاو بووم، شام بە سەپان نەئەزانی دنیاش لا چاتۆڵ بوو، بەراستی‌ی زەمانێکی خۆشبوو کە نۆرە رانم

ئەهات مەڕەکانم بۆ ئێرە ئەهێناو تێروپڕ ئاویان ئە خواردەوە. کە مەڕ رۆش ئەهات هەر لە دوورەوە بریسکەی نقیم و کەمەرەکەی (گوڵەخان) ئەهات و ئەیداڵە ناو چاوم، ئەمەیش

نیشانەی ئەوە بوو منیش شمشاڵە کەم لە قەدم بکە مەوەو فووی پیاکەم و ئەو ناوە پڕ ئاواز بکەم، چونکە هەموو جارێ ئەی‌وت:

ـ سیامەند، دەنگی شمشاڵەکەت زامەکانم تیماری‌ئەکات و وا ئەزانم تازە لە دایك بووم دنیاش موڵکی منە.. کەنزیك بۆوە، ئەت وت مانگەو خەرمانەی داوە، کە بەچاوە کووژکەیەکانی

تیلیان تێ‌ئەگرتم ئەشم ئەنیشتە سەرئارەق و دەمارەکانم لە گریژە نە ئەچوون، هەتا ئەو رۆژەی دام ئەهێڵنە ناو گۆڕی تاریك تیشکی ناو ئەو نقێمەم لە بیرنا چێ. ئاخ خۆزگە ئەو نقێمە ئەخرایە گۆڕەکە یشمەوە.. ئای سەرچاوەی یادگارت زۆرن ولە ژماردن نایەن. . ئەی ئەو رۆژەی گوڵەو هاورێکانی کوڵی مەرەزەیان ئەکێشاو شێخ محمودی نەمریش لەگەڵ سوارەکانیا هاتن و ئاویان خواردەوە.. لە ناکاو گوڵەو هاورێکان گوریسیان خستە نێوقەدی‌و وتیان:

- هەتا پەیمانی سەرو کراسمان نەدەیتێ بەرت نادەین..

ئەویش بەزەردەخەنەیەکی پڕ لە خۆشی‌و پاکێتی‌یەوە پەیمانی دانێ‌و ڕووی کردە گوڵە و وتی.

- گوڵەخات هەقی ئەم پێڵانە لە باوکت ئەکەمەوە..

- من کراسی خۆم مسوگەر کرد.

- پیرۆزتان بێ..

ئەوەی وت و قاچی خستە ناو ئاوەکەوەو وتی: « ئای سەرچاوە چەند خۆشەویستی، داربەڕوو دارەبەن و گوێژو بەلاڵووکی دەوروو ریشت خۆشەویستن.. کە لە هیندستان دیل بووم زۆرم بیر ئەکردی‌و ئەم و ت:- ئەبێ رۆژێ لەرۆژان سەرچاەی داریکەڵی بینمەوە تێر تێر ئاوی لێ بخۆمەوە..؟ هەر خۆم وەڵامی خۆم ئەدایەوەو ئەم وت:- لەخەوا..؟! بۆ لە تاسلوجەو چوارتا دیلی..؟! بەڵام جارێکی تر وە ڵامی خۆم ئەدایەوەو ئەم وت:- بۆنا..؟ بەسەر زیندوو بم ئەی بینمەوە. چەندەهای وەك من لە نیشتمان دوورخراونەتەوەو دواجار رۆژیان لە سەر هەڵهاتووەو کۆسپی رێگەیان تەخت بووە. ئەم وەڵامەیانم راست بوو ئەوەتا نەك هەر تێرم لە ناو سەرچاوەم خواردەوە، بەڵکوو چەندە ها نێچیریشم لە سەر خواردووەو دەیەها کیژی وەك گوڵە گوریسیان تێ ئاڵانووم رۆژیش نی‌یە نەی بینم و ئاوی لێ نە خۆمەوە.. کە هیندییەکان گایەکیان مردار ئەبۆوە، ئەکەوتنە شین و شەپۆڕو سینگ کوتان و واوەیلاو ئەیان وت:- لێمان دوورکەوتەوەو ئیتر چاومان پێی ناکەوێتەوە. میش لەوکاتەدا ئەوەندەی تر دەروونم لە خەفەت و دەرد لیپان لیپ ئەبوو ئەم وت:- ئەوان گایەکیان لێ دوور کەوتۆتەوە وائەکەن، ئەی وەك من لە پیرە مە گروون و بەرانان و سەرچاوەو کاروخ و بێژنگ بەسەر دووربکەوتنایەتەوە چیان ئەکرد..؟! ئەوانیش ناهەقیان نی‌یە وەهەموو گەلێك داب و نەریتی خۆی لا پیرۆزە.. مرۆڤیش بمێنێ بە هەموو ئاواتێکی خۆی دەگات وهەموو تەنگ وچەڵەمەیەکی لە بیر ئەچێتەوە، دوژمنیش کاڵەك بە ئەژنۆ ئەشکێنێ... هەندێ بێ دەنگ بوو، پاشان وتی،

- وا ئەزانم ئاوی سەرچاوەی بارۆبپیش لەگەڵ ئەما یەك ئەگونەوەو یەك ئاون و لە خواردنەوەو ساردی یا جیاوازی یان نی‌یە.. هەرچەند چیاو شیوو دۆڵ و دارستانێکی زۆر لە نێوانیان دا هەن، ئەوەیش بۆ ئاو هیچ نی‌یە.. ئەو ساڵەیش رۆژنامەنووسێك هاتە ئێرەو ئاوی لەسەرچاوە خواردەوەو وتی:

- دنیام زۆر دیوە، ئەو ئاوەی لەم وڵاتەدا دیومە لە هیچ لایەك نەم دیوە.. ئەم سەرچاوەیش جوان رێك کەوتووە، پشتی چیاو دارستانە بەریشی دەشتەو چەندە ها پەڵە کشت وکاڵی لەبەرا کراوە، جگە لەئاسیاوو سوورە چنارزو بی‌و دارەڕەش...

هەستاو سواری ماینە ڕەش بوو. هەرقاچی خستە ناو ئاوزەنگی ئاسکی بان مەقان بەخۆیا هات و بەزەوییەوە بەن نەئەبوو، لەسەر چوار پەلە سپی‌یەکی سەمای ئەکرد، شێخیش دەستی رانك و وچۆخەی خورمایی لەبەرا بوو. خەنجەرە سپی‌یەکەی بە قەدەوە بوو مشکی‌یەکی ڕەشی ریشوو هەڵبەستراوی بەستبوو. سوارە کانیش دوای کەوتن و کەروێشکێکی سەربڕاو بەپاشکۆی سوارێ کیانەوە هەڵواسرابوو. تانجی‌یە کانیش لە پێش سوارەکانە وە هەڵئەبەزینەوە. بەڵام داخەکەم ئێستا سەرچاوە بێنازەو لە دەنگی شمشاڵ و جامی مەڕدوش و تەپەی سێپێی‌و بارەی بەرخی کوڕی کاری هەمس و مەڕی چارو بزنی بەلەپۆش و حیلەی ئەسپی شێو بۆرەی مانگای تاڵە دوورەو ئاوەکەیشی بەیەك جێگەدا قووڵی ئەڕوات و ئەماڵ دێراوو دێروغەو تیروگوڵ و قوڵاخەو بەرەنێرەو ماکاوو قەتار ناناسێ‌و پەیوەندی لەگەڵیان بچڕاوەو کەس نازانێ بۆ کوێ ئەچێت، ئەوەێ ئێستا ئاشنایەتی قرەی بۆق و قەلەرەش و فیشکەی مارو لوورەی گورگ و چەقەڵ و دەنگی کونەپەبووەوە.. تۆبڵێی لەم دوکانە [illegible]ەدا بمرم و سەرچاوە ئاشنایەتیم لەگەڵ نەگرێتەوەوە گ[illegible]م لە خورەی نەبێتەوە وتێکلاو بە دەنگی هەنگ و شمشاڵ [illegible]ە.. بۆنا..؟ ئەی ئەو دوو سەرچاوەیە هەزارەها دارو دەوەن و تاوێرو چیاو شیوو دۆڵ لەنێوانیانا هەن بۆچی بەیەك گەیشتن..؟ خۆ شێخی نەمر لە گۆترە ئەو قسەیە ناکات و. قسەکانی نەخشی بەردن: (مرۆڤ بمێنێ بەهەموو ئاواتێکی خۆی ئەگات و هەموو تەنگەو چەڵەمەیەکیشی لەبیر ئەچێتەوە.) دەنگی خاڵە کیلۆی تەماتە بە چەنی پیرێژنێك... تەونی خەیاڵە خۆشەی تاڵکێش کردو لە سەرچاوەو شێخ وداریکەڵی دوور خستەوەو بڕیاری دا لەمەولا چەندباوکی ترێ فرۆشتبوو، ئەمیش ئەوەندە تەماتە بفرۆشێ...

چیرۆك

# گوڵەو برایمۆك

محمد رشید فتاح

گوله . نەوە نەژیان تۆراویت؟ . جاتۆ لەژیان بتۆریت، زەوی لە ئاسمان و، منداڵی بەرمەمکانەش لە شیری دایکی دەتۆریت!!.

توو ئەو سیپالەیان وتووە، دەفری دەباسروشتە رازاوەکەی ئەم نێوە لەداخایەخەی خۆی دائەدرێت.

وتمان: چاوەکانت رەش رەشی قەترانین، وتمان کەزییەکانت رەش رەشی قەترانین، بەلام نەمان وت: بە خوشاردنەوەی تۆ. پەلکە زێرینە بەم کەژوکێوەوە. فرسەت بینی و، بەوجورە جوانیی خۆی بنوێنی. گوڵە.. ئەوە لەچیی دەروانیت، پارخوازی مەلە سەرلێشێواوەکەی خەیاڵت لە چ هێلانەیەکدا ئارام بگرێت. بە کێوەکەی پێش دەمی ئاوایەکەوە، یا بە کانییەکەی بەرماڵانەوە.

خۆ ئەوەتا ئێستە [illegible]ەکەی کانیی بەرماڵان دەنگی لێ هەڵبریوەو، بانگی تۆ دەکات. گوایە دەنگی نابیستی؟..

ئەوە دەنگی عاشقە سەوداسەرەکەی تۆیە، بۆیە لە تاوتو شەووڕۆژ هەر نالەو هاواریەتی. هاکا برایمۆك ـ یش لەتەك [illegible]ی خوردا، هاتەوە سەرکانییەکەو، لە ژوانێکی دیدا، بەیەکدی شادبوونەوە. خۆیەکەم بینیشتان هەر بە بەرچاوی ئاوە سازگارەکەی کانییەکەوە بوو!.

گوڵە.. لەبیرتە ئەو ئێوارەیە تۆ نەبوویتە ئەوشەنگە بیرییەی کە داروبەردی دەوروبەرەکەشت دزە نیگای خۆیانت تێگرن. بەڵکو تەنیا میوانی ئازیزی سەرکانییەکەی بەرماڵان بوویت و، دوو بە دوو، دوور لەچاوی بەدکار کەوتبوونە دەست بازی، کەتۆ پەنجە ناسکەکانت بەسەرو قژی ئاوەکەدا دەهێناو، شانەت دەکرد، ئەو لە خۆشیاندا دەتریقایەوەو، لەناخەوە دەهەژاو، قەستی بوو لە ئامێزت بنێ. هەردوولاتان حەزتان بەوەبوو، تا درەنگانێ هەروا بمێننەوە. خۆ ئەو دەمە گەر برایمۆك ـ نەهاتایە، ئەوا دەمی یەکدیتان دەمژی. جا چیتر لە مژینی دەمی ئاوە شیرینەکەی کانییەکی بەرماڵان خۆشترە؟!.. ئەی چیتر لە مژینی لێوە ئاڵ و تەڕو پاراوەگەی گوڵەکەی نێو ئاوایی بەتامترە؟!.

کەتۆ ئاورێکی پڕ لە عیشوەو نازت دایەوە، برایمۆك بەجەستە شەکەت و ماندووەکەیەوە لە نزیکتەوە وەستابوو. بەرلەوەی تۆ بژاکێیت و، بسڵەمێتەوە، چاوەکانت لە چاوەکانی گیرکرد. تۆ نەت توانی لەوە زێتر ڕوانینە بێئارامییەکەی ئەو بقۆزیتەوە. بۆیە سەرت داخست و، سووکە شەرمێك شڵەژاندیتی و، بەخوکەوتی. خێرا گۆزەکەت پڕکردو، ناتە سەرشانت و، لەژێر لێوەوە خواحافیز بوونییەکت لە کانییەکە کردو، کانییەکەش بەوپەڕی دڵتەنگییەوە بەرێی کردی.

هێشتا چەند هەنگاوێکت نەنابوو. برایمۆك ـ دەنگی دای.

ـ ئەوەکچە جوان، بۆوا زوو کانییەکەت جێهێشت؟..

ـ ئاخر براله واشەو داهات.. گەرزوو نەچمە وەتاوێکی دی لە دووم دەگەڕێن.

گوڵە. . کەوتەوە هەنگاونان و، پێی نازی نایەوە بەسەر زەوییەکەی ژێر پێیدا.
- کچی جوان ئەو قسەیەم بۆیە کرد، چونکە دەزانم تۆش وەکو من ئەم کانییەت خۆش دەوێت! .
جارێکی دی سەرنجەکانی گوڵە بە بەژن و بالاو، سەرو سیمای برایمۆك ـ ەوە، گیرسایەوە.
- براڵە تۆ کێیت؟ .

- گوڵە. . نامناسی؟ . من برایمۆك ـ م و، عاشقی ئەم سەرچاوەیەم و، ماوەیەکە شەوانە بەدیارییەوە ئێشك دەگرم.
- بۆ ئێشکی لێدەگریت؟ .
- ئەی گوایە ئەوەت نەبیستووە، ئاوی ئەم کانییە بەدەمی سەگ و گورگ پیس دەبێ و، ئەمجا کوێر دەبێتەوەو، وشك دەکات. تۆحەزبەوە دەکەیت جارێکی دی وێنەی نەشمیلەی خۆت لە ئاوی ئەم کانییەدا نەبینیتەوە!! .
- نەء. . براڵە. . نەء. . هەرگیز حەزبەوە ناکەم.
گوڵە بە سەرسامییەوە ئەمەی وت. . لەنێوان بڕواپێکردن و، گومانیشدا دۆش داما. تیامابوو، پێهەڵگرێت و بەرەو ماڵەوە بێتەوە، یا هەروا بمێنێتەوەو، تاریکیش بە ئارەزووی خۆی بەسەریا دابیارێت.
«- تۆبڵێی ئەم کورە لاوە بەڕاستیبێ، یا بۆمانەوەی من وا دەڵێت، خۆگەروابێ ئەوا منیش دەدەمە کێو. گوایە هەروا بەسانایی ئەم ئاوە چاو قرژاڵییە کوێر دەبێت و، ئاوی دەسڕێتەوە! . . ئەم کانیلە نازدارەی کەوا دەرامەتی هەموانی لەسەرە بە دەمی سەگ و گورگ تەرایی لێدەبڕێ. . نا. . تەخێر شتی وا مەحاڵەو، ئەم کورە هەر لەخۆیەوە قسان دەکات، جاخۆ خەڵکی ئەم نێوەش نییە تاوەکو ئیمە دڵ ودەروونی کانیلەی بەرماڵان بناسێ. ».
- براڵە. . تۆهەستت بەوە کردووە کە سەگ و گورگ دێنە سەر ئەم کانییە؟! .
- بەڵێ. . هاکا ڕۆژێك لە ڕۆژان. . لەناکاو پەیدابوون و، دەمیان تێژەندو، پیسیان کرد. . گوایە جارێك لەجاران ئاوەکە ئەوەی بەگوێی تۆشدا نەچپاندووە؟! .
- دەشێ وابێ. . دەشێ واشی بەمن وتبێ.
- گوڵەخان. . ئەوانەی بەڕاستی عاشقی ئاوی ئەم کانییە نەبن. . لەدەنگ و سەدای ئەو تێناگەن.
- قسەکە. . براڵە قسەکە. . بەڕاستی دەنگی ئاوەکەی ئە
کانییە لە هەموو دەنگێك دڵگیرترە! .
گوڵە. . هەستی بەوە کرد، سەرنجە تیژەکانی برایمۆك وردە، وردە، دەچنە نێوخوێن و دەمارەکانییەوەو، ئەوەتا دڵە نەسرەوتەکەی لەتاوا ئۆقرەی لێهەڵگیراوەو، خواستێتی لە قەفەزەی سنگییەوە بێتەدەرەو، تاوێکی دی وای لێبکات.
کە بەبرایمۆك. . بڵێ توخوا بەسەر دڵم بەبەرییەوە نەما.
منیش هەمان هەست ونەستی تۆ لە خۆی گرتووم و، دڵم پێتەوەیە! .
بۆیە لەوە زێتر خۆی نەگرت. . سەری داخست و، بەشەرمەوە ڕوویکردە برایمۆك.
- جارێ بەخوات دەسپێرم.
- خوات لەگەڵ گوڵەکەم.
«- ئەوە خۆ وتی. . گوڵەکەم. ئەوە خۆ وای وت. »
لەتەك هەر هەنگاوێکیدا ئەمەی دەوت و، زەردەخەنەشی بەسەر هەموو شتێکدا دەبەخشییەوە.

●●●

گوڵە ـ قسەی برایمۆك بوو، خۆت وتەنی برایمۆکی فریشتە، ئەی ئەوانەی کە عاشقی کانییەکەن فریشتەنین؟ .
ئەوانەشی کە باوەڕیان وا نییە، بەلای تۆوە شەیتانن. کەواتە ململانییەکە لەنێوان فریشتەو شەیتاندایە! . .
شەیتانیش تا سەر نەیتوانیوە پشتی فریشتەکان لە زەوی بدات! . . ئەو ئێوارەیەی کە تۆ برایمۆک[illegible] جێهێشت هێندەی نەبرد، سەگ وەڕو، لوورەلووری گورگ لەهەموو لایەکەوە سەریهەڵدا. تۆ تاکە کەسێك بوویت لەنێو ئاوایەکەدا هەستت بە مەترسییەکی گەورەوگران کرد، بۆیە [illegible]گرتیتییە خۆییو، دنیات لەپێش چاو تاریك بوو، دڵت لەلای ئاوی کانییەکەو، برایمۆکیش بوو. ئێستە چیی دەکەیت؟ . . بەو خەڵکە دەڵێی: ـ فریاکەون، سەروماڵی ئێوە، هەمووشتێکی ئێوە، بەندە بەبوونی ئاوی کانییەکەی بەرماڵانەوە، دەتا زۆوە بە هانایەوە بچن و، فریایکەون. . تا کوێر نەبووەو، وشك هەڵنەهاتووە، واخەریکە سەگ و گورگ دەمی تێدەخەن و. پیسی دەکەن، خەڵکینە ئێوە دەزانن، بەوە کانییەکەمان لە کیس دەچێو، لەمەولا بەهارانیش ناتەقێتەوەو، نابێتەوە بەو سەرچاوە سازگارو ڕوونەی، کە دارودەوەن و، گوڵ وگیای ئەم نێوەش

گۆرانیی بۆبڵێن.

ئەی ئێمــە هەمیشــە لە دەوری ناگــەڕێین، خۆ گەر ساڵێـك وەکو پێویست نەتەقی بێتەوە، قوربانیمان بۆ نەکردووە! کەواتە بە وشــك بوونــی ئەو، بە کوێــرەوەبــوونــی ئەو، ئێــمــەش کوێـردەبین و، ڕوونـاکی ژیـانمـان نامێنێ، لەکوێ کانیلەیەکی دیمان چەشنی ئەم کانیلەیە دەستگیر دەبێت؟. لەکوێ دایکێکی بەرەحمی وامان چنگ دەکەوێت؟. جا وا واشم پێوتن. دڵنیام کەس باوەڕم پێنـاکـات، ئەی لێم ناپرسن: کێ ئەم قســەیەی خستــوتــە سەردەمت، گوڵـە ئەمــەی تۆ دەیڵێیت.. جگـە لە خەون و خەیـاڵ هیچی دی نییــە. ئێمــە تا ئێمــرۆ نەمــان بیستــووە، ئاوێــك لێ بڕوات، بەدەمی سەگ و گورگ پیس بێ!!.. ئەی گەر پێیــان بڵێــم: ـ من ئەوەم لەدەمی ئاشقــە ڕووتــەیــەکی وەك برایمــۆکــەوە بیستــووە. ئەوجـا ئەوان چ دەڵێن؟.. ناڵێن.. گوڵـەکـە قسـەی ئاشقان لە خەون و خەیاڵ بەدەرنییە، برۆ تۆ ئاشقی برایمــۆکیو، ئێــوە لە زمـانی حاڵی یەکـدی تێدەگـەن!. لە وتـەی ئەم گونـدە، گونـدە، هەزاران درندەو، دەعباو، جروجانەوەر، دەمیان ناوەتە نێو دەمی کانیلەی بەرمالانەوە، کەچی تا ئێستە هەر سەربەرزەو، بەفیزو نازەکەی خۆیەوە، ئاوازە دێرینەکەی خۆی دەچڕێ!.

تا شەو درەنگتر دەبوو، لوورەلوورو، وەڕە وەڕ هەر ڕوو لە زیـادیبــوو، بەلای خەڵکـە بێدارەکـەی نێـو ئاواییـەکـەوە، لە مانگـەشـەودا، ئەم دەنـگ و نەنـایـە، گەلێ ئاسایی بوو. بەڵام بەلای گوڵـەوە، لەوە زێتــری دەگــەیـاند، ئەویش ئەوە بوو، کە سەگ و گورگ بە کانێیــە دەوەڕن.. نەك بە مانگــیشــەوە خامۆشەکە. بۆیە سەرنجەکانی بە ئالۆزییەوە ڕایەڵ کردبوو.. ئاگــاشی لە دەوروبـ[illegible]کــەی نەمــابــوو، باوکیو، دایکیو، خوشـك و براکـانی، [illegible]ناتی خۆیـانـدا شەکـەتی ڕۆژانـەکاری نێــومــەزراکــان، لەنێــو پێخــەفی خزانـدبــوون، کەچی ئەم هەرمایەوەو، لەتەك بەرێکردنی شەوگاردا، ئێشکی دەگرت!!.

● ● ●

گوڵــەکــە.. دەهــەستــە، وەك نێـوارانی دی، دەست بدەرە گۆزەکەو، بەرەو کانییەکە بەرەوە، ئەوە لێیە لەتاو دووریی تۆ دەنگی نووساوە. ئەمە سێ ڕۆژە چاوەکانت بە چاوە گەشەکانی ئەو ڕۆشن نەبۆتەوە. گوایە دەتەوێ هەروا بمێنێتەوە. جارێکی دی لەتەك شەپۆلە وردەکانیشیدا گەمەو دەست بازی نەکەیت.

برایمــۆك.. بەڕاستــی دڵســۆزی خۆی بۆ کانییەکە دەرخست. وەفــاو ئەمــەکــداری خۆی بۆ ئەو خەڵکــەش پیشــان دا.. سەلمـانـدی کە ئاشقێکی سەوداسـەری کانییـەکـە بوو.. ئەی عیشق لە خۆبوردن و، سەرسەختی ناوێت؟.

هەر لەم ڕۆژانــەدا نەبـوو، تۆو دەستــە خوشکــەکـانت چوونــە سەرکـانییـەکە. چیتان بینی؟. لاشە ساردوسرەکەی برایمۆکت نەبینی، لە دەمی کانییەکە کەوتبوو. خوێنە گەش و ئاڵەکەشی تێکەڵ بە ئاوە ڕوونەکە ببوو، بە جەستە خوێناوی یەکەشییەوە جێ قەپاڵی سەگ و گورگ نەدەبینرا؟.

هێندەی نەمابوو لەهۆش خۆت بچیت، بەدیار برایمۆکەوە، دەستــەو ئەژنـۆ هەڵکـورمـایت و، بێئـاگـا کەوتیتە خۆ ڕنینەوە. دەستــە خوشکــەکـەت زوو هەستیـان بەوە کرد، کەتـۆ بۆ لەن نێوچوونێ دڵبەرێکی ئازیز ئەم شین و ڕۆڕۆیە دەکەیت.. بەڵام کەسیان پرسیاری ئەوەی نەکرد..

ـ توخوا گوڵ.. ئەم لاوە کێیە؟..

دوواجــار هەرنـاسیشیــان. کە ئەمـە برایمـۆکەو، ئاشقی ئەم کانییــە بوو. ئەی دوای شاردنـەوەی لاشـەکـەی ئەو، لێیـان نەپرسیت:ـ گوڵە.. ڕاستمان پێبڵێ.. برایمۆك ئاشقی تۆش نەبوو؟!.

تۆ بۆ یەکەمجار پرکێشی ئەوەت کرد.. کە پێیان بڵێی:ـ با.. ئەوکەســەی کە ئاشقی ڕاستـەقینەی کانییەکە بێ.. ئەوا ئاشقی منیشــە. گوڵـە دڵی دابـوو. بە مرۆیـەکی ئازاوو لە خۆ بوردووی وەکــو برایمــۆك.. چونکــە ئەو بە دڵ و بە گیــان کانییەکەی لە دەمی پیس دەپاراست. ئایی لە برایمۆك چ جۆرە ئاشقێك بووا!.

دەهـەستـە گوڵـە.. هیـچ نەبێ بچـۆرەوە دیدەنی گۆڕەکەی برایمۆك.. خەڵکەکە لەسەر خواستی تۆ، لە نزیکی کانییەکەوە ئەویان لە گۆڕ نەنا.. بەڵێ خەڵکەکە ئەوەیان کرد، بەڵام خۆ تا ئێستـەش زۆربـەی هەرە زۆریـان نەهاتوونەتە سەر بیروڕاکەی برایمــۆك و، قســەکـانی هەر بەخـەون و خەیـاڵێکی نەزۆکـانـە دەزانن و، بە لاشیـانـەوە وایـە هەرگیـزاو هەرگیـز ئاوی کانیی بەرمالان بە دەمی سەگ و گورگ پیس نابێ. ئەی بۆ برایمۆك ئەو شەوە ئەو سەگانەی تۆپاند؟!.

دەهـەستـە گوڵـەکە، گۆزەکە دەست بەرێ، وا هەرزەکارانی نێـو ئاواییش تابلۆکـەیـان نەخشاندەوەو، چاوەچاوی دەرکەوتنی

روخساری تون. قەت چپەچپیانت بەرگوێ نەکەوتووتە؟. بێگومان هەزار جاریش، جا چ گوێیەك لە گوێی کیژۆڵەیەکی وەکو تۆ سووکترە؟. لە هەنگاوناوندا گوێت لە خشەی مارومێرووشە. ئاسك ئاساش لە سێبەرەکەی خۆشت سڵ دەکەیت.

هەرزەکاران چ دەڵێن:ـ ناڵێن.. گوڵەخان.. دەسەرێك هەڵبرەو، تەنها خەندەیەکمان تێگرە.. خۆ تۆ یەکێکی و ئێمەش دەیان مرۆی دڵ سوتاو. گوڵەخان ئێمە خاکی بەرپێتین، لەسەر پەنجەیەکی تۆ ملی خۆمان دەشکێنین، دە تیری نازت دەرکەو. ـی یەکێکمان بپێکە.. خۆ هەر دەبێت رۆژێك لە رۆژان ببێتە هاوسەری مرۆیەکی دڵبراوی ئەم گوندە!.

هێندەی ـ ـ ـ، تا دەهات تاریکی رەشتر دەینواند. ئەوشەوە بانگ سەفەری کردبوو، بۆیە خەمێکی ساوا بە روخساری منداڵانیشەوە چۆکی دادابوو.

لەناکاو.. سەگ وەڕو، لوورەلوور دەستی پێکردەوە، دەنگی زوڵاڵی ئاوی کانییەکە کەوتەوە بەرگوێی گوڵە.

ـ خۆ ئەوە ئاوەکە.. پڕ بەخۆی هاواردەکات.. ئاشقانی من فریام کەوت. تا گیانم تێداماوە. توبڵێی خەڵکەکە ئێستە باوەڕ بەوە بکەن. کە سەگ تەنها بە مانگەشەو نازەڕێت..».

حیرا.. کەوتیتە خۆت. رانك وچۆغەکەی باوکت کردە بەر و. گۆچانەکەشت دەست دایەو. کەوتیتە نێو ئاواییەکە.

دەنگی خەڵکەکەت دا.. زۆری نەبرد هەرزەکارانی نێو ئاوایی بەدەنگتەوە هاتن و. بە دووتەوە بەرەو کانییەکە بوونەوە..

ئەوانەی کە گاڵتەیان بە قسەکانت دەکرد.. ئەوانە بوون.. کە دەیان وت:ـ قسەی ئاشقان خەون و خەیاڵەو، متمانەی بێناکرێت.. ئاوی کانییەکەش بەدەمی سەگ و گورگ پیس نابێ! ئەوانەشی کە لەتەکتا بوون. ئەیان دەوت.

ئەوەی بە کەسانی ئاشق دەکرێت. بە کەسانی دی ناکرێت. تا ئێمە مابین. هەریەکەمان برایموکێکەو. نایەڵین سەگ و گورگ دەست بنێنە بەرینی کانیەی بەرماڵان.

بیری ئەم چیرۆکە لە ئەفسانەیەکی کوردییەوە وەرگیراوە.

## چیرۆك

# سەربازێکی نەبەرد



رەسووڵ کەریم

کاك(سالار).. سەربازی دلێر، ئەوکاتە سەرۆکی خۆشەویست (کاکە صدام حسین) نیشانەی ئازایەتی (نوط الشجاعە)ی کرد بە بەرۆکیدا.. لە خۆشی دا دڵە بەتینەکەی وەکو چۆلەکە دەفڕی. هەموو جیهان لە بەر چاوی رەنگاو رەنگ بوو. ناهەقی نییە ئەگەر لە بەختیاریش دا هەڵ پەڕێت و، گۆرانی بڵێت: چونکە سەرۆکی بەڕێز و خۆشەویست، شایەتی بۆ داوە کە سەربازێکی ئازاو نەبەردە.. بە بۆنەی ئەو ئازایەتی بێ هاوتایەی کە نواندوویەتی چۆن؟!.. سەربازێکی برینداری عێراقی لە دەست دوو سەربازی ئێرانیی دوژمن ڕزگار کردووە!.. کە دەیان ویست بە دیل بی گرن. ئەمیش وەکو شێر و پڵنگ پێش ئەوەی بی هێڵێ ئەوان دەست بکەنەوە، پەلاماری دان.. هەردووکیانی بە دۆزەخ سپاردو، هاوڕێ سەربازەکەی گەیاندەوە نۆردوگا!.. تیماریان کردو لە سایەی خواوە چاك بۆوە.

سالاری سەرباز هەر کە (نیشانەی ئازایەتی)یەکەی بە بەرۆکی خۆیەوە دەبینی لە خۆشیدا گەز گەز باڵای دەکرد. هەمیشە ئەو دیمەنە دڵ فڕێنەی لە بەرچاو بوو کە سەرۆکی قارەمان، ئەوکاتەی نیشانەکەی بە دەستەوە بوو. لەبەردەمی ئەم دا وەستا.. ئەمیش بە جورێکی وا دورجو دوڵ نە سەلامێکی سەربازانەی بۆکرد.. زەوییەکە لە ژێر پێیدا لەرییەوە! ئەمجا سەرۆك ئەملاو ئەولای ماچ کردو، بەشانازییەوە نیشانەکەی بە بەرۆکی دا کرد.

ئالەو کاتە پڕ لە کامەرانی یەی دا هەست و سۆزی خۆشەویستی بەرامبەر سەرۆکی ئازیز (صدام حسین) وەکو لافاو بە تین و تەوژم بوو!... نە خۆشەویستی دایك و باوك، نە کوڕ و نە خوشك و برا هەرگیز نە

دەگەیشتنە ئاستی ئەو خۆشەویستی‌یە. ئالەو کاتە دا کە سەیری بالای بە شانو شکۆی سەرۆکی دەکرد.. لە دلی خۆیدا دەی‌وت: «بە بۆنەی سەرۆکی خۆشەویستمانەوە عێراق دەگاتە ئەوپەری سەربەرزی‌و پێشکەوتن.» کاك سالار لە ناوجەرگەی شەرو جەنگیش دا (نیشانەی ئازایەتی)یەکەی هەر پێ‌بوو.. هەمیشە ئەو نیشانەیە هانی دەدا بۆ ئەوەی ئازاتر بێت. وای دادەنا هەمیشە سەرۆك سەرنج لە قارەمانی‌یەکەی دەدات!.. بۆیە لە هەلمەت بردن و، دەست کردنەوەدا هەورە برووسکەیێك بوو بۆ خۆی! هەرگیز لە مردن سلی نەدەکردەوە. سەربەستی نیشتمانەکەی زۆر لەلا گرنگتر بوو لە ژیانی خۆی کە برینداریش کرا هەر بەبۆنەی دلێری‌و چاوقایمی‌یەکەیەوەبوو.

لەیەکێ لە جەنگەکان دا، کاك سالاری سەرباز لەگەل چەند هاورێیێکی دا - کەئەم لە پێشیانەوە بوو - لە پەلامار دانێکی کوتوپڕدا.. هەلمەتیان بۆسەر سەنگەرێکی سەختی دوژمن برد. سەربازەکانی دوژمن سەریان لێ شێواو، کەوتنە هاوار هاوار. لەماوەیێکی کەم دا ئەو ئێرانی‌یە دوژمنانە قەلاچۆکران.. پێش ئەوەی ئاوەلە کانیان بە فریایان بکەون. کاك(سالار)کە گەڕایەوە بۆ سەنگەرەکەی خۆیان، بۆی دەرکەوت لە سەنگەرەکەی دوژمن دا نیشانەی ئازایەتی‌یەکەی لێ کەوتووە. بێ سلەمینەوە یەکسەر بڕیاری دا دووبارە بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەنگەرە بۆ ئەوەی (نیشانەکە)بهێنێتە وە.

هەرچەند هاوەلەکانی ویستیان پەشیمانی بکەنەوە چونکە مەترسی یێکی زۆر لەو گەڕانەوەیەدا هەبوو. بەلام سوور بوو لە سەر بڕیاری خۆی. ڕووی تێ‌کردن وتی: بۆ من شوورەیی‌یە ئەو نیشانەیەم لێ ون بێت، کە سەرۆکی ئازیزمان - کاکە صدام - پێی بە خشیوم. کەواتە من مافی هەلگرتنی ئەو نیشانەیەم نی‌یە!

بەگور جو گۆلی‌و هەلمەتی وەك پلنگی‌یەوە گەڕایەوە بۆسەنگەری دوژمنە کوژراوە کان و، نیشانەکەی هەل گرتەوە.. بەلام لە گەڕانەوەی‌دا بۆ سەنگەرەکەی خۆیان، ئەپەندەی نەزانی لە دواوە گوللەیێك بە شانی ئەو دەستەی دا چزا، کەهێشتا نیشانەی ئازایەتی‌یەکە لە قولی مستی دا بوو. (سەربازەکە)گلاو دوو [illegible]ەرمەو قولاتی دا. ئەو چەکەی پێی بوو.. پەڕی. لەگەل ئەوەش [illegible]شانەکەی بەتوند گرتبوو، هەر لێی نەکەوت. بە بریندار‌ی پەلاماری [illegible]اکەی دایەوەو، ئازایانە هەرچۆنێك بوو بە دەم شەڕکردنەوەو، هەلستان کەوتن وتلاو تل کردنەوەوە خۆی گەیاندەوە سەنگەرەکەیان.

هەموو هاورێیەکانی هەر لە دوورەوە بەرەو پیری هاتن و، دەستیان کرد بە تیمار کردنی.

نیشانەی ئازایەتی‌یەکەیشیان لە قولی مستی دا دەرهێناو، کردیانەوە بە بەرۆکی‌دا.

ئەمجا هەموویان لە بەردەمی‌دا وەستان و، بۆ دلێری‌یەکەی کەوتنە سەلام کردن

■ چیرۆك

# بیرەوەرییەك

* عالیة عبدالکریم *

لە ژوورەکەیا دانیشتبوو، بێ‌حەواسی‌و بێ‌تاقەتی ئارامی لێ هەلگرتبوو، جێگەی بە خۆی‌نەئەگرت. ماتەمی پەردەی ڕەشی بەسەر دل و دەروونیا کێشابوو. ئۆقرەی لێ‌هەلگیرابوو. هەر ئەهات و ئەچوو بە ژوورە ڕەق و تەقەکەیا، کە لە دەنگی سیسرك بەولاوە هیچ دەنگێکی‌تری تیا نەئەبیست، ئەویشی بەجۆرێ ئەهاتە گوێ کە لە دەنگی مۆسیقای ماتەمینی‌و خواحافیزی لە لاوانی جوانەمەرگ و بێ‌تاوانانی ئەکرد لەگەل لاواندنەوەو پیاهەلدانی دایك و خوشك و خۆشەویستی بەجێ‌ماوی‌و لەگەل ئاوات و ئامانجی نەهاتووەدی‌یان.. ئای ئای چ هەلوێستێکی جەرگ بڕو بەئازارە؟!

وای هەست ئەکرد وردە وردە ژوورەکەی دێتەوە یەك!.
بەلێ ژوورەکەی لێ بووبووە گۆڕێکی تەنگ و تارو قوول و دیوارەکانیشی لێ بووبوونە مەلائیکەکانی گۆڕەوشارو خۆیشی وەك گۆهبارێکی تازە مردوو دەهاتە بەرچاو کە گۆڕهەلکەن و هەلکەن و کەس وکار جێیان هێشتبێ‌و گۆڕەوشار بدرێ‌و پەراسووی ڕاست و چەپی بەیەکابچێ!.

ئای ئای! خۆ ئەلێن مرۆڤ تەنها یەك جار ئەمرێ کەچی مرۆڤی ئەم چەرخە ڕۆژی سەدان جار ئەمرێ‌و زیندوو ئەبێتەوەو گۆڕەوشار ئەدرێ‌و شیری بەری دایکی هەلئەهێنێتەوە؟.. ئا ئەمەیە یاسای سەدەی بیستەم؟!.

سەعات بوو بە شەشی ئێوارەو تا ئەهات زیاتر بەرچاوی تاریك ئەبوو، ئەگەرچی هێشتا بەتەواوی شەو دانەهاتبوو.

هات بەبیریا بەرەو کتێبخانەکەی بڕوا بەونیازەی لەناو کتێبەکانیا کتێبێ هەلبژێرێت کە تۆزێ دلی پێ بکرێتەوە،

جونکە ئەیزانی خوێندنەوەی کتێب بۆ مرۆڤ بەتایبەتی لەم کاتە
ـخۆشانەدا باشترین هاورێیەکە پشتی پێ ببەسترێو تارادەیێ
ـەری گرانـی سەردڵ سووك بکـات. ئیـتـر بێ سێودوو
ـرووی کردە کتێبخانەکەیو پاش چەند جار هات وچۆ بەبەردەمیا
ـدەستی درێـژ کرد بۆ کتێبـەکـانیو ناونیشانی کتێبەکانی یەکەیەکە
ئەخـوێنـدەوەو بە دوو دڵییـەوە هەڵیئـەگـرت و دایئـەنـایـەوە
ئەگەرچی باوەڕیشی هەبوو بە کتێبەکان و ناوەڕۆکی کتێبەکانی.
بۆیـە ئەمـجـارە بڕیـاریدا هەر کتـێبێکی بەدەستـەوە هات
هەڵیبگرێو دەست بکات بە خوێندنەوەی.

دیسـانـەوە وردە وردە دەستیکـردەوە بە هات وچۆ بە بەردەم
کتێبخـانــەکــەیــاو چاوی بڕیـوە کتێبـەکـان ئەگـەرچی دڵی
ئەلایـەکیتـر بوو. لەوکـاتـەدا چەنـد کتێـبێـك لەعـاستی دەستی
ترازان و بەرێکەوت دەستی کەوتە سەر دەفتەرێك و دەریهێناو
تەماشایکرد دەفتەری بیرەوەرییەکانی‌یەتی.

هەر لەگەڵ چاوپێ‌ئەوتنیا تاسەیێك بە تەوقی سەریا هات و
لە کەلـەئـەنگـوسـی پێیـەوە دەرچوو، لەگەڵ زیندووبوونەوەی
دەیـان بیـرەوەریـی ڕابـووردوو لە خۆش و ناخـۆش. بەرەو
جێگـاکـەی گەڕایەوەو بێدەنگ لەسەرخۆی ڕاکشاو سەرینەکەی
خـسـتـە پشتی‌یـەوەو، دەستیکـرد بە هەڵـدانـەوەی پەڕە پەڕەی
دەفتـەرەکـەو. هەر بیـرەوەرییەك کە لە لاپەڕەیەکدا نووسرابوو
ئەیخـسـتـە ناو قووڵایی دەریـای خەیـاڵ و ڕۆژانی ڕابـووردوو و
یادکردنەوەی ئەو کاتانەی کە لەگەڵ ئەو برادەرانەیا دانیشتبوو.
تەنـانـەت وشـە وشەی قسەکانیان و قسەکانی ئەهاتەوە بیرو ناوە
ناوە لە ناخـەوە هەنـاسـەیـێکی قووڵی هەڵئـەکێشـا. بەدەم
هەڵـدانـەوەی پەڕەی دەفتـەری بیـرەوەرییـەکـەیو لەگـەڵ
هەڵـدانـەوەی هەر پەڕەیێـك لە دەفتـەرەکـەی لاپـەڕەیەکیشی لە
دەفتـەری تێپـەڕبـوونی مێـژووی ژیـانیو یادەکـانی خۆیشی
هەڵئـەدایـەوە. بۆیـە دەیـان یادو ئاوات و ئامانجی نەهاتووەدیی
کەوتـەوە یادو برینی کۆن و نوێی هاتـەوەسـۆ. هەتـا بەدەم
ماسـۆرو خەیـاڵەوە کەوتە سەر خوێندنەوەی بیرەوەریی هاوڕێی
برادەری کە ئەمەی خوارەوەی تیا نووسیبوو:ـ

برای ئازیزم نەریمان! خۆشیو سەرکەوتنتم ئاواتەو ئەم چەند
دێرەت بۆ ئەنووسم؛ چونکە بڕوا ناکەم ئیتر جارێکیتر
بمبینیتەوە:ـ

برا خۆشەویستەکەم! نیشتمانەکەت لە بەرچاو بێو هەرگیز لە
یادی نەکـەیت و نەیگـۆڕیتـەوە بە ماڵی دنیـا. یارمـەتیدەری
گەلـەکـەت بەو دڵـسـۆز بە بۆ هەمـوو مرۆڤ. ئیتـر خۆشیت.
هاوڕێت (هاوڕێ). (١٩٨٢).

نەریمـــان بە خوێنـدنـەوەی ئەم چەنـد دێـڕەی دەستنـووسی
هاوڕێی برادەری مووچـڕکـەیێـك هات بەلـەشیـاو بۆ ماوەیێـك
بێدەنگ بوو. . سەری بەرز کردەوە بۆ کتێبخانەکەیو چاوی
بڕی‌یە یەکەیەکەی کتێبەکانیو لەبەرخۆیەوە وتی: هەر کتێبێ لەم
کتێبـانــە گەنجینـەیێکـە بۆ مرۆڤ و بیـرەوەرییـەکی هەرگیـز
لەیـادنـەچـوویشـە بۆ خاوەنەکەی؛ چونکە مرۆڤ کە دەست بە
خوێنـدنـەوەی هەر کتێبێ لەم کتێبـانـە ئەکـات، جگـە لەوە کە
سوودی لێ وەردەگـرێ، وایش ئەزانـێ لەگـەڵ نووسـەری
کتێبەکەدا دانیشتووەو ئەدوێ با سەدانساڵیش بێ مردبێ!.

بەدەم قسەکردنەوە لەگەڵ خۆیا بەردەوام بوو لە هەڵدانەوەی
پەڕە پەڕەی دەفتـەرەکـەو خوێنـدنـەوەی بیـرەوەرییـەکـاندا، تا
گەیشتە سەر لاپەڕەی بیرەوەرییەکانی ئازادی برادەری کە هەر
لە سەرەتـای منـاڵییـانـەوە دوو هاوڕێی گیـانی بەگیانی بوون؛
پێکـەوە ئەچـوون بۆ قوتـابخـانـەو پێکـەوە ئەهاتنەوە. هەروەها
کردبوویانە عادەتیش، هەر دوای لێبوونەوەیان لە دەرسەکانیان و
گەڕانەوەیان بۆ ماڵ و پاش پشوودان و یارمەتیدانی باوکیان لە
هەنـدێ کاروبـاری جووتیـاریـدا، کتێبـەکـانیـان هەڵئـەگرت و
ئەچوونە ناو باخەکانی خۆیان کە لەپاڵی یەکدا بوون و، لەناو
کێڵەکەیاندا[*] کە لەناو باخەکەدا بوو ئەیانخوێندو ئەچوونەوە بە
دەرسـەکـانیـانـاو، جارجـاریش لە کێڵەکـە ئەهـاتنـەدەرو بەدەم
پیـاسـەوە ئەیـانخـوێندو هەوای پاك و خاوێنی ئەو چەم و دۆڵ و
چیـایـەیـان هەڵئـەمـژیو ئەچوونە سەر کانیی بنار شاخەکە، کە
چەند هەنگاوێك لە باخەکەوە دوور بوو. ئەم کانییەیش هەر
بە کانـیی شووڕەســواران ناوی دەرکـردبـوو، تابڵێی ئاوێکی
سازگـارو خاوێن بوو، لە هاوینـا سـ[illegible]ش و لە زستـانـا نە
سارد نە گەرم. بەتـەواوی خەڵکی دێـ[illegible]ـەی حەسـانـدبـووەوە
بێئـەوەی هیـچ وەرزێ کەم بکـات، بەڵـکـوو بەشـی
کشت وکاڵیشی ئەکرد خەڵکی دێکە بەهۆی

ئەم کانییـەوە ئەوەنـدەیتـر خۆشـەویـستـی گوندەکەیان چووبووە
بەدڵـدا. دەمـاودەم لە باوبـاپیرانیانەوە بیستبوو کە ئەو کانییە لە
سەردەمـی شۆڕە سوارانـیشـدا هەر هەبـووەو بەو ئاوە زەلاڵـە
پەروەردە بوون و تینـوویـەتییـان شکاوە. سەرەڕای ئەوەیش بۆ

نەخۆشیی وەکو باداریو نەخۆشیی پێستیش سوودیان لێ وەرگرتووە.

ئازادو نەریمان بە یاریکردن دەست و چاویان ئەشۆریو تێر ئاویان ئەخواردەوەو دوایی بەرەو ماڵ ئەگەڕانەوە. ئازادو نەریمان بەم جۆرە تا وەرگرتنی باوەڕنامەی زانستگای کۆلێجی زانیاری پێکەوە بوون و پلەکانی خوێندنیان یەك لەدوای یەك دەبڕی. بەڵام ئازاد هەر بیری بەلای کانیی بنار شاخەکەیانەوە بوو و زۆر خۆشەویست بوو لای. دڵنیا بوو ئەگەر ئەم کانییەو سەدان کانیی تر کە لە وڵاتە خۆشەویستەکەیا هەن دەستی زانیارییان بگاتێ سوودێکی زۆر ئەبەخشن بە وڵاتەکەی لەبارەی ئاوەدانیو تەندروستیو پێگەیاندنی مرۆڤی لەش ساغ و بەتوانا. بۆیە خولیای تەواوکردنی خوێندنی لە دەرەوەی وڵات کەوتە سەر، بەتەمابوو بەڵکوو لە یەکێ لە زانستگا جیهانییەکاندا وەربگیرێو لە زانستی ئاوو هەواو کانیاودا ببێتە پرۆفیسۆرو بگەڕێتەوە بۆ نیشتمان تا بتوانێ ئەوەی لە مێشکیدایەو بیری لێ دەکاتەوە بیهێنێتەدی. هەر بەم بۆنەوە بوو کە لە بیرەوەرییەکەیدا نووسیبووی بۆ نەریمان: نەریمانی برام! وا بۆم ڕێکەوتووەو ئەڕۆم بۆ دەرەوەی وڵات. ئیتر چۆن ئەڕۆم ئەوە پێویست بە درێژەپێدان ناکات، تەنها ئەوەندە هەیە بە نیازێکی پیرۆز ئەڕۆم. بۆیە بەکورتی ئەم چەند دێرەت بۆ ئەنووسم و تکات لێ ئەکەم کانییەکەو ئاوەکەیو چیای شۆڕە سواران و گوندە نازارەکەمانت لە بیر نەچێ؛ ئێمە پەروەردەی ئاوی ئەو کانییەین، هەوای ئەو چیاو لوتکەو بنارانەمان هەڵمژیوە، لەوێ گەورە بووین. ئیتر سەرکەوتنتم ئاواتە.

هاوڕێت: [ئازاد شۆڕەسواری]. ١٩٨٠

نەریمان بە خوێندنەوەی بیرەوەرییەکەی ئازادی برادەری گەڕایەوە بۆ تەمەنی [illegible]الیو چۆنیەتیی ڕابواردنی لەگەڵ ئازاددا و چوونە قوتابخ[illegible]ەیان و تەنانەت ئامۆژگارییەکانی مامۆستاکانیان و چۆنیەتی وتنەوەی دەرسەکانیان کە چۆن بە دڵسۆزی پێیان ئەخوێندن؟ تەنانەت ئەگەر بیانزانیایە قوتابییەك لەبەر نەبوونی ناتوانێ لە خوێندنا بەردەوام بێ ئەوان یارمەتییان ئەدا بۆ ئەوەی خوێندنەکەی لەکیس نەچێ...

ئەی جوانیی دیمەنی گوندە خنجیلانەکەو کانیو ئاوە سازگارەکەی کە چیای شۆڕەسواران لە ئامێزی گرتبوو و خستبوویە ناخی خۆیەوە؛ بۆیە هەرگیز ئاوەکەی کەمی نەئەکردو هەمیشە ئەبریقایەوەو کەیف خۆش بوو!

نەریمان ئەم هەمووە بیرەوەرییە شاراوانەی چەند ساڵەی ڕابووردووی هاتەوە یادو، وای ئەزانی ئێستەیش ئەوکاتەیەو منداڵە بچکۆلەکەی گوندەکەیانەو لەگەڵ هاوڕێکانیا بەسەر چیای شۆڕەسوارانا سەرئەکەوێو لەسەر تاشەبەردە سافەکان وێنەی شۆڕەسواران ئەکێشن و پاشان بۆ دامێنی چیاو سەر قەراخ ڕێگا باریکەکەی بەردەمی چیاو کانییەکە خۆیان خل ئەکەنەوە! ئای کە ڕۆژانێکی خۆش و سادەو بێگرێوگۆڵ و هەرگیز لەیادنەچوو بوون!!..

تەنانەت ئەوەیشی هاتەوەبیر کە جارێکیان لەکاتی خل بوونەوەکەیدا کەوت بەسەر کچە جوانکیلەکەی دراوسێیاندا کە ناوی کاڵێ بوو و لە کانی ئەگەڕایەوەو کوولەکەیێکی پڕ لە ئاوی بەسەر شانەوە بوو و ڕێگا باریکەکەی دامێن چیای گرتبووەبەر. بەڵێ کاڵێی بچووك کەوت و کوولەکەکەیشی شکاو دەستیکرد بە گریان. لەڕاستیدا کاڵێ ئەگەرچی کەمێ ئازاری پێگەیشتبوو زۆرتر بۆ کوولەکەکەی ئەگریا لەترسی ئەوەی دایکی لێیبدا. بەڵام نەریمان خێرا هەڵسایەوەو نەوییە قۆڵی کاڵێو بەئارام هەڵیساندەوە سەرپێو پێیوت: کاڵێ گیان! مەگری، لێم ببوورە بەخوا بەدەستەنقەس نەکەوتم بەسەرتا. خۆ ئازارت پێنەگەیشتووە؟. کاڵێیش هەر بەدەم گریانەوە وتی: ناء.. نەریمان خۆ من بۆخۆم ناگریم بۆ کوولەکەکەم ئەگریم؛ دایکم تێروپڕم لێئەدا! ئەمیش وتی: نا.. کاڵێ گیان! هەر ئێستا ئەڕۆم لە ماڵی خۆمان کوولەکەیێکی هەروەك ئەوەی خۆتت بۆ ئەهێنم.. ئەمەی وت و بەخێرایی ڕایکرد بۆ ماڵەوەو لەسەر کونەڵانەکەیان نەوییە کوولەکەیێك و بەخێرایی بەرەو لای کاڵێ ڕایکردو پێیدا. کاڵێ کە سەیری کرد دی هەر لە کوولەکەکەی خۆیانی ئەکرد؛ بۆیە بە زەردەخەنەیێکی لەسەر خۆوە وتی: نەریمان گیان! سوپاست ئەکەم لەوانەیە دایکم هەر هەستی پێنەکات کە ئەوەکەی خۆمان نییە!.

نەریمان ئەگەرچی هێشتا منداڵ بوو بەڵام هەستیکرد کەوا کاڵێی زۆر خۆش ئەوێ، بگرە بەقەد خۆشەویستیی گوندەکەو کانییەکەیان خۆشەویستیی ئەو کچەیش چەقی بووە دڵی؛ بۆیە ئا لەوساتەدا لەوێدا ڕەق لەجێی خۆی ڕاوەستاو چاوی لە ڕێگاکەوە بوو هەتا کاڵێ گەیشتە ماڵی خۆیان ئەنجا ئەمیش گەڕایەوە بۆ ماڵ. دوای ئەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ نەریمان زیاتر خۆشەویستیی کاڵێی لە دڵا جێگیر دەبوو، ئەگەرچی

هەردووکیـان منـداڵ بوون و وەختی ئەو هەست و ئارەزوویـانە نەهـاتبـوو، ئەوەنـدە نەبێ کە نەریمـان یەك دوو ساڵێ لە کاڵێ گەورەتر بوو. ئیتر کەس هەستی نەئەکرد کە وا نەریمان کاڵێی خۆش ئەوێ لەوە زیـاتـر کە دوو منـداڵن و هۆگـری یەکتـرن؛

کاڵـێ بچـوایـە بۆ کانـی ئەویش بەدوایـا ئەچـوو و بە زۆر کوولەکەکەی لێ ئەسەندو بۆی هەڵئەگرت! یان بچوایە بۆ ناو منداڵان بۆ یاریکردن ئەویش بەدوایا ئەچوو وسەیری ئەکرد! یا ئەگەر لەگەڵ هاوەڵەکانیـان ببوایەتە شەڕ خێرا نەریمان خۆی

ئەکرد بەناواو لەسەر کاڵێی ئەکردەوە! کاڵێیش بەرە بەرە هەستی بە دڵسـۆزیی نەریمان ئەکردو خۆشەویستیی لەدڵیا زیاد ئەبوو.

ئیتر ساڵ هات وساڵ رۆیی‌و وردە وردە هەردووکیان گەورە بوون و خۆشـەویستیش لە دڵی هەردووکیـانـا گەورەتـر ئەبوو.

نەریمـان پلەی سەرەتـایی بری‌و چوو بۆ شار پلەی ناوەنـدی‌و ئامـادەیی تەواو کرد، بەڵام کاڵێ هەروەك دەستـە خوشکـەکـانی تەنهـا پلەی سەرەتـایی تەواو کردو، لەبـەر نەبـوونی قوتابخانەی ناوەندی لە گوندەکەیاندا نەیتوانی لە خوێندنا بەردەوام بێ. ئیتر

بە دوورکەوتنەوەی نەریمان لە گوندەکەو بەردەوام نەبوونی کاڵێ لە خوێندنا هیواو ئامانجی سادەو پیرۆزی کاڵێ‌و نەریمان هاتە کزبـوون و کوژایـەوە؛ چونکـە نەریمـان کوڕە جوتیـارێکی

بێ‌دەستـەڵات بوو، هێشتـایش لە سەرەتـای ژیـانا بوو و چەند پلەییکی مابـوو بگـاتـە نانی خۆی.. بێ‌گـومان کچێکی جوانی وەك کاڵێ لە لادێیەکدا دەیان کوڕە دەوڵەمەندو پارەدار ئاواتیان بۆ ئەخـواست. دیـارە باوکی کاڵێ هەرگیـز نەدەهات بەخەیاڵیاو

قایـل نەدەبـوو تا چەنـد ساڵ کچ بەدیـاری نەریمـانەوە دابنێ، بەتایبەتی باوکی کاڵێ هەستی بەوەنەکردبوو کە نەریمان کاڵێی خۆش دەوێ؛ بۆیە کاڵێی دا بە کوڕی حەمەی ئەوڵا سوور کە خاوەن مەڕو ماڵاتێکی زۆر بوو و لە دێیەکەیشدا ناودار بوو. بەم جۆرە هیـوای بۆ یەك بوونی کاڵێ‌و نەریمـان بەئێجگـاری پێچـرایـەوە. بەڵام خۆشـەویستی لە دڵی هەردووکیـانـدا هەر زیندوو بوو بەقەد خۆشەویستیی چیای شۆڕەسواران و کانی‌و گوندەکەیان!.

ساڵێـك لەوسـاڵانـە سەرمـاو سۆڵەییکی ئێجگار دژوار بوو، هەر لە سەرەتـای سەرماوە بەفـر لەسـەر بەفـر ئەباری، بەفرێ نەئەتوایەوە کەچی بەفرێکی‌تر هێرشی ئەهێنا بەجۆرێ مەترسی رەق بوونـەوەو هەرەس هێنـانی بەفـر سەرو دڵی دانیشتـوانی گوندەکەو دەیان گوندی‌تری گرت؛ لەبەرئەوە خەڵکی گوندەکە بریاریان دا گوندەکەیان بەجێ‌بێڵن و لەو مەترسی‌یە رزگار بین.

ئەیـانـوت: تەمـەنی بەفـر کورتـەو بە داهاتنی هاوین ئەتوێتەوەو ئێمەیش ئەگەڕێینەوە بۆ جێگەی خۆمان، بەم جۆرە دانیشتوانی هەنـدێ لەو گونـدانـە کە لە مەتـرسیـدا بوون گونـدەکـانیـان بەجێ‌هێشت، یەکێ لەو گوندانەیش گوندی دامێن چیای شۆڕە سواران بوو...

کۆتـایـی زسـتـان بوو شەوێـکـی تاریـك و نووتـەك و ئەمووستەچاو بوو پیرە بەفر رِق و قینی خۆی رِشت و هەرەسی هێنـا بەسـەر گونـدی شۆڕەسـواراندا، سوورە چنارە کۆنە رەگ داکـوتـاوەکـەو دار بەڕوەکـانی قەدپـاڵەکە نەبێ لەو ئاقارەدا شت بەدەرەوە نەما، بەفر هەمووی داپۆشی، کە مرۆڤ سەیری ئەو ناوەی ئەکرد لە دەشتێکی ساف و چۆڵ ئەچوو، ئەگەر مرۆڤ ناوی گونـدەکـەی لەوەپێش نەبیستبـایـەو نەی‌دیبایە ئەیوت: ئەم شوێنە هەرگیزاو هەرگیز گوند نەبووە!

رۆژ هات و رۆژ چوو زستان و سەرماو سۆڵەو بەفرو کرێوەی باری کرد، تەم و بۆران لەسـەر لووتکـەکـان رەوینـەوە، بەهـار هات و هاوین بەدوایـاو شوێنـەواری بەفـر نەمـا؛ ئەو بەفـرە ماڵ وێران کەرە خۆی لەبەر تینی خۆری تیشك زێرینا نەگرت، جارێکی‌تر دنیای ئەوناوە پێکەنی‌و کانی‌یەکەیش بە خۆی‌و ئاوە بریقەدارەکەیەوە لە جاران جوانتر بوو، دڵی دڵدارانی بۆ لای خۆی رائەکێشاو مژدەی ئاوەدان بوونەوەی گوندەکەی بەگوێی خەڵکدا ئەچپاند.

ئا بەم جۆرە خوێنـدنـەوەی بیـرەوەری[illegible]ەی ئازاد نەریمانی بردەوە بۆ ئەو یادگـارە نەمـرانـە کە لەدڵیـا جێ‌گیـر بوون و ئەم داستـانـە نەمـرەی خستـەوە یاد، ئیتـر بەتـەواوی مانـدوو بوو و خەوی لێ‌کەوت!

* * *

- تەواو -

* کێل: لە ناوچەی هەوراماندا بە خانوانە دەوترێ کە بۆ تاتی بەهەرم لە ناو باخەکاندا دروست دەکرێن.

# لیفتێ

نزار محمد سعید

دەستێ وی یێ بزکیڤە پشتا خو یا خویل گری، ژنکەکا بعەبا یا برەخڤە .

تومبێلەك دبەررا بوری، چاڤێ ئەحمەدی لێبو ژنکێ دەستێ خوبو بلنـد کر. . ضزرکـر دنیـاسن، ئینـا ستـوٚپ گرت وپاش پاشکی زڤـری. . لبـەرلێڤـا جەهدێ راوستیا. . . پەنجەرا ئالێ راستێ ئینا خار. دەحـویێ ڤاتێ ئەنیشکێت خو دانـانـە سەر لێڤـا پەنجەرێ تو ناچیە ئالێ دی؟

- کیرێ؟

- ئالێ دییێ بازێری

- بلا ماچ ڤەیدییە

- دێ وەرە سیار بە کچا ماکەرێ! «چینگلێ ژنکێ گرت راهاڤێتە دتومبیلێ دا» !

ژنکێ بکز گریوکڤە گوت :

- نادەمـە ڤە . . . پـا یخـودێ ئەز نادەمـەڤـە خو تو من بکوژی دەحو بسـەرەکـێ مەزنـ[illegible]لـەکـڤـەو دووچـاڤـێـت زیق ل سینگی سیـاربـو. . . شـویـ[illegible] شکەستنێ ل سێ چار درا ل ئەنیا وی یاپان ددیـارن لیڤێت وی یێت ستـویـر وێ چەنـدێ رادگـە هینن کو کەسەکێ زڤرەو ناتورەیە، شرکێت پویچاتیی یێ ڤێدا تێنە خارێ. بیهنـامـەیێ تومبێـل مشت کر، بیـرا ئەحمـەدی هاتە بیرێ جاخێ بەری سالـەکێ لەمـەیخـانێ بویە بەرەڤانێ وێو ئێکێ دی ئو دناڤ لەپێت وان دا کێـرەك ڤ دەستێ وی کەتی. کەربێت ئەحمـەدی بێقام ڤەبون . . . ژکەل هندبریك کیشا تومبێل تەمراندو گوت :

- ناچم وەرنـە خارێ . . . هـەوە نابـەم دەحـوی کەڤا دەستێ خویێ رەش ل دەشبولێ تومبێلێ داو هەردوو لیڤێت ستویر ل هەڤ دان .

- ب پاری خویە دێ خێرەکێ بوخو کەی؟

- ما ئەز تەکسی مە وەرنەخارێ ناچم .

- ناهێنە خارێ کا دێ چ کەی؟

چ ئاقـل دسـەرێ ئەحمـەدی نەما . . . تلێت دەستێ خریێ راستێ مچـانـدن. . . ئەنیشکا خو برە هنداڤ ناڤ چاڤێت دەحوی و هندی شیایی دەنگێ خو بەدا :

- هەرە خارێ دبێژمەتە هەکە هێڤێنێ دەڤ ولێڤا بتەڤە ناهێلم! !

- وەی تر! «دەحوی گوت و دەستێ خودا زەندکا وی وێڤە پالدا»

ئەحمـەدی چاڤێت خو زیق ئێخستنـە دێمێ ژنکێ، بیهنـەکا کویر هلکێشا و گوتێ :

- خویشکا من دێ هێژکو تو هەرە خارێ .

ژنکێ مویەك ژخو شاش نەکر ئەحمەدی چینگلێ دەحوی گرت .

- وەرە خارێ درێژ نەکە .

- ناچمە خارێ من گوتەتە .

- ئەلحوکمێ خودێ .

کەس ل دورو رەخێـت وان ناهێت وبچیت، تنێ هەر بیستـەکێ چاڤکێت تومبیلەکێ یێ دکـەڤنـە وان، ئەو درێ رون دبن . . نیڤـا بازێـرییـە، هەردوو ئالێت جەهـدێ ریـزێت دوکـانانە . . دوکان دگـرتینە . . بیهنا باجانا زەرزەواتی هاڤێتی ئەودرێت مشت کرین «وەرە خارێ . . نـاهێمـە خار . . دێ هێیـە خارو زڤـری . . . کورو ناهێم چ دکـەی وەبکـە» برەکا جحێلا برێکا خو دچون، بسـەر قەلەبالغێ هلبوٚن، ئێکی ژوان دەنگەکێ بلند بەردا :

- چییە . . . ئەو هەوە چییە خێرە؟

ئەحمەدی بدەنگەکێ تیژ بەرسڤاویدا :

ـ دەحویە. . ژنکە کا دگەل. . دەستێ خو بو من بلندکر. . ئەز بو راوستیام. . نزانم چ سوحبەتە. . ڤێ شەڤێ. . سەرخوش. . ژنکا دکەتە گری و دبێژیت نادەمەڤە خو تو من بکوژی:

ـ دکەتە گری؟! «چەندەکا ب هەڤرا گوتن»:

ـ دیارە گەلەکا ئێشاندی!! هە هە . . . . ئەڤە دەحویە دەحو بابێ لەعیی‌یە!

ژنکێ دزانی دێ نەخوش بیت، ڤیا ژتومبێلێ بێتە دەر، لێ برەکا گورگا یێ ل دورو رەخا. . . ژلایەکێ دی ژی ڤە دترسیت پولیس بێن ببینن وەکی هەرجار بیەنە مەرکەزی. . نەخاسمە بەری چەند روژەکا بریارەکا ژدادگەهێ دەرکەتی کو ل وێری بەرهەڤ بیت. . خەلکی دروژنامێ دا خاندبو. . . چ بکەت یا دەبیی «عەردو شەق بیە دا بجمە تێدا»

چاڤێ وێ یێ ل ئێکێ زەلام باش. . هە ڤالێت خو دانە پاش. . دەرگەهێ تومبێلێ ڤەکر. . دەحو ژپتویی گرت وکێشا دەر:

ـ تو نوکە لەگەل مەبوی. . چ زوی هاتیە ڤێری. . . خونە تە کولاڤکێ ئەجنا هەیە؟! مامە نەگوتبو تە ئەڤ شەڤە دێ مە بەیە د"،!! تو خو ژمە ڤەددزی و دەردکەڤی.

ژنوی سەرخوشیێ سەرێ دەحوی گرت. . هەر مروڤەك ژمر وڤێت راوستیایی لبەر چاڤێت وی بونە دوو. . هند خو دیت شە پولەك چو ناڤ چاڤا تیو تی چو. . «لێدەن هەی وان و وان» سەرخوشن یێ ل تشتەکێ هوسا دگەرن، ئێکی هاڤێتە بەری یێ دی. ڤیرێت وی و شوپێنا کولم و پێهنا و گریا ژنکێ تەڤ یێ تێکەل دبن جەرگێ متیێ ل وان دورا دپە رتینن.

ئەحمەد هندی یێ تێتێ ژێڤە کەت نەشێت. . وەلێ کرن هو نەرمژاند. . ژنشکەکێڤە خو ژناڤ لەپێت وان هلاند چو وێڤەو بگریڤە دەنگەکێ بلند بەردا:

ـ ولاّ دێ دد. . . مادێ ئەڤە بو هەوە مینیت.

ـ چی‌یا ژنە تێت تەخسیر نەکە. . . ئێڤەلی . . . ئێکێ دی سەرێ خو برە بەر پەنجەرێ ماوەرکرە ژنکێ و فیتکەکا درێژ ڤەدا! ژنکێ بکەرب خێلیاخو دانا. ئێکی ژی دەنگێ خو بسەر یێ هەمیا ئێخست

ـ هەرن برا هەرن خودێ لگەل هەوە بیت!

دەحو مینا بیها دئاڤێدا یێ ڤەدلەرزیت، گوملەکێ وی یێ ژناڤ رونکێ وی‌هاتیە دەر، قولپکێت وی یێ دقەتیاین. . . لەشێ وی یێ گران خو لسەر دارێ پیا ناگریت. . عێلنجی‌یێ لێددەن. . . ددەلیڤێت هولێ دا بەری نوکە ددەڤی. . خو دهەلانە. . لێ ئەڤرو ئێك: پێت وی هادی ناکەن، یا دووێ ژی ژنکا وی یا دگەل . . تشتەك ژێ دڤێت:

ئەحمەدی دەحوو پرا جحێلا هێلانە پێکڤەو خو هەلاند دوان نابە ینـاداتو مێلە کاپولیسا ل دەڤ وان راوستیا چ قەرەبالغە چ سەرو بەرە. . . دەحوی جارکادی دەست بگریێ کر چیروکا قوتانا خوو ژنکا خوبو پولیسا گێرا، ئینا رابون تەڤ برنە مەرکەزی ئەحمەدی کرە دلێ خو کو بریڤە لگەل ژنکێ نە ئاخڤیت هەتا ئەو بەری لگەل نەئاخڤیت. . . موغدارەکی چون ژنکێ لێڤ ل لیڤێ نەدا، ئەحمەد لەسەر ملێ خو زڤری بتیێ‌چاڤی سەحکرێ، پاش زڤری ڤەو گوتێ:

ـ مەنە زانی تو چیا وی یی؟

ژنکێ خێلیا خو راکر برە پشت سەرێ خوو گوت:

ـ ئەز ژنا وی مە نەل سەر خێرێ.

ـ نەبابو نە. . . ژنا ڤی؟

ـ بەلێ.

ـ ئەز باوەر ناکەم. . . تو لکیڤەو ئەو لکیڤە.

ـ بەلێ وللا ژخو ئەز درەوا ناکەم.

ـ ئەز تێ ناگەهم چ سەرو بەرە. . . سەرخوش هەتا بەری نوکە ل مەیخانێ بوڤەدخار. . . تو یادکەیە گری . تو ل کیڤە دیتی . . . چاوا هوین ڤێك کەتن؟ نا کەڤیتە ئاقلی مروڤی.

ـ ئێڤاری ئەوی‌و هندە هەڤالا ل مال ڤەدخارن، گوتە من خارنەکێ چێکە ئەڤە ئەز چومە مەیخانێ ئارەقێ بینم. . . ئاها بەرێ نوکە یێ تێتە ڤە.

ـ تو هەڤالێت خو هێلانە ل دەڤ تە؟

ـ بەلێ ئەرێ وللا.

ـ بتنێ؟!

ـ بتنێ بتنێ. . . حالێ وی هەر ئەڤەیە.

چ ئالێ سەحکەیێ گلوپێت سورو زەرو کەسك یێت برسکن، نزا چاوا دالغا ئەحمەدی لێدا تومبێلا خو دا لێڤا جە هدێ. . . راوستیاو لە سەرملێ خویێ راستێ‌زڤری. . . دەستێ خو درێژکرە گلوپێ هەلکر . . . یا ژژنکێ ڤە دێ دەستێ خو درێژکەتەوێ، ئینا خو ڤەکێشا . . . ئەحمەدی چاڤێت خو دا هێلانە وان چاڤێترەشن . . وی دێمێ رون و زەلال. . . رویت مینا پەلا . . «جوانی هندە»دەماریت وی ژێك هاتنە دەر. . . خوینا وی هاها دێ

فوربیت . . «بیژمی . . نه بیژمی»پی ل جورعەتا خو دانا :

- دد دێ هێ ی؟!

ژنکێ خو بسەرڤە نەبر گوت!

- دێ جمە مالا خویشکا خوٚ وان ژنه دل ئەحمەدی دوکێل ژپاشیا تومبیلێ بەرداو گوت :

- مالا خویشکا تە ل کیرێ یە؟

- هێژ یامای گەلەك هەما هەره .

جارەکا دی کره دلێ خو کو ئێدی ل گەل نە ئاخفیت لێ رایا خو بلەز گوهری ڤه :

- تو ئەڤ جانه . . . تەچاوا ئەڤە ئینا سەرێ خو؟

- ئەز سێوی بوم . . بچویك بوم . . . چ نەزان بوم ژنبابێ ئەڤە ئینا سەرێ من . ئەز بختوتەکێ دامە ڤی بێخیری کو ئیشەللا خودێ کارێ وێ راست نەنبیت «ئەو وێنه هاته پیش چاڤا چاخێ ژنبابێ دگەل خو دبره بازاری بدەست جحێلاڤه بەردا، وان ژی نەدکره نەمەردی، نه هە و دەهێت وێ بو چێدکرن ئەڤ پەیڤه ل سەر ئەزمانێ وێ بون بەلێ نه دەرێخستن داعویران»

- ئو یا یادی . . . یادی کێ ئینا سەرێ تە؟

- چ کیژکا دی؟

- تو نزانی خو خشیم دکەی . . دەحوو . . هەڤالیت وێ . . ل دەڤ تەو بتنێ . . یا ئاشکرایه ، نەبێژه تویاکەڤنی چاوا هەتا نوکە تە نانیاسم!؟» ژڤنه بره» :

من کوشەکا زێرا هەبون ، هەمی ل قوماری دان . . . تنێ بازنك مابون ، من بیت د[illegible]نه ڤ خویشکا خو ئەوژی دڤین .

- ماتو دێ بوچی هو[illegible]ا یاسەر نەرم بی؟

- تو نزانی . . [illegible]راکرو هاته من ، یان دێ تە کوژم ، یان هاتیها دێ ئینی .

هەردوو بیستەکا خوش مت بون ، ژنکا هزریت خو دکەن ، ژنوی‌هـای ژخو هەبو کو ل چەند ئا خڤتنێت خو یێ‌ی حەمدێ خو دسەردا چو . . لیڤا خو گەزت ، . دەنگێ هندەك ئاخڤتنیت وێ هێژیت گوهادا ، لێ هەر دا وان ئاخڤتنا کەت ژبەرکو مەرەما وێ ژێ ئەوبو دلێ ئەحمەدی بحالێ وێ بسوژیت :

نێزیکی کوّلانا مالا خویشکا خو بو ، سەرێ گلولکا هزرا ژلەپا دەرکەت :

- ئەز گوری تە لەسەرێ کولانێ .

- دێ هێیه خارێ؟

- بەلێ دێ هێمه خارێ

- تو چویی و مەچ نەدیت!؟

خودێ تە بهێلیت ، مە تو وەستاندی .

- دا چ بێژم . . . ژبیرا من چو من ئەگوتە نه مالا هەوە ل کیرێ یە؟

ژنکێ ئەو بەژنا بلند خویل کرو سەرێ خو برە بەر پەنجەرکێ و بدەنگەکێ نزم ، دا خەلکی گولێ نەبیت گوت :

- من چ مال نینن . . . ئەز یا ل کوّلانا .

ئەحمەد گیژبو ، چاڤێت وێ ژسینگێ وێ یێ مینا بە فرێ ڤەنەبون ، ددلێ خودا دگوت خوزی سەعەتەکا دی هوسا بمینیت . بەرسڤا وێ دا :

- یا چاوا بەری نوکە تە بەحسێ مالا خو نه دکر؟

- چ بێژم . . . ئەم هەر چەند روّژه کا یێ ل ئەردەکی کوچکێت خو ل چ ئەردا رەش ناکەین .

- دێ هەره خودێ ل گەل تەبیت بەلێ مە ژبیر نەکەی ها!؟

ئەحمەد ژجهێ خو نەلڤی هەتا زانی ژنك چو دگێژ خانیڤه ، چەپەك ل خوّداو چەند جارەکا دبەر دەرگەهێ وێ خانی را هات و چوّ بەلکی دەرکەڤیت بەلێ نه هەرێ چ بەحس نینه مینا پە رندە کی چوژدەستا ڤری .

ئەحمەدی کارێ ئەڤ قوناغه بو شەڤاندی و ئەڤه هاتیە سەرێ ژبیر کربو ، هەتا ژ ژنکێ یێ هیڤی نەبوی نە هاتە بیرێ . لێ ژدەمێ شەڤبێرێ ژی دەکەت بو ، لەوما بەرەڤ مال باداو تومبێلا خو ل سەر جادا ڤێری ژکەرباداو وەکی بایێ بر ویسێ زملباند .

هێژ کارێ خو نە گوهەری ، دەرگەهێ وان هاتە لێدان «یارەبیی تو بێژی ڤی نیڤا شەڤێ کی‌بیت . . نه کو ئەو سەر . . »ترسێ پەنجێت خو دلەشێ وی دا ئاڤا کرن . . . تومبێلا پولیسایه! ، پولیسەکی سلاڤ کرێ وگوتێ :

- توی ئەحمەد؟

- بەلێ ئەزم .

- ئەڤه بیستەکا خوشەئەم ل مالا هەوە وگەرێین

- خ . . . خ . . . خێرە برا؟

- خێرە ئیشەللا . . . چ نینه . . . ئەڤەری تویێ خاستی ، شولەکا

سەرپێ یەو دێ زڤری.
- دێ هەما کەرەم کەن هەرن ئەز دێ ددویڤ هەوەرا هێم.
- نەخێر تو دێ لگەل مەهێی.. تویی گرتی.
- گرتی!!؟
- لەزێ بکە؟

دپشتا تومبێلا پولیسادا، دووسێ پولیسەکا هەر ئێکی ژبەرێ خو ڤە پرسیارەك دهاڤێتە بەر، لێ های ژوان نینە، یێ بەرسڤا بو پرسیارێت ئەفسەری بەرهەڤ دکەن، هەکە هو گوتە من دێ هو بێژمێ... هەکە ئەڤ پرسیارە ژمن کر... دێ هوسا بەرسڤا وی دەم، پاشی پەحنکا دەستێ خویی راستێ ژکەل ل چوکێ خو دا گوت:
- هەکە من ئەڤە بوتە هێلا دەحو ئەز نە کورێ بابێ خوبم بەلێ باشیێ نەکە خرابی ناهێتە رێکا تە.

جارەکادی قاچکێ هزرا ڤەجوی «یارەبیی دی چ بێژمە خەلکی، سوبەدێ دەنگە ڤەدەت هەمی دێ زانن دێ بەلاڤ بیت چاوا دفتەرکا من رەش ببیت هوسا

بساناهی.. من نەخاری نە ڤەخاری!؟

ئەفسەری چاڤێت خولێ سورکرن.. ئێخستنە پێلاڤا وی‌و سەرئەڤراز هلدان ل چاڤا راوستاندن... دارێ خول پەحنکا دەستێ خودا وگوت:
- ناڤێ تە چی‌یە؟
- ئەحمەدە.
- بێژە من توژی ولێ هاتی ژنکێت خەلکی ژێ بستینی‌و برەڤینی. ژنکێت خەلکی هەوانتەنە. حوکمەت نەمایە... چی‌یە... تو چ خو دادنی!!؟

هەر وەکی خوینا لەشێ ئەحمەدی هەمی هاتیە رویا، دگاڤێدا مینا کولیلکێت هناری لێ‌هاتن، چپکێت خوهێ ل ئەنیێ تەیسین بگوتەکی تڤا خو داعویراو بدەنگەکێ نزم بەرسڤا ئەفسەری دا:
- ئەزبەنی وەسا نینە وەکی بو تە هاتیە گێران ئەزبەنی. ئەڤ جامێرە هەمی ل وێرێ بون بلا ل بەختێ خو بدەن کا جا چاوا بو.. هەکە دەرکەت وەسا، چ ل من دکەی وەل من بکە.. بەمرێ خو ئەڤە ژنوی من مەرکەز دیتن.. ئەز مربام من پێ خوشتر بو کو سەرا تشتەکێ هوسا ئەز کێشایمە ڤێرێ‌و بێ‌ی کو هوین باش سەحکەنە خەلکی... ژێك بنیاسن. کا هەر ئێك خودانێ خو و چی‌یە.

ئێکی ژئەڤێت دەحو قوتایی دەنگەکێ تیژ بەردا:
ئەزبە نی گوهێ خو نەدە دحوی دیارە تو وی وژنا وی نانیاسی
- تو ژێکێ هەقی. پولیسەکی پشتی دەستویری ژئەفسەری خاستە گوت:
- ئەزبەنی ئەم بدویڤ ڤی‌و ژنا ڤیڤە بەزین، ئەڤە هەیڤەك تێ‌هەیە تێ نینە ژبەندیخانێ دەرکەتی، چی‌یا بو ڤی بێژن راستە، بیست دعوێت وی پێتر یێ ل نك مە هێژ نەهاتینە گرتن! دەحو هەوشیا خو بکز گریوکڤە گوت:
- ئەزبەنی درەوا دکەن.. بخودێ درەوا دکەن.. ما من چ کری‌یە؟

ئەفسەری ژبە رکو دا باش بسەر ئاریشێ هەلبیت رێك ددا هەرکەسێ بڤێت باخڤیت وێنەك ل پێش چاڤا ئاشکرا بو.. کرە دلێ خو دەحو بتنێ پێلیت، ئینا دەستویریا ئەڤێت دی دا بچنە سەر رێکا خو... بچنە مالێت خو. هێشتا وان کارێ چونێ نەکری، ئەفسەری گوتە پولیسەکی ژپولیسێت بینەقەیدێ ل دور کوما وان زڤرین گوتێ: بیە!. ئێکی چینگلێ وی گرت ژناڤ کومێ ئینا دەر. هندە پولیسێت دی دانە دویڤ.. دێ نانێ خو حەلال کەن... دەحویێ خو ئەدکێشیت لاڤە لاڤا وی‌یە: «بەختێ تەوو خودێ دا ئەزبەنی ولـلا من چ نە کریە.. ژنا من یا رەڤاندی هێژ دسەر خالێت من را».

کومەکا بەندکریا یێ دهاتینە بەر پەنجەرکێ بجاڤێت زیق بەرێ خو ددەنێ.. دەحویە! هەمی دنیاسن نەفەرەکێ کەڤ.. بیستەك بسەر ڤە نەچو ڤیریێت دەحوی بسەر مەرکەزیڤە ...ردان. پولیسە کی تەمەنەك بو ئەفسەری کرو هندە پەرك دانەڤێ ...ئەفسەری دەست هاڤێتێ پەر قەلبدان و هەر خاندن پاش بیستە... ...زرێت خو کرن رابوڤە قەستا دەحوی‌کر ئەحمەدو برا جحێلا موقدارەکێ یێ ژمەرکەزی دویرکەتین ژی هێژ دەنگێ دەحوی یێ دشە ڤێتە گوهێت وان.

ئەفسەری دەحو ڤاری کر ئەو بیستەکا خوش بو تشتەك بو دگوت، پاش دەستێ خو دو سێ جارا ل ملی داو دەستویریا چونێ دایێ.

(١) ئێڤەلی: کولانی: گەروك

# ئاره‌زوو



رەؤوف بیگەرد

من له ناخه‌وه ئه‌مزانی ئه‌م وه‌ستان و خۆ به‌رابووردوا هه‌ڵواسینه خوویه‌كی پووچه‌و گه‌مژه‌ییه، به‌ڵام هه‌ندێك جارو له ته‌مه‌نێكی تایبه‌تیدا مرۆڤ له‌گه‌ڵ مه‌به‌ستێكدا ئه‌ژی كه ئه‌یش زانیت به‌دی نایه‌ت، یان خولیایه‌كی منداڵانه‌یه‌و ئه‌نجامێك له‌خۆ ناگرێت، كه‌چی شوێنه‌واره‌كه‌ی ئه‌مه‌نده له قووڵیدایه هه‌میشه چاوه چاوی به‌دی هاتنی پێ ئه‌كات، ئه‌وسا هه‌موو جارێك خۆم هه‌ڵده‌خه‌ڵه‌تاند، كه‌چی ئێستایش كه‌رێم ده‌كه‌وێته‌وه گه‌ره‌كه كۆنه‌كه‌مان وه‌ك یه‌كێك له دواوه پاڵم پێوه بنێت، یان هه‌نگاوه‌كانم دوای سێبه‌ری خۆیان كه‌وتبن كاتێك ده‌زانم له‌به‌رده‌م هه‌مان ده‌رگادا! وه‌ستاوم، پیایدا هه‌ڵده‌ڕوانم و چاو بۆ ناو حه‌وشه‌كه هه‌ڵده‌خه‌م، ئێستا له جاران زیاتر هوشیار و له‌وه به‌ئاگام كه ئه‌م ره‌فتاره گه‌مژه‌یی و بێهووده‌یه‌كی رووته، دار و دیوار په‌رستنه‌و هیچی دی، به‌ڵام چی بكه‌م؟ هه‌ندێك جار مرۆڤ چه‌نده له بیركردنه‌وه‌و بۆچووندا راست بێت كه‌چی به‌و پێیه ناجووڵێته‌وه، ئه‌وساته‌ی كه تیائه‌ژی ئه‌گه‌ر بیشزانیت هه‌ڵه‌یه كه‌چی فرمانڕه‌وای كار و هه‌ڵسوڕێنه‌ری ره‌فتارته، منیش هێزێك له‌سه‌رووی توانای خومه‌وه جڵه‌وی رۆیشتنه‌كه‌م لێ وه‌رده‌گرێ و ده‌مبات، تا بۆ دواجار له‌به‌ر ئه‌و ده‌رگایه‌دا ده‌ستم لێ ئه‌كاته‌وه، كه دێمه‌وه سه‌رخۆم، یان وه‌ك جاران هه‌رمل ده‌نێم و ده‌ڕۆم، یان لۆژلۆژ به‌ره‌و دواوه

كه ئه‌گه‌یشتمه‌وه ئه‌و گه‌ره‌كه‌و، له‌و كۆڵانه نزیك ئه‌كه‌وتمه‌وه، هه‌نگاوه‌كانم ئه‌بوونه بزمار و موگناتیسی ئه‌و خانووه به‌كێشی ئه‌كردن، ئه‌گه‌ر ده‌رگاكه له‌سه‌ر پشت یان لایه‌كی كراوه بوایه، به ئاره‌زوویه‌كی پڕه‌وه چاوم بۆ ناو حه‌وشه‌كه هه‌ڵده‌خست و تێر تێر ده‌ر و دیواره‌كه‌یدا هه‌ڵمده‌ڕوانی، تاسه‌یه‌ك، ئاره‌زوویه‌كی سه‌رچڵ و شێت له شوێنی خۆیاندا كڕئه‌بوون و ئه‌حه‌سانه‌وه، خۆ ئه‌گه‌ر هه‌ر له دووره‌وه ده‌رگاكه‌م به داخراوی بدیایه، دڵم ئه‌بووه لیمۆیه‌كی گوشراو و ناڵه‌ی زیندانیه‌كی بێده‌نگ، له‌به‌ر ده‌رگاكه‌دا چاوی خه‌م و یاده‌كانم تیژتیژ ئه‌كرانه‌وه، له ره‌نگی بۆر و ئه‌ڵقه‌ڕێژه شۆره‌كه‌ی را[illegible]ان به هه‌نگاوی سست دوورئه‌كه‌وتمه‌وه، به‌ده‌م لێكدانه‌وه‌و كو[illegible]ی سه‌ره وروژاوه‌كه‌مه‌وه بۆ كه‌لاوه‌كه‌ی ئه‌و دیوو، له‌وێشه‌وه به‌ره‌و شه‌قامه گشتیه‌كه خۆم به‌كێش ئه‌كرد.

ئه‌وسا گه‌وره بووم، ده‌مێكیش بوو له رووداوی ناو ئه‌و خانووه دووركه‌وتبوومه‌وه، رووداوه‌كان یادگارێكی تاڵ و شیرینیان لا به‌جێ هێشتبووم، وه‌ك هه‌موو ئه‌وانه‌ی تری رابووردوو كه زۆر جار به‌رۆكت له ده‌ست ئه‌گرن و رات ئه‌ڵه‌كێنن، یان ئه‌بنه ئه‌ستێره‌ی شه‌وه تاریكه‌كان و به‌ئاسمانی ئه‌و رابووردووه‌وه ئه‌ڵدێن و ئه‌كه‌ونه جریوه، یان له بیابانی وشكی له‌شتا ئه‌بنه بارانی خوڕزم و ده‌مار و ماسولكه ماندووه‌كانت پاراو ئه‌كه‌ن.

دەگەڕیمەوە.

* * *

که له قوتابخانه دەگەڕامەوە بەپەله نانەکەمم دەخوارد چاوم ئەکەوتە له دەرگادانی ئاسمان، که پەڵه هەورەکان تەکیان ئەدایه یەکەوەو چاوی خۆریان له هەڵهاتن ئەخست، هەناسەی منیش به ئاسوودەیی دەگەڕا، خۆ که هەورەکە ڕەنگی سپی دائەگەڕاو هەر بۆ چاو برکردنێك خۆی له سنگی زەوی توند ئەکرد، منیش وەك چۆلەکەو ڕیشۆڵەکان ئەکەوتمه جریوەو له خۆشیا جێگام بەخۆم نەئەگرت فاقەکەمم هەڵدەگرت و بەرەو باخەکەی حاجی ڕەشید ئەکەوتمه ڕاکردن، لەو شوێنەدا که ماڵان تەنەکەیان تیا خاڵیئەکرد فاقەکەم ئەنایەوە، خۆ ئەگەر بەفر و باران بکەوتنایەتە ڕێژنەو ڕوشە خۆم ئەکوتایە ژێر چارداخی دەرگای ئەو خانوەو لەبنیا کروشکەم ئەکرد، چاویشم له فاقەکە نەئەتروکاند، که مەلێکی لێنزیك ئەکەوتەوە دڵم ئەهاتە تەکان و لێدانێکی بەپەله، چاویشم له تیژتیبڕینا ڕێشکەو پێشکەی ئەکرد، هەناسەم ئەگرت و جووڵەم لەخۆم ئەبڕی. گەلێك جار تا ئێوارە لەوێدا ئەمامەوەو هیچم نەدەگرت، پەلەوەرەکان هەیان بوو زیرەك و فێڵاوی بوون، چۆلەکەکان بەدەوریا لەیان کردە هاوار و زایەڵەو هەموو ئەوانی تریشیان تەرە ئەکرد.

باران لێزمەی دەکردو من هەر چاوەڕێی خۆش کردنەوەو ڕاوکردن بووم، که درەنگ دا ئەهات و هیچم نەدەگرت پەشیمانی ئەبووە خەمێکی خەست و دەستی لەبینم ئەنا، بەماتی ئەچوومە سەر فاقەکە وەك تاوانێکی گەورەی کردبێت بەدەم بێزاری خۆم و نفرەت لێکردنی ئەوەوە دەرم ئەهێنا، له بەرۆکما ئەم شاردەوە، سەرم دائەنەواندو بەپەله ڕێگای ماڵەوەم ئەگرتەوە بەر، لەڕێگا بڕیاری ئەوەم ئەدا ئیتر واز له فاقەنانەوە بهێنم و خەریکی وانەکانم بم، کەچی بۆ سبەینێ لەهەمان کات و شوێندا دیسان دیمەنەکە دووبارە دەبووەوە، وەك هەتیوێکی بێ باوك و دایك پاڵم بەدەرگاکەوە ئەداو چاوم لەهەمان شوێنی جاران ئەبڕیەوە.

* * *

ئەو ڕۆژەی کارەساتەکەی تیا ڕوودا کلووی بەفر میوانێکی ئێسك سووکی درەخت و گوێسوانەو دڵی من بوو، دنیایەکی کپ وهێور، ئەت ووت زەوی له وەستان کەوتووەو هیچ گیاندارێکیش زمانی گۆناکات، سروشت لەمشتی بێدەنگیا تاسابوو. بەپێی قسەکانی باوکم و تاقیکردنەوەکانی پێشتری خۆم ڕۆژانی بەفر ڕۆژی ڕاو بوو، که بەفر زەوی داپۆشی پەلەوەرو گیاندارەکان بەدوای ڕەشاییا ئەگەڕێن و وێڵی دوای خواردنن، منیش هەر چاوەچاوی ئەوەم بوو هەلێك دەست خەم و بۆیدەرچم، هەرکە کلوو بەفرەکان پشوویەکیان دا تاسەی چاوەڕوانی من بازرەقەی بەست و بۆی دەرچوو، لەهەمان شوێندا فاقەکەمم تاقەت کردەوەو خۆیشم بوومەوە هەتیوی بەردەرگاکە. چۆلەکەو ڕیشۆڵەکان به زیکەزیك و قونەوجریوە بەو ناوەدا بڵاوبیوونەوەو، لەسەر دەنکە گەنمێك یەکتریان ئەنایە ژێر و فرکەو تەپ و تلیان بوو، هەواکە تادەهات سارد دەبوو، کزەبایەك هەڵیکردو منی گرموڵەو ئەوانی زیاتر خستە قیژەو پێکدا هاتن، چاوم بیووە پەلەوەرێکی بێدەنگ و به دوایاندا هەڵئەسوورا، دڵیشم هەرچرکە خێراکەی جاران بوو. لەپڕا دەرگاکە کرایەوە، که ئاوڕم دایەوە کچە باڵابەرزە سوورەکارەکە بوو، لەگەڵ بینینما به سەرسامیەوە وتی:

- ئەوە بەم ڕۆژە ساردەیش هەرواز ناهێنیت؟ تۆ ڕەنگت گۆڕاوەو هەڵئەلەرزیت، هەستە وەرە ژوورەوە.

پێم وت:

- نایەم، کەمێکی تر ئەڕۆمەوە.

له دواوە دەستی گرتم و ووتی:

- ئەڵێم هەستە وەرە ژوورەوە، تۆ خۆت گەرم بکەرەوەو من له باتی تۆ لێرە ئەوەستم، ئەگەر فاقەکەت گرتی بانگت ئەکەم.

به زۆر پەل کێشی کردم و دەرگاکەی لەدواوە پێوەدا، بردمیە ژوورە گەورەکەیانەوە کەوەك بزانم هەموویان لەو ژوورەدا دائەنیشتن، بەڵام بۆ ئەوکاتە چۆڵەوانیەکی کربوو، لەپاڵ زۆپای دارەکەوە دانیام، دەستمی خستە ناو دەستی خۆیەوەو لەنزیك زۆپاکەوە هەڵیگلۆفتن، پاشان بردمیە سەرو ترو کەوتە دار پێوەنانی زۆپاکە، هەر بەدەم کارکردنیشەوە وتی:

- باوکو دایکت ئەزانن تۆ هەموو ڕۆژێ [illegible]ت؟ کەمێك ڕامام و لەدوایيا وەڵامیم دایەوە:

- ئا.. ئەزانن.

- ئەی بۆ ئەوەندە حەزت له فاقەنانەوەیە؟

- خۆشەو، جاران باوکم هەر له حەوشەکەی خۆماندا ئەی نایەوە.

- تۆ تاقانەیشی، دایك و باوکت زۆریان خۆش ئەوێت، وایە؟

- ئەی چۆن؟

- ئەی بۆ ڕۆژی وا نایەن بەدواتا؟

کەمێکی تر ڕامامەوەو بێئاگا له درۆکەی پێشوورم وتم، -

لای ئەوان نالێم ئەچم بۆ فاقـەنـانـەوە، پێیـان ئەڵێم. ئەچم بۆ ماڵی هاورێیەکم بۆ پیاچوونەوەی وانەکانمان.

- درۆیشیان لەگەڵا ئەکەیت؟

- . . . . .

- لە پۆلی چەنیت؟

- چوار.

چاوەکـانی سەرنجیـان ڕاکێشـام کە بەدەم قسـەکـردنەوە ئەبوونە دووکلّپەی شین و گەرمیان ئەکردمەوە، دەریایەکی پڕ لە ئارەزوو بوون ومنیـان لەخـۆدا نوقم ئەکـرد، ورده ورده لێم نزیـك کەوتـەوە، دیـسـان هەردوو دەسـتـمـی خسـتـە ناو دەسـتـە گەرمـەکـانیەوەو هەڵی‌گلۆفتن، ئەنجا دەستی ڕاستمی ماچ کردو نووساندی بە سنگیەوە، چاوەکانیشی هەرکلّپەی شین بوون و بە ڕووما ئەچزان، سەری نا بەسەرمەوەو کەمێك خۆی نەویکرد، دەستمی لە بەرۆکـە ترازاوەکـەیـەوە بەرەو خوار برد و لەسـەر مەمکێکی دانا، بەدەم هەناسە توندو گەرمەکەیەوە وتی:

- دەستت هێشتا سارده، با گەرمیان بێتەوە.

وەك لەپڕا نووکە دەرزیەك بە شوێنێکتا بکرێت مووچرکێك بەلـەشمـا گەڕا، وام هەست کرد لەبـەردەم مقـەلّـیەك پشکـۆدا دانـراوم و، تـنـۆکی ئارەقـەیش چزە لەپشکـۆکـان هەڵئەسێنێت، گەرمایە سووتێنەرەکە بەهەموو گیانما هات و کوڵاندمی. زۆر جار دەستم لەسـەر مەمکی دایکم دانـاوە، یان شەوانـە سەرو چاوم نوقمی سنگ و بەرۆکی کردوەو بەدەم بۆن و بەرامەیانەوە نوستووم، بەڵام هەرگیز ئەم هەستەیان لا دروست نەکردووم، گەرداوی مەتـرسـیەك بەتـەمای قووت دانم بوو، ئەم زانی ئەمە کارێکی نائاساییە، بۆیە کەوتمە گێژاوی شەرم و تاوانێکەوە کە نەم ئەزانی چاری چۆن ئەکـەیت ئەویش زیـاتـر خۆی پێـوە نووساندم و دەست ملم کرد، سەرمی بە سنگ و بەرۆکیەوە نووساندو پاشانیش چێکی قووڵی کردم. هەناسەی گەرم و پڕ لە ئارەزوویەکی سەرکێش بوو، من ماچەکانی دایکمم هاتەوە یاد کە هیچیـان ئەمـەنـدە تامەزرۆو بە کوڵ و دڵ نەبـوون.

کەزانی هەستی ترسێکی نامۆ بەڕوومەوە دیارە وتی:

- نەتـرسیت، ئەمـەیش یاریـە، وەك فاقـەنـانـەوەکەی تۆ منیش حەز، لە مە ئەکەم.

هێشتا هەر سەرسام و بێدەنگ بووم کە وتی:

- ئەمـە بۆ دایـك و باوکت نەگێـڕیتـەوە، ئەگینا ناهێڵم لەمەودوا فاقە نەبەر منەکەمندا بنیتەوە.

لە نێـوان ئەو هەڕەشـە گەورەیـەو سامی ئەوکـارە نائـاساییەدا گێـژاوێکی ڕامـان و سـەرسـامی لە خۆیـان گرتم. بەڵام ئەو نەی‌هێشت تەواو دنیـاکـەم لێ بئـالـۆزێ، جارێکی تر دەستی کردەوە ملم و بەخۆیەوە نووساندم، هەناسەی گەرم و ڕوومەتی ئەت ووت داخێکـەو بەسـەر دەم و چاوما نراوە، من هەر واق وڕماوە بێدەنگ و سەنگەکە بووم، تەنیا ئەوەندەم زانی کە پێی بڵێم:

- ئەی فاقەکەم؟

بەپەلە هەستاو سەری کێشایە دەرەوە، کە گەڕایەوە وتی:

- ئە فاقەکە تەقیوەو ئەهیچ پەلەوەرێکیشی لە دەورایە.

هەر بەپێوە کەمێك بیری کردەوە، پاشان کەوتە گەڕان، لەناو سنـدووقێکی تەنـەکـەدا توورەکـەیەکی سپی دەرهێنا، باسوق و هەنجیـری وشکی تیـا بوو، لەبـەر دەممـادانـا، من چاوم تێبـڕی، بەڵام دەستم بۆ نەبـردو بەشـەرمـەوە چوومـە دواوە، خۆی دانیشت و دەنکێـك لە هەنجیـرەکـەی بە دەممـەوە کرد، دەستیشی بەسـەرو ڕوومـا هێنـا، شەرمـەکـەم بووە تەمێکی سووکەڵەو زوو ڕەویەوە.

ئەم یاریە چەند جارێکی‌تر دووبارە بووەوە، من ئالوودەی بووم، بەڵام نەم ئەزانی خۆشیـەکـەی لە چیدایـە؛ باسـوق و هەنجیرەکە. ترسی قەدەغەکردنی فاقەنانەوە، یان شتێکی‌تر کە هەستی پێ‌ئەکەم و ناتوانم بیڵێم.

کە ـ کالێ ـ شووی‌کـردو دوای ماوەیـەك گەڕایـەوە ماڵی باوکی، لە پێـچی کۆڵانـەکـەدا بینیم، وەك مەڕێـك دوای خاوەنەکەی کەوتبێت ئاوا چوومە بەردەمی‌و وەستام، کە چاوی پێم کەوت سڵەمیـەوە، پاشـان بزەو نیگـایـەك و ئەنجـا چاوی تێبـڕیم، یەکـەمجـارم بوو کە ڕوانینە کەیم سەیرهاتە بەرچاو، چونکە لەچاو یا ئارەزوە سەرکێشەکەی جاران و گڕەشینەکە دیار نەبوون، تەواو لەچاوی دایکم ئەچوون. بەڵام هەر هەستێکی خۆش و بەتامیان بەمندا. نازانە سەرچوەکەی چی بوو؟ ئەشێ تامی باسوق و هەنجیرەکە بێت. یـا شتێ بێت کە تا ئێستایش

حز. .ر.نە چیە؟.

* * *

ئەمرو بۆ دواجار ڕێگام کەوتەوە دەورو بەری کۆلانەکە، دیسان لەشم بووەوە بە بزمارەکەی جاران و موگناتیسی خانووەکە بە کێشی کرد. ئەگەرچی وەك جارانی دی ئەمزانی ئەمە بێ هوودەییە، کەچی خۆم بۆ ڕاگیر نەکرا، هەنگاوی پەلەم نا تا وەك نێچیرێکی ماندوو گەیشتم، وەستان و ڕامان دوو دیمەنی نامۆ بوون و هەڵیان سڵەماندمەوە. وێنەکە گۆڕابوو، نەك تەنیا شوێنی تاقە خانووەکە، بەڵکوو سەرانسەری خانووی ئەمبەر ئەوبەری کۆلانەکەیش بێ شوێنەواربوون، وەك ماڵەیەك بەسەر چاڵ و چۆڵی و بەرزایی نزمی تۆپەڵە قوڕێکدا هاتبێت لەگەڵ زەویەکەدا یەکسان کرا بوون، چاوم هەڵخست، زەینی لەنوێ پشکوتوو زمانی ئارەزووی دەرکێشا، ویستم هەر هیچ نەبێت سنووری ئەو کۆنە یادگارە بدۆزمەوەو جیایبکەمەوە. کەچی وێنەکان لێڵ و تەماوی بوون، کە سەرێکی زیندوو بەناخما داچوری، ڕقێك. . پاشان سۆزێك جێگای گرتنەوە، دوو دڵۆپ فرمێسك ویستیان زەفەر بەناو چاوم بەرن، بەڵام بروسکەیەك تەرەی کردن، خانووەکان، کۆلانەکە، شیوەلۆکەکەی ئەودیو، باخە بەرەلاکە، شوێنەوارەو نبوەکان، هەموو بیوونە کۆشك و تەلاری ڕەنگالەیی و، باخاتێك گوڵەکانی دانسقەو چاوگەش بوون. من ڕێبوارێکی شەکەت بووم، بۆ حەسانەوە لامدا. لەبەر کۆشکێکدا وەستام، کچێکی تەواو پێگەیشتووی سوورکار سەری هێنایە دەرەوە پاشان هاتە سەر جەمسەری کۆلانەکە، هەر ئەت وت ـ کالێ ـ ی دایکیەتی. لەبەردەم کۆشکەکەی شوێن ماڵێکی تردا کورێکی گەنم ڕەنگی تازە هەڵچوو کە هەر لەخۆمی ئەکرد وەستابوو، بێئاگا کەوتبوونە چاو چاوێن و بزەو ئامـاژەکردن. کە منیان بینی نەسڵەمینەوەو نە شوێنەکەیان گۆڕی، دیمەنەکە تەواو حەساندمیەوە چونکە هەستم کرد هەموو شوێنەوارە کۆنەکان ئاوایان لێ دێتەوە.

١٩٨٤

* دیمەنێکە لە چیرۆکێکی درێژی تەواو نەکراو بەناوی (گەڕان بەدوای دیمەنە ونبوەکاندا)



عوسمان: زرنگ

«ـ ئەبوو نەواس، ئەبوو نەواس. . کەنار دیجلەو دارو درەختەکانی. . گازینۆیێك و جۆلانەو تۆو دۆستەکەت. . جریوەو جووکەو نەغمەی مەل و بولبولەکان. . ئەبوونەواس، ئۆخەی بۆ دەمەو عەسران و خۆرئاواو شەوتا درنگت. . پۆل پۆل و ، ووردوو هاتوچۆی خۆشەویستان و دۆست و دڵداران لەڕێرەوەکانت دا، لە پەنا درەختە باڵا بەرزەکان دا، لەسەر کورسییە لاکیشی [illegible]ەکان، لە ناو چیمەن و سەوزەگیاکەت دا. . . ئەی پەیکەرەکە؟. . [illegible]واوەندی مەیو خۆشیو رابواردنە!. . ئەو پێکەی دەستی، سەرچاوە[illegible] و کامەرانییە. . .

ئەو خانمەی دوێنێ پەیمانی پێدام ئێستا[illegible]و ئەبوونەواس کەوتوتە ڕێ. دەبێت منیش لە کاتی خۆیدا بیگەمێ. هەر لە جێگاکەی دوێنێمان دا دەنیشینەوە، لە گازینۆی (گۆمی‌شین). . بەزاتی خودا تا لەو گازینۆیە لە کەنار دیجلەدا، کە بای شەماڵ باری بە ئەگریجەو پەرچەمی دۆستەکەت دەکات: دەکەویتە سەر هەواو هەوەس و، گیانت دەبێت بە لانەی هەزاران خوتووکە. توخودا ژیانێك ئەگەر بە خۆشیو رابواردن نەیبەیتە سەر، چ نرخێکی هەیە؟. . هیچ ئەوە ناهێنێت بە شتی لاوەکییەوە خۆت ماندوو بکەیت. بخۆ، بخۆرەوە، بنۆشە، رابویرە. . ژیانت هەر جارێکەو دووبارە نابێتەوە:

تا ئێستــا هەشت جار بە ولاتـــانی دەرەوەدا گەڕاوم. لە تامی هەمـــوو جۆرە خۆشـی‌یـێـکـم چەشتـووە. . . خانمـــەکــەی دوێنێ. . ئای چ دەست بازێکـە!. . هەر ئیمـرۆ یە، ئیتـر لێی ناپرسمـەوە. من ئەو جۆرە ئافرەتانە وەکو کراس دەیان گۆڕم. . یان ڕۆژێك، یان دوو ڕۆژ لەگەڵیان دەبـم. وەك دەستـــووری کۆن. . باوی عەشق و عەشق بازیی دوورو درێـژ نەمـاوە. ئێستـا وشـەی خۆشـەویستی مانـای ڕابـواردنـە. لەگـەڵ خۆشەویستەکەت دا چەند جارێك ڕابوێرەو، ئیتر پێی‌بڵێ: بای بای.

ئای، وتەکانی خانمەکەی دوێنێ مێشکی تێك داوم:

- کەمـــال، ئەوەی شانـــازی بە ڕەگە و ڕیشــەیــەوە نەکـات، مرۆڤێکی سەربەرز نی‌یە!. . .

دەتوخودا وەرە ئافرەتێکی ڕەوشت نزم ئەم قسە زلانەت لەگەڵ دا بکات.

ئەو دێ بچکـۆلـەیـەی تا دەمی لاویـەتیم ژیـانم لە کووچـەو کۆڵانـە تەنگەبەرەکانی‌دا بەسەر برد. . هیچ خۆشی‌یێکم تێدا نەدی. ڕۆژەکانی ژیـانم بێ تام و نەگـۆڕ و وەك یەك بوون. دەئێستـا لەم شارە گەورەیەدا بە ئارەزووی خۆم دەژیم و، بە هەمـوو ئاواتێکی خۆم گەیشتـووم. خاوەنی قەمەرەی نوێ‌و خانوو و پارەی لە بانق دا نووستووم. . ئیتر بۆ دەبێت لێرە خۆم بە نامۆ بزانم! بە ئارەزووی خۆم ڕادەبوێرم و، کەسی پێم ناڵێت چی دەکـەیت؟. . لە کوێ‌وە هاتوویت؟. . لە شارێکی وا گەورەدا کەس بە کەســەوە نی‌یــە. . . . نازانم لە پێنـــاوی چی‌دا دەبێت شانـازی بە دێ سەدمـــاڵی یەکــمانەوە بکـەم؟. . هەر لەبـەر ئەوەی خەڵکی ئەوێم و، جێگای لە دایك بوونمە؟ خوا دەزانێت ئێستا ماوە، یان نەماوە؟. . پازدە ساڵـە بەجێم هێشتـ[illegible]وە. بەڵام لەگـەڵ ئەوەش دا وتـەکـانی خانمـەکەی دوێـنـێ بیـرو هۆ[illegible] و هەسـتـمی شلەقـانـدووە!. . . دەمێـــك بە ئەبـــوونـــەواس [illegible] دەدەیـت و. . . دەمێـــك یادی دێیـــە کەتـــان دەکـەیتـەوە!. . . . ڕاستـە ئەبـوونەواس شوێنێکی خۆشە. . بەڵام خۆ چەند جێ لەو خۆشتر و گرنگترت دیووە. . چ لە دەرەوەی ولات و چ لەم شارەش دا.»

- ئەهـا ئەهـا. . ئاگـات لە خۆت بێت، خەریك بوویت قەمەرەکەت بەو تەکسی‌یەدا بدەیت!. «چی‌بکەم لە دوێنێ‌وە خەیاڵم جەنجاڵ بووە!. . . وتەکانی ئافرەتەکە وەکو بنێشت بە مێشکم دا نووساوە!. . . »

لە دانیشتنـەکـەمـان دا باسی زۆر شتمان کرد لە دوایی‌دا وتی: من بە ناچـاریِ هاتوومەتە ئەم شارە. . زرووف و ڕۆژگار هێناومی! هەرچەندە ژیـانێکی تیـر و تەسـەلی تێدا بەسـەر دەبەم. . بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا هەر دڵـم بۆ ئەو شـوێـنـــە لێ دەدات و، ئاواتـــی بۆ دەخـــوازم کە تیـــای‌دا لەدایك بووم و، ژیانی منداڵیم بەسەر بردووە.

پێکـەنینم بە وتـەکانی هات. . پێم وت: «جا کە ئێرە بۆ تۆ باشترە. . ئیتـر بیـر لە شوێنی پێشـووت بۆ دەکەیتەوە؟!. . دەسا من ئەوە پانزە ساڵە لەو کوردەواری‌یــەدا دێیــەکـــەی خۆمـــانـم بەجێ هێشتـــووەو، هەر بەخـەیـاڵیشم دا نایـەت. . لە چاوی‌دا دیـار بوو بە سووکی پێکـەوە تێی ڕوانیم و، وتی: «درەخت بە بۆنـــەی ئەو زەوی‌یـەی کە ڕەگە و ڕیشـەی تێدا داکوتاوە. . خۆی ڕادەگرێت و، بەرەو ئاسـمان هەڵ دەچێت. ئەو مرۆڤـەی شانـازیی بە زەوی‌یـەکـەی‌و ڕەگ و ڕیشـەکەی خۆیەوە نەکات هەرگیز سەربەرز نی‌یە.»

ئەو تیـــر و توانجـــەی توورەی کردم. . خەریــك بووم بە ناشیـرینی وەڵامـی بدەمـــەوە. بەڵام داوای لێ‌بـــووردنی لێ کردم: «بم بوورە، ئەو وتەیە پەندێکە هەموو کەس دەی‌زانێت. . نەشم زانی تۆ وا پێت ناخۆش دەبێت. . ببوورە.»

«- لە دوێنێ وە مێشکم وروووژاوە!. . تۆ بڵێیت هەستی ئەو ئافـــرەتـە ڕەوشت نزمـــە لە هەستی من بەرزتـر بێت؟!. . . زۆر چاکـە. . ئەوا لە کاتی خۆی‌دا گەیشتمە گازینۆی (گۆمی شین). . ئاخۆ ژنەکە هاتبێت؟. . .»

- بەڵێ کاکی خاوەن گازینۆ، منم (کەمال)

- ببـوورە، ئەو خانمـەی‌دوێنێ لەگـەڵت دا بوو. . کەمێـك لەمـەوپێش داوای کرد ئەم نامەیەت بدەمێ‌و، خۆی ڕۆیشت.

«- دەبێت ئەم نامـــەیـــەی چی‌بێت؟!. . دەبـوایـە ئەمـرۆش پێکـەوە بووینایە، با تێرم لێی بخواردایە.»

- سوپاست دەکەم. . نامەکەم بدەرێ. . ئەرکت کێشا.

«بزانین خاتوون لە نامەکەی‌دا چی دەڵێت؟»

«. . . . نامـەوێت بێمـە ڕیزی پیاوێکی خاوەن بیر و باوەڕ نزم. . بۆیە لە ئێستا بەدواوە: بای بای.»

«- ئای لەم ژنە مەکر بازە. . لە دوێنێ‌وە چی پێ کردم!! دەڵێی لە داخ دا هەزار جنێوی بۆ بنێرم. . . نەء نەء. . ملی ڕیزی بۆ کەچ بکە:»

* * *

تێبینی:

ئەم چیرۆکەم لە ساڵی (١٩٨٨)دا نووسیوە.

# تریفه‌ خان

نووسینی : أحمد قادر سعید

بۆ تەماشام دەکەی؟ بۆ ئەوەندە لێم ورد دەبی‌یەوە؟ بۆ بەتاسەوە چاوەکانم لە ئامێزی دیدەت دەگری؟ چی وای لێکردووی بە بینینم هەنگاوەکانت کورت بکەیەوە؟ بۆ کە لێت نزیك دەبمەوە چاوەکانت ناترووکێنی؟ لە خۆم کەوتومەتە گومانەوە، دەبێ کارێك لە ئارادابێ



ومن هەستی پێ نەکەم، یان وێچوونێك نهێنی‌یەکی دروست کردووەو ئەو گرفتاری یەی ناوەتەوە. کە لە خۆشم رادەمێنم شتێکی نائاسایی بە دی ناکەم کەچی تۆ هەر جارە زیاتر لە دەریای مەندی رِوانیندا مەلە دەکەی‌و پەل بەولاو ئەولادا دەکوتی، مەگەر خۆم فریای هۆشت بکەوم باوەشی رزگارکردنت بۆ بکەمەوەو بتهێنمەوە ناو ژیانی ئاسایی‌و لە رۆخی رووباری هێمنی تەماشادا دانێم، هەر بۆیەش بریارم دا ئەوجارە ولێرەو بەدواوە بێ‌دڵیت نەکەم و رِوومت لێ‌وەرنەگێرم، وخۆمت بە گرژی نیشان نەدەم، وگرێی دەروونیەکانت بکەمەوەو بە هانای چاوتەوە بێم و لە ئاستی بینینت نزیکتر ببمەوە، تا هەر شوێنێکمت دەوێ‌و مەبەستە وێنەی بگری‌و لە ناو ئەلبوومی خەیاڵتدا هەڵیبگری، وەك یادگارێك بیپارێزی، جاربەجارێکیش رازی دڵتی بۆ بدرکێنی لە گەڵیدا پێ‌بکەنی، یان ئەشکی پەژارەی سینەتی بۆ هەڵرێژی، ئینجا سەر خەوێکی ئارام لە چاوی حەزەکانتدا بشکێنی، بەڵکو بۆ ساتێکی کەمیش بێ لەو خەوەدا ببیە پەپوولەی گوێ چەمی ئێوارانی بەهارو تەمەنێك لەخۆشیدا بژی یان ببیتە، ئاوازی ناسکی بلبلێك و پرچی شۆرە بی‌یەکان دابێنی.. یا گروگاڵی منداڵان و لە مەزاری ژیانی داهاتووتدا کامەرانی بچنی‌یەوە. لە من دڵنیا بە جارێکی دی روو وەرناگێرم، وئەو رۆژانەش کە بەمۆنی دەتبینیم تێەرین و ئاوا بوون، با ئەوەندەی دیکەشس دڵگران ونیگەرانی کارەساتی ناڵەباری سەردەم بم، با رەموزنەی زەمانە پێستم بگروێ، لە بەرامبەر چاوەکانی تۆدا دەتوێمەوە، بزەت لە روودا پەخشان دەکەم و پێ‌کەنینت پێ‌دەبەخشمەوە، خۆشی دەزێنمە دەروونە بێ‌گەردکەتەوە. راستە، زۆرداریم لەگەڵ دا کردووی، ودان بەو هەڵەیەدا دەنێم، بەر چاوتەنگ بووم، کەنەم دهێشت لە هەواری روومدا کۆتری پیرۆزی تەماشات هێلانە دامەزرێنێ، وسروە بای بە رووی تۆ فێنك لابدەم و[illegible]گەشتی ئاواتت بشیوێنم، بەڵام لێرەو بەدوا گرنگە، مەرج بێ رووم [illegible]کەمە باغی گوڵان و کام بەرامەی مەیلت بۆی دەبزوێ ئەویان [illegible]مزی‌و سی‌یەکانتی لێ پرکەی‌و لە سەوزەگیای مێرگی هە[illegible]ندا ئەسپی خۆش بەزی رِوانین تاو دەی تۆش ئەوکاتە بە ئازار دانم دڵ تەنگ مەبە بەزەییت پێمدا نەیەتەوە، بابشێلرێم.. دوا بریارمە دەبمە هەتوانی سارێژکەری برینانت، هەتوانێکی هەمیشە ساز.

× × ×

لەسەر بریاری خۆم وەك هەموو ئەوکاتانەی پێت دەگەیشتم گوڵە باغی چاوەکانم لە بەرامبەر رووی تینووتدا وەك دوو ئەستێرەی گەشی شەوێکی تاریك دەدرەوشانەوە، تۆش دیمەنەیەك لەدوای یەکەکانت دەکردنە هەوێنی رەوینەوەی خووناوی شەرم و بە بێ‌دەنگی لە ناختەوە دەگریای هەر نیسکەکانت گەواهی مەشخەڵی کڵپە سەندووی دەروونت بوون لە تێەربوونێکی سەرپێ‌یدا لە دەمم دەرچوو گوتم: «کەمێك ناساغم و لە ئازاری تێ‌گەراوە» ئەو قسەیەم لێت بوو بە ماخۆلیان و گیانتی تەنی.. سەرە رێ‌یەکت کردە روانگە.. بەدوای هەنگاوەکانمدا وێڵ بووی، لەو ساتەدا زریانێکی تووش بەرەو رووت هەڵیکرد، کەوتی‌بە گێژاوێکی کوشندەوە، هیچ جاران بەو جۆرە گیرۆدە نەبوو بووی، چاوەرێی دەستێکی بەزەیی‌خواز بووی لەو تەنگ وچەڵمەیە رزگارت بکات و بەرەو کەناری ئارامی بتبات.

وا جارێکی دیکەش شەقامەکەم لە هەنگاوەکانمدا پێچایەوە. لەشم لە تایەکی گەرمدا سوۆر هەڵگەراوە، رِوازەی ماوەیەك لێرەو پێشم لە روودا پەریوە، دوور نی‌یە ئەوەی ئێستا دەمبینێت هەستێکی دی برژێتە بیریەوە ئەی تۆ چی دەڵێ‌ی؟ خۆ لە جاران ناچم، ئەها وەك چەوەندەر سوور هەڵگەراوم، وکەسێکی دیکە دەنوێنم، ئەوەنیم کە لێرەو پێش وێنەی چاوەکانیت دەگرت و بەدوای بینینیدا وێڵ بووی. ئەوە بۆ واتێك چووی، بۆ بەو چەشنە فرمێسکان دەبارێنی‌و خۆت گرموڵە کردووە و لە دەروازەی تەماشاتدا ئەو هەموو پرسیارانە هەڵدەواسی؟ بۆ وا دەلەرزی؟ تەمای چیتە بی‌لێ‌ی؟ ئەو هەموو سەرسورمانە چی‌یە، دەتەوێ لەسەر خوانی تێبینی‌دا دایان نێ‌ی، خۆزگە کە بە هەڵەشدا دەچووم کەمێك لەو نیشانانەم دەخوێندەوە وهەندێك راستیم دەپێکا، یان پەیم بەو شتە بردبا کە ئەو هەموو هەراسانی‌یەی لە گیانت بەرداوە، دەتۆ شتێك بە گوێمدا بچرپێنە با چۆلەکەی حەزم لە بەیانی وەڵامت دا بجریوێنێ، لەو خەوی سەرسامی‌یەم خەبەرم بکاتەوەو بۆ کاتێکی کەم گوێ بۆ ئەو ئاوازە خۆشە شل کەم و دەستەملانی ئومێدی دڵنەوایت بم. چ دەبێ تا ئەو کاتەی تۆ بە لواوی دەزانی لە ناو ئەو چوار دەوری قەفەزی بێ دەنگی‌یەدا بەندم نەکەی؟ دەبا باری سەرشانم کەمێك سووك بێ، چی دی لەناو گۆمی خۆ لەبیرچوونەوەدا سەر لێ‌شێواو مەلەنەکەم، بۆ وا دەمت هەتا لە ئاقاری تاکە وشەیەکدا بەو جۆرە کڵۆم دراوە. تۆ پێت وانەبێ بە پسانی سندمی دوو دڵی‌و رەهاکردنی بیرم تاوانێك دەکەیت و شوێنەکەی سارێژ نابێ وخەوشی شوێنەواری بەجێ دەمێنێ. چەند حەزم دەکرد بمتوانیبایە بەشێکی ئەو سەرنجانەتم گرد بکردایەوەو لە ئامێزمدا وەك بەرخۆڵەیەکی ساوا رامبژاندایەو دەستی بەزەییم بە سەریدا بهێنایە، دەی تریفە خان، دەزانم ئێستا لە بوونی مندا تواویتەوەو وەك چرۆی گیابەندی زۆزان بە بەفراوی کانیاوی قەدپاڵی چیاو تیشکی زێرینی خۆر دەپشکوێنی بەڵام دەترسم تەمەنی‌بوونە گوڵم هێندەکەم بێ‌بۆن و بەرامەم لە سنووری خۆم

هەنگاوێك دوور نەكەوێتەوە و لەگەڵ باڵورەی كیژانی هەواران ئاشنا نەبێ. توش وەك جوانیكی بەرزەفـر، بەشـۆخی خۆت بنـازیو ئەویادانـەش لە فەرهـەنگی فەرامۆشیـدا نیشـانەی چەوتیان بەسەردا بێنیو بە پەردەیـەكی رەش دایـان پۆشێ. ئەو سەردەمـانـەم لە یادە كە لاوێكی رووح سووك و دەم بەپێكەنین و لێك و لەبار بووم، لەگەڵ ئەوەشـدا كە دەردی گیـرفـان بەتـاڵی دەردێكی كوشندە بوو و هەمیشە لەگەڵمدا بوو، بەڵام هەر جوانكیلە وخاوێن دەمنواند. كیژێك فێری خۆشـەویستی كردم، تێی گەیـانـدم دڵبـردن و ژان و دەردەسـەری چین. دڵی لێستـانـدم. بێئـامـانیم لێبـوو بە پیشـە لە ئەوینیدا توامـەوە، كارم لە كار ترازا. وەك سەرگـەد، انیكی بێهـۆش دڵم هەمیشە لەمستی ئەودا بوو. گەلێك جاران دەردەژانی شەوانی ئەوینی فرمێسكی بێهوودەیی پێ هەڵدەوەراندم. یان پێدەكەنیم و ئاواتەكانم لەسـەر پەردەی یادە ئاسكەكـانی دەكـەوتنـە سەمـا، شایییان دەكردە ملوانكـەی دوا رۆژی روون. كەچی هەزار ئەفسـوس، لێم تۆراو خۆرایی كردم و گەلێك كارەساتی تاڵی پێچەشتم، ئێستاش گەلێك جاران بێزارو شێت گیرم، هەرمیراتی ئەو سەردەمەیە بۆم بەجێ ماوە ولە كوڵم نابێتەوە، دەستم بە پۆلوسووتاوەو ماران گازم و لە خشپەیان دەسڵەممەوە. هەروا ئاشنایەكیش جارێكی دی ویستی لەو شیرینە تاڵاوەم پێ نۆش بكات، هەر زوو خۆم لێهەڵبوارد، دەمزانی دەردەكە هەر سەرێكەو بۆ ئەو سارێژ دەبێو هەناسە سواری‌یەكەش لە دواییدا بۆ من بەجێ دەمێنێ ودەبێ بناڵێنم و بتلێمەوە. یادی بەخێر ئەو شۆرە كیژەی دەیویست هاوسەری ژیانم بێ، برێك جاران، لەگەڵ هاژەی بەخـوری رووبـاری قەراغ ئەو دێیـەی لێی دەژی، جارجـارە لە پێشەنگی رەشەبادا هەواڵی بەهەشتی لەدەست چوویم دێنێتەوە یاد پێی وایە لێی ون نابم. یادەكان بە ئاونگی سبەینان گوڵاوپژێن دەكەم. دەبێـرە دەنـگە تەنهـا وشـەیـەك گەوەی زنجیری باسەكەم بۆ دەخاتەوە سەریەك و لەو دەریای بێئارامی چاوەڕوانی‌یەم دەرم دەهاوێ ودەتوانم هەوایەكی پاك هەڵمژم.

چرپەیەك بە ئەستەم وشەكانم بۆخرانەوە سەریەك، هێندەی دیكە لە گێـژاوی سەرگـەردانیدا لوولی دام، مەبـەستم لێبـوو بە قوللەی قاف و سەركـەوتنم بۆ نەكـرا، زۆر سەری خۆم هێنـاو برد نەمتـوانی هەنگـاو هەڵێنمـەوە. سروەی چرپـە وشـەكـان بوون دوو سێ مەلی لەرەوە دابـراوی پەرت بوو، بێهیـوا لە شەقـەی باڵیـان دا، هانایان دەبردە بەر بۆشایی ئاسمانی توف و رێگا دۆزینەوە دەگەران. بارانی بەخـوری ئەو بیـرانـەم بە لێـزمە دەباری كە پشووی شەماڵێكی سارد گرژی كردم و بەبێ ئاگا هاتمە گۆ: « بۆچی نەخۆش نەبم! جا سوێند خواردنی پێ دەوێ. ئەوا بەسـەردا هاتـووە، وەك هەمـوو كەسێكی ئاسایی لەشی منیش ماندوو دەبێ، برێك جارانیش پەكی دەكەوێ، كە رەنـگـە چاكـیش نەبێتـەوە.. ئەدی كە مردم چی دەبێت، بۆچی دوای من عێـل گەرمێن و كوێستـان ناكـات؟! ئەوەشیـان خەمێكی نوێتـرە.. ئەو ریسـەی لێـرەو پێشیش رستبـووم لێم بۆوە بە خوری، سەر باسەكەم بەتەواوی لێ ئاڵۆز بۆوە..»

خەیـاڵم لەبنـاری قسـە بەچرپـەكـانـدا وەستـا.. هەرزوو بوونـە كۆرپەیەكی ساواو سەریان بە سنگمەوە نا، تاس لە حەژمەتان تەكانی پێدام، بۆ ناو جیهانی ئەفسووناویو پڕ لە بزێوو سۆزی منداڵان، گلۆر بوومەوە، لە خەیاڵی ئاشنادا توامەوە، ئەو قسانەم هاتنەوە بەر دیـردە خەیـاڵ كەجـاران بۆیم دەنـووسی یان لە دانیشتن دا لەگەڵمدا دەكرد، بێئاگا دەستم پێكرد:

« ئاشنـا گیـان، دڵم تەنهـا بەرووی فریشتـەییت دەكـرێتـەوە، لە روانگەی جوانی تۆیە سەیری ئاسۆم لەبەیانیاندا لاپیرۆزە، ئێواران، كە خۆر گەردنی بەدەمی كەڵـەوە دەنێت، تامی رامـووسینی گونـات دەكـەم، شەوانی هاوین كە ئەستێـرەكـان لە تاریكیدا دەچـریـوێنن، قژی رەش و برۆی كەوان و چاوی گەلاوێـژت سڵاوی دێـریـن دەبارێنن.. هاژەی رووباری قەرداغ شار نزرگای ئێوارە گەشتەكان، هاوارن، گوێی بێگـوێیـان ئاگـادار دەكـەن دەیـان خەنـەكەوانەوە، گەورەیی خۆشەویستی من دەسەلمێنن..»

تیشكی تیژی بینینی تریفە خان هێنامی‌یەوە كەنار رەفتارەكانی، دەستم كردەوە بە گەران بەونیـازەی بتـوانم خاڵێكی دەربـاز بوون ببینمـەوەو ئاشكـرا تر لەگـەڵ خۆمـدا كەوتمـەوە دوان.. «چی وای لێكـردی ئەوەندە بۆ من بە پەرۆش بیو بە تەنگە تەندروستیمەوە بێت، ئەدی نازانی لە یاسایی سروشت دا، نەخۆش بوون كارێكی ئاسایی‌یەو لە توانای مرۆڤ بەدەرە رەنگە تەواو رقت لە نەخۆشی ببێتەوە، بەتایبەتی كە دەبینی من بە دەستی‌یەوە كەسیرم و رەنگمی گۆڕیوە، بۆیە هەر هەمـان پەتـاش لەشی تۆ دەگـرێتـەوە، [illegible] خۆ ئێمە، نە دووكەسی دوانەین و نە لەگەڵ یەكتریش هاوتەمەن[illegible] خۆشی وناخۆشیو هەسـت وسـۆزو زیـرەكـیو كەودەنی‌دا چوون یەك بین وە لەگـەڵ دایكیشتدا، ئەو پەیوەندی‌یەمان نەبووە پاشماوەكەی بۆ تۆ بەجێ مابێ، بتەوێ رێزی بگرێو وەفای لەگەڵ بنوێنی..»

«دایكت ، ئافرەتێكی بە خۆوەی باڵابڵندی گەردن كێلی، گەنم رەنگ بوو، بە ئارەزووی خۆی باوكتی هەڵبژاردبوو، لەگەڵیدا ببوو بە هاوسـەرو ژیـانێكی نیـوە ئاسـایی‌یان بەسـەر دەبرد، ساڵانی كورتی پێكەوە بوونیان فێریكرد كۆشی ناز بۆ خێزانەكەی بكاتەوە، دوانزدە ساڵان لە ئاسوودەییدا ژیان، بەڵام كۆچی دوایی لە ناكاوی ژیانی هەمـووتـانی شێـوانـد، دنیـای روونتـانی كردە شەوە زەنگ باوكت و

شەشی منداڵی سەروپێچکی دایە دەست کارەساتی گەردوون و باوەشی نازیان لێ ساردبوو، تۆ بچووکترینیان بووی.

تۆ بچوکترینیان بووی، تەمەنت چرۆی تازەی سەرەتای بەهار بوو. . ڕەش و سپیت بۆ لەیەکتری جیا نەدەکرایەوە. . باوکت باڵی بە سەرتان دا کێشاو نازی ڕاگرتن و مەچەکی پەروەردە کردنتانی لێ هەڵماڵی، شانی دایە بەر بەخێوکردنتان، لە پاڵ غەمێکی مەزن دا ئێوەی گەورە کرد، چاوەڕوانی گزنگی خۆری ئاسوودەیی بوو، زەنگی ڕێکردنی کاروان لە گوێی‌دا دەنگی دایەوە، خۆی ئامادەکردو کەوتە بارگە هەڵبەستن، زۆری نەبرد بوو بە هاوەڵ و سەردەستەی کاروانچییان، بەرەو خۆر پشتی لە تاریکی کرد، ئازارەکانی کردنە توێشوو، بە هەنگاوی گەڵێك خێرا ڕێگاکانی دەبری. . بە ئاوازی شنەی شەماڵ لاوکی نوێ بوونەوەی بەهاری دەچری. . کاروان دەئاژوا ئەویش زیاتر لە ناو ئومێدا قاڵ دەبۆوە، ناڵەکاوێکدا گلا، هەڵ نەستایەوە، لە کاروان دابرا. . سەر گوزشتەی بوو بەوێردی دەمی منداڵانی سەر دەم.»

هاتمەوە بەردەم ئاوێنەی خەیاڵ، تریفە وێنەی دەم وچاومی دەگرت، منداڵەکانی دیکەش لەبەر دەمم دا هەڵدەبەزینەوە، لێیان وردبوومەوە، دوانیان کەمێك گەورە ببوون، لە بەر دەمم دا گرد بوونەوە، لە دەورم ئاڵان، پێمدا هەڵزنان، خۆیان پێمدا هەڵواسی، دەستیان بە گەمە لەگەڵ کردنم کرد، . . منیش هێمنانە بە دەنگیانەوە هاتم، هەڵماقوم لەگەڵیاندا کرد، کە پرۆکەم بۆ دروست کردن، وبووکە شووشەکەیانم شووشت و وشکم کردەوە، بڕیارم دا شەوانە بیان نوێنم، پێش خەوتنیان چیرۆکی خۆشیان بۆ بگێڕمەوەو شەوانەش هەرکە دەرکەوتن دایان پۆشمەوە وکوڵمە ئاڵەکانیان بە ئاسوقەوە ماچ بکەم و دەستی دڵ نەوایییان بەسەر دابهێنم. .

ئەوا خەریکە دەروازە[illegible] ئاسوودەییم لە ڕوودا والا دەبێ، ڕەنگە تریفە خان شتێك لە ئاشک[illegible]ا بوونی ئەو نهێنی‌یە لەگەڵ خۆیدا بهێنێ کە تا ئێستا بەسەر دەمیدا [illegible]اتووە، بە بێ باکی بەرێگادا دێم و بە ڕووێکی لە جاران [illegible]ردەچەرخێم با هەر چاو نەترووکێنێ، نزیکتر بەلایدا تێدەپەرم [illegible] دەبێ ئەو گۆمی مەندی بێ‌دەنگی‌یەیە بشلەقێنم قسەیەك بکەمە هەوێنی ڕەوینەوەی ترس چاکتر هاتمە پێشەوە خۆم دەست پێشکەریم کرد:

- تریفە خان. .
- بەڵێ . . فەرموو. .
- بۆچی وا هەڵوەدا بوووی؟
- ئەگەر ڕووتم لێ‌وەربگێری زۆرداریم لەگەڵ دا دەکەی. .
- بۆ؟ دەتیم بگەیەنە بۆ؟!.
- کاکە ناتوانم، تەماشات نەکەم.

جارێکی دیکە فرمێسکەکانی هاویشتمیانەوە، ناو دەریای خۆ لە بیر چوونەوە، سەرەداوی باسەکەم لێ ئاڵۆز بووە، لە گێژاوی ئەو چەند قسانەدا لول درام، هەر هەنێکێکی گەشتیکی سەرگەردانی نیشان دەدا، خۆم کردە چنارێکی بڵندی ڕۆخی رووبارێکی بەخوور، تا لەگەڵ نەرمە باشدا گەڵاکانم بلەرێنەوەو سەرنجی ڕوانین بخەمڵێنێ، لە هێلانەی ئارامیدا چاولێك بنێ. . نەم دەتوانی ئەوە نەکەم، ئەوەندە ئالوودەم ببوو بە چرکەیەك خۆلادان ڕۆژی ڕووناکی لێ‌دەبوو بە شەوە زەنگ، بۆیە ئەو دەردە بە تەوژمە پاڵی پێوەنا ئەو جارە خۆی بێتە دوان:

- کاکە، ئێوارەتان باش
- ژیانت باش، تریفە خان، ئێستا چۆنی. .
- تا تۆم هەبێ، هەموو دنیا بە هی خۆم دەزانم. .
- ئەدی کە من نەمام؟
- خوا نە خواستە، شتی وا مەڵێ ، بەڕاستی جەرگت بڕیم، چۆن دڵت هات شتی وا بڵێیت؟
- ئەدی نابێ، بزانم، بۆ وا نەڵێم؟
- واتە جارێکی دیکەش بابم دەمرێ ئەدی نازانی ئەتۆ لەجێی دایك و باوکمانی؟
- ئەوە بەڕاستی وا دەڵێ‌ی؟
- خۆ من بابم بە باشی نەدیوە، ئەوە دایکیشم هەر هیچ بەڵام دەڵێن ئێوە هەر ناوتان لەیەکتری جیایە، دەنا زۆر لەیەکتەری دەچن. . تۆ تامی باوکم دەدەی، بۆنی ئەوت لێ‌دێ

ئەو کاتە سەر تاپای گیان تەزی، ماڵ ئاواییم کردو سەر کۆڵانەکەم بەجێ هێشت، بەرەو ماڵ تێنم دایە هەنگاوەکانم، بەسەر ڕووداکەوتم بێ‌ئاگا لە دنیای ئەو شەوە دەیان دیمەنی سامان لە بەرامبەرم کەوتنە سەما، خەو لە چاوانم زڕا بۆ بێ‌ئاگایی خۆم بەکوڵ گریا م نەم دەزانی بەرەو کوێ مل نێم، دەیان پرسیار لەبەردەمم دا قووت بوونەوەووێڵی دوا وەڵام بووم، هەستامە سەرپێ، بەرامبەر ئاوێنەی قەدی دیوارەکە وەستام و لە خۆم ڕامام:

«سامان پیاوێکی دەستەی چاوو برۆ ڕەش بوو، لە ڕواژەیدا ئومێدی پاشە ڕۆژێکی گەش دەبینرا، سەر بڵندو چاو نەترس و بێ‌دەنگ و کەم جەفەنگ بوو، هەمیشە لەدیوی ناوەوەی خۆیدا دەکولا کاری کرد بۆسەر هەڵس وکەوتی هەتا گفتو گۆشی. .

ئاوێنەم بەجێ هێشت، خۆم لە دنیای سامان قوتار کرد، بەرامبەر ئەو هەورانەی لە قەدی چیاکە ئاڵابوون ڕاوەستام، گرێ کوێرەکانی دەروونم لێك ترازان، هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا، چاکتر جێگای باوکیانم گرتەوە، سۆزم کردە هەوێنی خۆشەویستی‌یەکی باوکانەی ڕاست، بوومە باوك، بووشمە دایك، تا مەلی ماندووی‌ساڵانی چاوەڕوانی تریفە خان لەناو هێلانەی ئارامیدا ئاسوودە بنوێ.

# هه‌وره‌ ره‌شی هه‌زارچاو

چیروٚكی: عه‌لی ئه‌شره‌ف ده‌رویشیان.

وه‌رگێرانی: رێبوار حه‌مه‌ ئه‌مین سیوه‌یلی سلیمانی ٩٨٤

. . . [ «عه‌لی ئه‌شره‌ف ده‌رویشیان»:

كوردێكی كرماشـانی‌یـه‌، به‌ زمـانی فارسی ئه‌نـووسێ‌و یه‌كێكه‌ له‌چیروٚك نووسه‌ ده‌ست رۆیشتووه‌كانی جیهانی چیروٚك له‌وڵاتی ئێران دا . . .

به‌زۆری بوٚمنـدالاّن ئه‌نـووسێ‌و له‌و بواره‌شـدا، جێ ده‌ستی به‌ ئه‌ده‌بی منـدالاّن ئێرانـه‌وه‌ دیـاره‌. . گه‌لێـك نه‌هـامه‌تی‌و ئه‌شكه‌نجه‌ی چێشتووه‌و گه‌لێك (ئامێری) سزادانی پێ تاقی كراوه‌ته‌وه‌. ئێستاش، له‌یه‌كێك له‌ زیندانه‌كانی ئێراندایه‌]

. . یه‌كێ بوو، یه‌كێـك نه‌بـوو، جارێـك له‌ جاران (رۆژخان) هێواش . . هێواش به‌ئاسمانی بێگه‌ردا ئه‌رۆیی‌و تیشكـه‌ زێـرینـه‌كـه‌ی به‌سـه‌ر زه‌ویـدا په‌خش ده‌كـرد. چیـا به‌رزه‌كـان، له‌دووره‌وه‌ سه‌ری سپی‌یـان بوٚ رۆژ داخستبـو بریقه‌یان ئه‌دایه‌وه‌. سه‌وزه‌گیاو دره‌خته‌كان ده‌ستیان به‌ پرچی رۆژخـانـدا ده‌هێنـا. گوڵـه‌ ره‌نگاو ره‌نگـه‌كـان تاڵـه‌ مووه‌ ئاڵتـونی‌یـه‌كـانی رۆژخـانیـان ماچ ئه‌كـرد. باڵنـده‌ ده‌نگ خوٚشه‌كان گوٚرانیان بوٚ رۆژخان ده‌گوت:

**. . . ئه‌ی رۆژه‌ خان، ئه‌ی رۆژه‌ خان. .**
**هه‌ركات كه‌ دێی ئێمه‌ گوٚرانیت بوٚ ئه‌ڵێین.**
**به‌ خێر هاتی، به‌ خێر هاتی،**
**بوٚ هێلانه‌ گچكه‌كانی سه‌ر رووی زه‌مین. .**
**بوٚ شاخه‌كان، بوٚ كێوه‌كان،**
**بوٚ بیابان و ده‌شته‌كان. . .**
**فه‌رموو فه‌رموو.**

چه‌نـد كارئـاسكێكی وردیله‌ ب[illegible]ینـایی یـه‌كـه‌دا. ئه‌هاتن و باز بازێنیان بوو. یه‌كێك له‌ كاره‌كان زوٚر زیته‌ڵه‌و زیره‌ك بوو، ده‌یویست خوٚی له‌ جێگایه‌ك قایم كات كه‌س نه‌یـدوٚزێتـه‌وه‌، ئاوا رۆیی، بێ‌ئـاگـا له‌ هاورێكـانی‌ده‌ابرا، هه‌رچـه‌نـد ته‌مـاشای ئه‌و ده‌وروبه‌ره‌ی كرد كه‌سی نه‌بینی. ناچار به‌ره‌و باخه‌ دووره‌كه‌ی لێوه‌ی دیار بوو كه‌وته‌ رێ.

. . . هه‌ر رۆیشت، رۆیشت تا گه‌یشته‌ باخه‌كه‌، باخێكی گه‌وره‌ بوودره‌ختی ته‌مـه‌ن هه‌زار ساڵ ده‌وریـان گرتبـوو، باخه‌كه‌ی لا ئاشنابوو، هاته‌وه‌ یادی به‌ منداڵی له‌گه‌ڵ باوكیا

له ترسی گورگه درندەکان هاتبونه ئێره. ئاسکه بچوکی ئێمه له سەرەتاوه کەمێك ترسا، بەڵام به خۆی گوت: ـ با بچمه ناوەوه، بزانم چی ئەبێ.

... چووه ناو باخـەکـه، به پێچـەوانـەی باخـەکانی ترەوه ئەوێ تاریك بوو! سەرانسەری ئاسمانی هەوری ڕەش باڵی بەسەرا کێشابوو، ئاسکه چکۆل که به باشی وردبۆوه پەڵه هەورێکی گەورەی له شێـوەی ئاژەڵێکی ڕەشـدا بەرچـاو کەوت، که بەهـەزاران چاوی مۆن و تووڕەییـەوه تەمـاشـای دەکرد. ئاسکه لەترسان سەری داخست و کەوته ڕێ...

باخێکی خامۆش و کپ بوو. نەچرپەیەك، نەسەمایەك، نەبگـرەو بەردەی ژیـان، دەتگـوت هەرچی یەکی تێـدایـه مردوون!. تەنهـا جارجـارێـك دەنگی گریـان له گۆشـەو کەنـارەکـانـەوه دەهـات، که به باشی گوێی ڕادەهێشت و تەمـاشـای دەورو بەری خۆی کرد، گوڵاڵـه سورەیـەکی بەر چاو کەوت سەری داخستووەو گریان و هاوار هاواری‌یەتی‌و دەیوت:ـ

ـ خۆشەویسته بچکۆلەکەم کۆر پەلەکەم بۆ چوی بۆ شەڕی هەورەڕەش؟ بۆ ئاوا منت زامدار کرد؟ خۆشەویستم... نازدارەکەم..

... ئاسکه چکۆل دڵی پڕبوو. چووه پێشەوه سەلامی له گوڵه سووره کردو گوتی:

ـ گوڵه خان، بۆچی ئەگری؟.

گوڵاڵـه سوورەکـه سەری بەرزکـردەوه، دڵـۆپـه فرمێسکـەکـانی لەسەر رووە سوورەکـەی بوون تکـانه سەر لێـواره ڕەشـەکـەی داوێنی، هەنـاسـەیـەکی هەڵکێشـا. ئەشکەکانی پاك ک[illegible]ەو گوتی:

ـ ئەی ئاسکـه چک[illegible] باخـەکـەمـان نابینی ئەڵێی شەوی تاریکه؟ مەگەر ئەو دێوه ڕەشەی ئاسمان نابینی که ڕۆژی زینـدانی کردووه؟ ئەوه ساڵـەهـای ساڵـه ئەم باخـەی ئێمـه هەتـاوی بەرنـەکـەوتـووه، هەنـدێك به تاریکی ڕاهاتوون، منـداڵـەکـانمـان وادەزانن که ژیان هەر بەم جۆرەیه. بەڵام لەوەکان که له ڕۆژانی منداڵیانا لەبەر هەتاودا یاری‌یان ئەکردو ئەویش به پەنجه زێرینه کانی ختوکەی ئەدان، تائێستاش ڕۆژ خانیان لەیاد نەچووه، کورەکەی منیش یەکێك بوو ئا لەوانه که لەگەڵ کوڕی مام کیسەڵ و کچی گوڵه بەرۆژەدا هەرسێـکیـان بەرەو شەڕی دیـوەڕەش چوون، ئەوان بەیـانی‌یـەك لەسـەر باڵی «بـا» که دوژمنی هەورەڕەشـه دانیـشتن و ڕۆیشتن و ڕۆیشتن... هەوره ڕەش بەسـەی زانی‌و پێکـەنی‌و قیـرانـدی.. شمشێـرەکـەی هەڵکێشاو ئیتر لەوەدوا منداڵەکانمان نەگەڕانەوه.. گوڵاڵه سووره ئا لێرەدا خۆی پێ نەگیـراو کەوتـەوه هاوارو گریـان، دەنگی ئاهـ و ناڵەی ئەو ناوەی پڕ کرد!

... مام کیسەڵ سەری بردەوه قاوغەکەی‌و گریا.

... گوڵـه بەرۆژەش سەری داخست و گریـا. «بـا»ش به هێواشی خۆی پەنای شاخ و دارەکان داوِ ویزه ویز.

... ئاسکـه چکـۆڵیش زۆر غەمبـار بوو، بۆیـه دەستی بەگریان کرد. لەم کاتەدا گوڵه وەنەوشەیەکی کورتەباڵا که دەم و چاوێـکـی خڕو بەرچـەمی ڕەش و درێـژی هەبـوو بەخەندەوه گوتی:

... دیسانەوه دەستان کردەوه بەگریان و ناڵەناڵ؟ له جێی ئەم کارانه هەستن و شتێ بکەن. لەگریان و کروزانەوه چی به بەرهـەم دێ؟ منیش هەروەك ئێـوەم، بەڵام هیـچ کات گریـان بەرێی ڕزگـاربـوون نازانم. وابیـر ئەکـەنـەوه که هەورەڕەش ڕقـی هەڵـدەستێ، ئەو ئێستـا کەیفی سازه که ئێمه دەگرین!.

* * *

... شەوێ ئاسمـان تاریـك تربـوو. ئاسکـه چکـۆل له پەنای درەختێکی کۆنه ساڵدا پاڵێ دابووەوەو له بیرکردنەوەدا نقـوم بوو بوو، ئەو شەوە هیـچ خەفـەتی نەخـوارد. بیـری کردەوەو بیـری کردەوه بۆی دەرکـەوت گریـان و گۆشەگیری‌و هیچ نەخواردن سوودێکی نی‌یه. بەخۆی گوت:

ـ دەبێ کارێك بکەم. وەنەوشەخان ڕاست ئەکات، واچاکه بەیـانی چاوم پێی بکـەوێ‌و قسـەی لەگـەڵ بکەم، تا بزانم ئەوەی دەیگـوت هەر قسـەن یان بەراستی ئەیـەوێت شتێك بکـات کازیـوەی بەیـانی‌بـوو که ئاسکـه چکـۆل له دەنگی کەڵەشێره سووری باخەکه به خەبەر هات.

... کەڵەشێره سوور به دەنگێکی بەرز دەیخوێند:

**یادی هەتاو هەر بژی.**
**هەتاوی سووری ژیان به خش،**
**هەتا ئەمرۆش دیل و بەندی هەورەڕەشه.**

بەلام،
با بە یادی ئەوەوە،
(ژیان) دەست پێ بکەینەوە.

... ئاسکە چکۆل ڕاست بۆوە، چووە لای ئەو درەختەی کەڵەشێرە سووری لە سەر وەستابوو. سەلامی لێ کردو گوتی:

- چی رووی داوە! ڕۆژ لە قەفەسی هەورەرەشدا زیندانە، ئیتر گۆرانی چی بۆ ئەڵێی؟.

... کەڵەشێر سەری خوار کردەوەو گوتی:

- من ساڵەهای ساڵ پەیامبەری ڕۆژ بووم و هەواڵی هەڵهاتنی ئەوم دەگەیاند، ئێستاکە لە زیندانی هەورەرەشدا دیل کراوە نابی بهێڵم بە بیرەوەری‌یەکان نامۆبێ‌و یادی نەکرێ. ئەم کارە بۆیە ئەکەم کە هەمووان لە بیری ڕۆژدابن. ئەگەرچی خەریکە گەروم بریندار دەبێ، بەلام خۆشحاڵم کە نەهێڵم ئەوانی تریش لە یادیان بچێ. من وەکو بولبول نیم هەر لەبەیانی تا ئێوارێ لەناو ئەم تاریکی‌یەدا گۆرانی بۆ گوڵێکی سیس بوو ئەڵێ کە لەو گۆشەیەدایە، سەری داخستووەو لێرەو لەوێ دەنیشێ‌و دەیەوێت بە شیعرە بێ ئومێدەکانی دڵی خەڵکی باخ ڕاکێشێ.

... لەم شوێنەدا، بولبول کە ناوی خۆی وانابوو گوڵە لە سەر درەختێکی ترەوە دەستی بە خوێندن کرد:-

... ئەی گوڵە جوانەکەی من،
پرچەکانت بە شانەی ئەڵماس دابێنە
بە ڕاست، تۆ لەم تاریکایی‌یەدا چ ڕەنگێکی؟
ئای.. دڵۆپە ئارەقەکانی ڕووت
چەندە بە جوانی دانیشتوون...

دوایی بولبول لەم چڵەوە فڕیە ئەوچڵ ڕووی کردە دانیشتوانی باخ و خوێندی:

شکا، شکا.
تاریکی، تاریکی.
ئێمە مردوین،
ئیتر کەس هەڵناستێتەوە..
ئیتر ڕۆژ ناگەڕێتەوە..
ئەی مردووە بێ کفنەکان
خواتان لەگەڵ... خواتان لەگەڵ....

... ئاسکە چکۆل بەکردەوەی بولبولەکە پێکەنینی هات، چووە نزیك بولبولەکەوەو گوتی:

- ئەم قسانە چین؟ شێت بوی؟ قسەیەك بکە ئێمەش لێی تێگەین. بولبول لەوکاتەدا چاوی خۆی بەستن و دەفتەری شیعرەکانی کە لەگەڵا سێو درووستی کردبوو، پەرە پەرەی ئەکرد، لەژێر چاوەوە تەماشایەکی ئاسکەکەی کردو گوتی:

- تۆ تێناگەی، من شیعر بۆ دڵی خۆم ئەڵێم.

ئاسکە چکۆل گوتی:

- ئەی باشە بۆ ڕوو لە باخ دەکەی‌و شیعر دەخوێنی‌یەوە؟ باشتر وایە بچیتەوە هێلانەکەی خۆت و، شیعر بۆخۆت بخوێنی‌یەوە.

بولبول گوتی:

- ئیتر ئەوە پەیوەندی بەتۆوە نی‌یە.

فڕی‌و چووە لای گوڵێکی سیس بوی تر.

... لەم کاتەدا بایەقوشێکی پیری چاویلکە لەچاو لەسەر پەرژینی باخەکەوە فڕی‌و نزیك بۆوە، لە کاتێکدا قاقا پێ‌ئەکەنی گوتی:

- تەماشاکەن شاعیر چی دەڵێ. ئێستا گوێ‌گرن با شیعرتان بۆ بخوێنمەوە. لە کاتێکدا کە زنجیری سەعاتە ئالتونی‌یەکەی سەر سکە گەورەکەی ئەملاو لا پێ دەکردو چاویلکەکانی ڕێك ئەخستن دەفتەری شیعرەکانی کە لە گەڵا چنار دروست کرابوو دەرهێناو دەستی بە خوێندنەوە کرد.



بە گڵ و خوڵی بیابان قەسەم
بە ڕیش و سەبیل گەورەکان قەسەم
سوێند بە خەیاری پێ نەگەیو بێت
بە بالای بەرزی باینجان قەسەم
ئەم وێرانەیەم تا ئەبەد لا خۆشە
بە چۆراوگەی ئەشکی هەتیوان قەسەم..

... دارە بێ‌یەکی ڕزیو لەولاوە سەرێکی ڕاوەشاند. لە خاڵێکدا جیرە چیرەی لێوە دەهات گوتی:

- چاکە.. چاکە..

... ئاسکە چکۆل پێکەنینەکەی خۆی گرت. چوو کەمێك بگەرێ. بەلای دارتوویەکی گەورەدا تێپەری. لەناکاو کرمێکی ئاوریشمی بەرچاو کەوت سەرگەرمی خواردنی گەڵا توو بوو. سەلامی لێ‌کردو گوتی:

- سەلام کرمی ئاوریشم.

بەڵام کرمی ئاوریشم ئەوەندە سەر گەرمی خواردن بوو، بە ئاگا نەهاتەوەو وەڵامی نەدایەوە ئاسك دووبارە سەلامی لێ کردەوە، ئەمجارەش وەڵام نەبوو. ئەوەبوو لەوە زیاتر خۆی پێ نەگیراو گوتی:

- ئاخر تۆزێك بە خۆتا بچۆرەوە. تۆ وائەزانی تۆیان لەم تاریکستانی‌یەدا هەر بۆ ئەوە دروست کردووە کە گەڵاکان بخۆیی و دوایی دانیشی و تاڵە ئاوریشمان دروست کەی؟ ئەوەندە تاڵ بە دەوری خۆتا ئەتەنی کە لە ناویاندا بەندبی و لە کۆتاییشدا هەر لەو زیندانەی بۆ خۆت دروستی دەکەی ئەتکوژن و بەرهەمەکەشت ئەبەن.

بەڵام زۆر لە هاورێ زرنگەکانت پێش ئەوەی بیان کوژن، وشیار دەبنەوەو خۆیان ڕزگار دەکەن.. لە دەشتە ئازادەکانا، دەدەنە شەقەی باڵ.

... کرمی ئاوریشم ئالێرەدا دەستی هەڵگرت و گوتی:

- ڕاست ئەکەی، باشە پێم بڵێ دەبێ کەی دەرباز بم و بفڕم.

ئاسك گوتی:

- ئەوە پەیوەندی بە خۆتەوەیە. لەگەڵ هاورێکانی ترت کۆبەرەوەو لە جیاتی ئەوەی لەبەیانی تا ئێوارە هەر بخۆی، کەمێکیش قسە لەگەڵ یەکترا بکەن، بە گەورەکان بڵێ کەی کاتی دەربازبوونە لە قەفەس؟ تاکو بێ هەڵوێست نەبی، هەمیشە هەر هەمان ئاش و هەمان تاسە بووە.

کرمی ئاوریشم سوپاسی ئاسکی کردو پەیمانی دایە کە لە بیری ئەو کارەدا بێ. دنیا تاریك تر بووبوو، ئاسکە چکۆل لە هیلاکی‌و لەپاڵ دارێکدا خەوی لێ کەوت.

* * *

... دنیا کەمێك ڕووناك بووەوە، کەڵەشێر دیسانەوە دەستی کردەوە بەسرووود خوێندنەوە. بولبول و بایەقوش شیعرە تازەکانیان خوێندنەوە. دوای ئەوەی برێك گاڵتەیان بەیەك تریکرد هەریەکەیان چوو بەلای ئیشی خۆیەوە.

... ئاسك هاتە لای گوڵەخان و وەنەوشەو مام کیسەڵ، گوڵە بەرۆژەش لەوێ بوو، لە دوێنێوە کە وەنەوشەخان قسەکانی کردبوون، کەسیان نەدەگریان، دوێ شەو هەموو لە بیرکردنەوەدا بوون، لەدەوری یەك دانیشتبوون. وەنەوشەخان گوتی:

- ئەبێ شتێك بکەین.

مام کیسەڵ گوتی:

- من ئامادەم..

گوڵە بەڕۆژە گوتی:

- من سەرگەردان بووم، سەرم گێژ دەخوا، دەچمە هەرلایەك ڕۆژ نابینم، منیش ئامادەم.

«با»ش بە دەنگە بەرزەکەی ئامادەیی خۆی نیشان دا.

ئاسك بە «با»ی گوت:

- بێ دەنگ بە، هەمیشە دەنگە دەنگتە. تۆزێ ئاگات لەخۆت بێت. هەستت هەیە؟ مەگەر هەورەڕەش بەئاسمانەوە نابینی بە هەزاران چاو تەماشامان دەکاو بەهەزاران گوێ، گوێ قوڵاخی قسەکانمانە، یەکێك بیەوێ کارێك بەرهەم بێنێ، ئیتر دەنگە دەنگ و نزاکردن دەخاتە لاوە، من ئەم قسانەم لەبابمەوە بۆ جێ ماون.

«با» گوتی:

- بەسەرچاو ئاسکە گیان، قسەکانت بکە.

ئاسك دەستی پێ کردەوە:

- ئێمە دەبێ ئامادە بین بۆ ڕزگار کردنی ڕۆژخان، لە زیندانی هەورە ڕەشی هەزار چاودا. قسە بۆ ئەوان دی بکەین، ئەوانە بۆلای خۆمان ڕاکێشین. ڕۆژیان بهێنینەوە یاد. بیان بەینە لای ڕووبارەکەوە تا هەر یەکە یان ڕەنگ زەردی و سیس بوبی خۆیانی تیا ببینن. تێیان بگەیەنین کە لەچ کەشتێکدا ئەژین، وەنەوشەخان هەموو وەنەوشەکان و گوڵەخان هەموو گوڵەکان و کیسەڵ و گوڵە بەڕۆژەو «با» هەموو کۆوەبن هەرکەسە قسەی خۆی بکاو ئەگەر ڕایەکی هەبێت دەری بڕێ. ژیانی خۆمان منداڵەکانمان بەندە بە ڕۆژەوە، ئەگەر هەتا نەبێ ئاوەکان نابنە هەڵم و ناچنە ئاسمان و باران نابارێت، ئەگەر هەتاو نەبێ منداڵەکانمان گەورە نابن. هەمیشە ڕەنگ زەرد ئەبن. ئەگەر هەتاو نەبێ میوە پێ ناگات. قۆخە بەتامەکان و سێوە سوورەکان و گێلاسی شین و گوڵە ڕەنگاو ڕەنگەکان نایەن. ئەگەر ڕووناکی نەبێت چاومان هیچ نابینێ، ئەگەر بش بینێ هەموو شتێك ڕەش دەبێ. هەتاو هێزمان دەداتێ، خۆراکمان دەداتێ ڕووناکیمان دەداتێ تا کاربکەین، تا منداڵەکانمان لە ناو سەوزەگیادا یاری بکەن و گەورە بن، لەپێناوی ئازادی ڕۆژا پێویستە فیداکاربین. دەبێ کۆبینەوەو

زۆرانبـازی بکـەین. بێگـومـان لەم ڕێگایەدا چەندانێکمان لەدەست ئەچن بەڵام ئەگـەر ڕۆژ نەبێت، هەمـوومـان تیـا ئەچین، خۆئەگـەر لەنـاویش نەچین ئەواهەموان نەخۆش و برینـدارو بێچـارە ئەبین، کەئـەمـە لەمردن ناخۆشترە ئاسکە چکۆل لە قسەکانیا گەیشتە ئێرە تەماشای دەورو بەری کرد. هەموو دانیشتوانی باخ لە دەوری خڕبوونەوە.

لە ناکـاو گرمـەی هەورەڕەش بەرزبـووە، چەخمـاخـەیـەکی لێـداو کردی بەتـۆفـان. هەمـوو خەڵکی باخـەکـە ڕایـان کرد، ئاسـك و گوڵـەخـان و وەنەوشەو گوڵە بەڕۆژە لەگەڵ کیسەڵ و کەڵەشێرە سوور، خۆیان کرد بەژێر دارێکـدا. دەنکـە تەرزەیـەك بەردەم و چاوە جوانەکـەی وەنەوشەخان کەوتبو خوێنی لێ دەتکا. مام کیسەڵ سەری لەقاوغەکەی هاوێشت و باکی بەهیچ شتێك نەبو، دووسێ شوێنی گوڵـە بەڕۆژەش تێـك شکـابـو، لەپشتی ئاسکـەش خوێن دەهـات، لەم کاتـەدا کەمتیـارێـك لە دوورەوە هات کەئـاسکـەو هاورێکـانی دی دەستی بەپێکـەنین کرد. بایە قوشیش لەولاوە بەشێك لەدەفتەرەکەی خوێندەوەو پێکەنی. بولبـولیش دەستی لە ملی دڵـدارە زەرد نەبـووەکـەی کردبوو ئاگای لەدنیا نەمابوو. جار بە جارێك شیعرێکی دەخوێندەوە.

... ئاسکە چکۆل ڕوی کردە کەمتیارو پێی گوت:

- بەچی پێ ئەکەنی؟

... کەمتیار بەگاڵتە پێکردنە وە گوتی:

- زۆر ویستیان ئەم جۆرە کارانە بکەن، بەڵام نەیانتوانیو گیانی خۆشیان لەدەست چوو چاکتروایە بچی بەلای ئیشی خۆتەوە. کەسێك نی یە بتوانێ لەگەڵ هەورەڕەشدا شەڕ کات.

... ئاسکە گوتی:

- من لەدوای بینینی ئەم وەزعە ناتوانم ڕێگا بگرم و بڕۆم لە تاریکـایی دا وەکـو تۆ لاشـەی ڕزیـوی ئاژەڵـەکـان بخـۆم و بەخـۆشی بنوم. هەرگیـز لە مەو بەر نەمزانیوە لەم جیهانەدا باخێـك هەیـە لە جیـاتی ڕۆژ، هەوری ڕەش تیـا فەرمـان ڕەوابێ. ئێستا کە زانیومە، هەرگیز ناگەڕێمەوە ئێرە جێگەی منە، تۆبە خۆت پێ ئەکەنی، چاکترە بڕۆی بەلای ئیشتەوە.

... هاورێکانی ئاسکە کەوتنە پلار لە کەمتیار هاویشتن، ئەویش هەر هێندەی پێ کرا لمۆزی بخاتە لای قاچەکانیو ڕاکات.

لەم شوێنەدا کاك چۆلەکە، کە گوێی لەقسەکانیان بوو هاتـە پێشـەوەو گوتی منیش لەگـەڵ ئێـوەم، دڵم بەرگـەی تاریکی ناگرێ.

پەڕەی سێلکەیەکیش لەولاوە هات و گوتی:

- من عاشقی بەهارو هەتاوم، بەهاریش بەبێ هەتاو بەهای نی یە، منیش ئەمەوێ بێم.

... ئالـەم کاتـەدا چرپـەی پێ یـەك، بەئـاستـەم بەرگـوێ دەکەوت هەموو یان بێ دەنگ بوون و گوێ قولاخی چرپەکە بوون. بۆیان دەرکەوت دەنگی پێی شەونمەکانە کە بەسەر چیمەنەکەدا دەهاتنە لایان.

یەکێك لە شەونمەکان هاتە پێش و گوتی:

- کاکی ئاسك ئێمەش دێین.

گوڵە بەڕۆژە پێکەنیو گوتی:

- ئێـوە چیتـان لەدەست دێ؟ ڕۆژ دوژمنی ئێـوەیـە. کاتێك هەتاو هەڵدێ هەموتان دەبنە هەڵم.

شەونمەکە گوتی:

- ساڵـە های ساڵـە ئێمـە بەسـەر چیمـەنـەکانەوە ڕزیوین، ئەوەنـدە لەیـەك شوێنـدا دانیشتـوین، بێزاربوین، ڕۆژ ئێمە دەباتە ئاسمان و ڕۆژێکی تر ژیانمان پێ دەبەخشێت تازەتر لە هەمـووکـات بە ڕووی گوڵ و چیمـەنـەکـانەوە ئەنیشین. دوای ئەوەش ڕۆژ دوژمنی ئێمە نی یە، ڕۆژ ئێمە دەبزوێنێو ژیانمان پێ ئەبەخشێ لەبەر ئەمەیە کە ئێمەش هەموومان دێینە شەڕی هەورەڕەش.

... وەنەوشە پێکەنیو گوتی:

- ئاخر ئێوە بەچ هێزێکەوە دێنە شەڕی هەورەڕەش؟

... شەونمـەکـان بە گوێی یەکتـریـان [illegible]چرپـاندو دوایی و ڕویـان کردە ئاسـك و گوتیـان: ـ گەلێ[illegible]مان لەدەست دێ، ئەو ڕۆژەی دەچینە جەنگی هەورەڕەش نیشانیان ئەدەین.

ئاسك ماڵ ئاوایی لەهاوەڵەکانی کردو هەریەك بەرەو لایەك ڕۆیشتن.

* * *

... بەیـانی ڕۆژی دوایی، کەڵـەشێـرە سوور هێنـدە بە جۆشـەوە خوێنـدی، دڵـۆپێك خوێن لە گەرویەوە هاتەدەر، بەڵام ئەو زیـاتـر دەنگی لێ بەرز دەکـردەوەو هاوار سکاڵای

بەگوێی دانیشتواندا دەدا:
بگرەو بەردەیەکی سەیر لەباخەکەدا بەرچاو دەکەوت. هەرکەس ئەوی تری خەبەر دەکردەوە. هەورەرەش لەو سەرەوە دەیقیراندو کەڵبە پیسەکانی دەردەخستن، چەخماخەی شمشێرەکەی چاوی کوێر دەکرد. ئاسکە چکۆل و گوڵە وەنەوشەو، گوڵەخان و گوڵە بەرۆژەو کیسەڵ و پەرەسێلکەو چۆلەکە لە ناوەڕاستی باخەکە کۆبوونەوەو بەگوێی یەکتریاندا ئەچرپاند، دڵۆپە شەونمێکیش لەسەر رووە خرپنەکەی وەنەوشە، دانیشتبوو. «با»ش بە هەموو هێزێکی‌یەوە خۆی پان کردبووەوە تا شوێنێکی باشتر بۆ هاوڕێکانی دروست کات، لەم کاتەدا کە هەموو ئامادە بوون گورگێکی ڕەش لە ناکاو پەیدا بوو.

... گورك کە هەمیشە پشتگیری هەورەرەشی دەکردو پیای هەڵدەدا، لە کۆبونەوەی ئەوان و تەگبیر کردنیان بۆ چوونی جەنگی هەورەرەش توورە بوبوو. چونکە ئەو لە تاریکیدا باشتر ئیشی خۆی دەکاو سکی تێردەکات. گورگە نزیك کەوتەوەو بە توورەیی‌یەوە گوتی:

- چی رووی داوە لێرە؟ خەجاڵەت نابن بەبەشی خۆتان نارازین. تەماشا کەن، ئەم باخە بێدەنگەو خامۆشەتان بە چ ڕۆژێك بردووە؟ بهێڵن با خەڵك بچێ بەلای کاری خۆیەوە. ئەم ئاسکە لەخۆ بایی‌یە لەکوێوە هات؟ باوکیشی هەروەك خۆی بوو، ئەویش ئێمە دەرمان کرد، ئێستا هەمووتان نابوت ئەکەم.

... لەناکاو پەلاماری ئاسکە چکۆلی‌دا، بەلام ئەو وریاتر بوو خێرا خۆی لادا، پەرە سێلکەکان رژانە سەری‌و بە نینۆك سوور سوریان کردەوە. گورگی لە خوێن هەڵکشاو هەر هێندەی [illegible] ملی ڕێ بگرێو بۆی دەرچێ.

... لەم کاتەدا ڕێوی ناوباخ تەزبیحێك بە دەستەوەو بە وویرد خوێنەوە لەولاوە پەیدا بوو. ڕێوی فێڵ باز کە لە تاریکیدا باشتر ئەتوانێ هێرش بەرێتە سەر کولانە مریشك و هێلانەی باڵندەکان، لە دەرکەوتنی ڕۆژخان دەترسا. هێواش.. هێواش نزیك بۆوە، لە حاڵەتێکدا لە ژێر لێوەوە برتەو بۆڵەی بوو تفێکی ڕشت و گوتی:

- لە خوا بترسن. شەڕ لەگەڵ هەورەرەشدا مەکەن. هەمووتان بە ئاگری دۆزەخ ئەسوتێن.

ئاسك گوتی:

- بۆ دۆزەخ لەمە زیاتر هەیە کەوا ئێمەی تیاین؟

ئنجا ئاسکە دەستێکی لە چۆلەکەکان ڕاوەشاند، بێ ئاگا سووپای چۆلەکەکان هێرشیان هێنایە سەر ڕێوی، ئەویش دوو‌پێی هەبوو، دوانی تری قەرز کردو بۆی دەرچوو، لەترسان تەزبیحەکەی لێ بەجێ‌ما.

... هەیاو هویەك بوو، کەڵەشێرە سوورو هاوڕێکانی سروودی جەنگیان دەخوێند، بایەقوش خۆی لە کەلاوەیەکدا مەلاس دابوو لە دیوانە شیعرە کۆنەکانی حەشارێکی دروست کردبوو. پالێ دابوّوە،

... بولبولیش دەفتەری شیعرەکانی کە لەگەلا سێو بوو خستبووە ژێر باخەڵی‌یەوەو لەپەنای گوڵێکدا لێی دانیشتبوو، چاوەکانی خومار ئەیان نواند. شەڕ دەستی پێ‌کردبوو، کرمە ئاوریشمەکان لە قۆزا خەکانیان هاتبوونە دەرێو وەك پەپولە جوانەکان لەمسەرەوە دەفرینە ئەوسەرو هەواڵی ئەم دەستەیان ئەگەیاندە ئەو دەستە.

لەولاوە مشکە کوێرەیەك لە ژێر زەوی‌یەوە هاتە دەر لە کاتێکدا چاویلکە ڕەشەکانی ڕێك دەکردن و گۆچانەکەی بەر زەوی دەکەوت. هاواری کردو پرسی:

- چی رووی داوە؟ بۆچی بەم شێوەیە پێ بە زەویدا ئەدەن؟! ماڵەکەمتان وێران کرد، ئەوەتا سفرەی منالەکانم پڕبووە لە گڵ و خۆڵ. ئەمە چی بەسەر چی‌یەوەیە؟ بۆ نایەڵن بارویەك نان بە خۆشی بخۆین؟! لەو لاوە وەنەوشە بە پێکەنینەوە هاواری کرد:

- ئەمانەوێ ڕۆژخان ڕزگارکەین.

مشکە کوێرە بەسەر سوڕمانەوە پرسی:

- ڕۆژ!، ئەبێ چ گیانەوەرێك بێت؟ من تا ئێستا ناویشی نازانم. وەنەوشە گوتی:

- ئاخر تۆ کوێری، بەلاتەوە گرنگ نی‌یە دنیا ڕووناك بێت یان تاریك، خوت بە تاریکی گرتووە. چاکتر وایە لەلای سفرەی منالەکانت بی، نەبا خاك و خۆڵ بڕژێ بەسەر خواردنە جوانەکانیانا، برۆ هەر لە بەیانی تا ئێواری ژان گرەو ئەوانە گەورەکە، سەد کوێری تریش بخەرەوە بۆ ئەم باخە. مشکە کوێرە بە توورەیی‌یەوە گوتی:

- بێدەنگ بە ڕەزاگران، کارت نەبێ بەسەر ئیشی کەسەوە، با بەم گۆچانە گەردنت نەشکێنم.

وەنەوشە گوتی:

- جەنابی مشکە کوێر! ئەو زەمانە ڕۆیی کە بە شێوەیەکی دی قسەت لەگەڵدا بکەم و پێتا هەڵ بڵێم و پەو درۆ بە قوربانت بم، ئێستا ئەبێ عەیبی یەکتر وا بەڕوی یەکتریدا بدەین کە لە داخان و لە خەفەتان دەست کەینە گریان.

لە ناکاو مشکە کوێر گۆچانەکەی بەرەو دەنگەکە هاویشت.

. . . وەنەوشەی کورتەبالا خۆی چەماندەوەو سەری داخست، گۆچانەکە بەسەر سەریدا ڕۆیی و لەولاوە کەوتەوە سەر زەوی ئەو هەناو هەردا، مشکە کوێر هاواری کرد:

- ئای خەلکینە، کوا گۆچانەکەم؟ ماڵەکەم لەکوێیە؟ ئای چۆن نابود بووم. ئەوە بێچوەکانم لە برسان دەمرن. ماڵ و ژنم هەیە، یارمەتیم بدەن.

. . . بەڵام دەنگی ئەم لەناو قاوو قیژی ئەواندا نەئە بیسرا. بە دەستووری ئاسکە چکۆل، هەر چۆلەکەیەك چقڵێکی لە گوڵە سوورەکان کردبۆوەو بە دەندوکی گرتبوی.

. . . هەر پەرە سێلکە یەك درکێکی تیژی هەبوو. شەونمەکان لە سەر ڕووی وەنەوشەو گوڵەکان دانیشتبون.

. . . گوڵە هاورێکانی (بوقی) ئامادەبوونیان لێ ئەدا. «با»ش لەسەر زەوی خۆی پان کردبۆوەو هەموویان لەسەر پشتی ئەوبوون.

. . . بەڵام لەو لاوە قیرەی هەورەڕەش دەهات، شمشێرەکەی دەر هێنابوو/هەزار چاوو هەزار گوێی تیژکردبوو، پەیکەری گەنیوی بەم لاو ئەولادا ئەچوو، هەورەڕەش هاواری کرد: - هەمووتان سەرگەردان ئەکەم، هەمووتان تەرزە باران ئەکەم و ونجرو نجرتان ئەکەم، هەرکەسێك کەمترین قسەو بچوکترین جووڵە بکا، نابود ئەبێ، ئای ئاسکی ناجسن، ئەبێ شاخەکانت وردکەم.

. . . بەڵام ئاسك و هاورێکانی لەو دارە بیانە نەبوون کە بەو جۆرە بایە بلەرزن. بۆیە پیرو پەککەوتەکان لەو کاتەدا تەماشایان ئەکردو هەڵ ئەلەرزین. لاو لاوێکی ناسك کە خۆی لە دەوری چنارێکی گەورە ئاڵاندبوو سەری بردە پەنا گوێی چنارەکەوەو پێی گوت:

- لەبەر چی ناچی بۆ یارمەتی دانی ئاسك و هاورێکانی؟ تەنها ئەوەندەت لە دەست دێ خۆت دارزێنی؟ ئاخر تۆش کارێك بکە. چنار بە ناڵەوە گوتی:

- ئاە.. لەتوانای من بەدەرە، پیر بووم.

. . . لاو لاو گوتی: تۆ ئەتەوێ خۆت دەربازکەی، ئەگەر وانی یە، دەتوانی بە تاقی کردنەوەکانت یارمەتیان بدەی، من ئەچم بەدەوری ملی هەورەڕەشدا خول دەخۆم تا هەناسەی لێ دەبرم.

. . . لاولاو لە دوورەوە هاواری کرد:

- منیش لەگەڵ خۆتان بەرن، هێی ئاسکە چکۆل، منیش وا دێمە لای هاورێکانم.

. . . بایە قوش لە کەلاوەکەدا خەوتبوو لە خەوەکەیا بۆ قافیەی شیعرێك ئەگەڕا، بە بولبول خەوی بەوەوە ئەدی کە دەفتەرە شیعرێکی چاپ کردبوو. مشکە کوێر بەدوای گۆچانە کەیدا ئەگەڕاو بێزاری دەر ئەبڕی گورگەکە لە ئازاردا ئەتلایەوەو برینەکانی ئەلستنەوە.

مام ڕێوی چاوەڕێی ئەوەبوو بزانێ کام دەستەیە سەر ئەکەون تا خۆیان لەگەڵ ڕێك خا. کەڵەشێر سروودی ئەخوێندەوەو هێزو ورەی دەبەخشی یە هاوەڵەکانی.

. . . (بوقی) هێرش لێ درا. «با» کەوتە جوڵە. لەپێش هەمواندا شەونمە ناسکەکان لە سەر ڕووی گوڵە وەنەوشەو گوڵەخان بەرز بونەوەو بە لەشە ناسکەکەیان هێواش..

هێواش بەبێ ئەوەی هەورەڕەش ئاگای لێ[illegible]ێ چوون لەسەر شمشێرەکەی دانیشتن، شمشێری هەو[illegible] زرینگەی لێ هەستاو بەرز بۆوە، بەڵام شەونمەکان باکیان نەبوو، کە ئەوان گیانی خۆیان بکەنە قوربانی لە پێناوی ئازادی ڕۆژخان و ڕووناکی باخدا، هەر چەندە بێچووەکانیان سبەینێ لەسەر سەوزایی یەکانەوە سەر دەردێنن، لە ڕیزی پێشەوە کیسەڵەکان، بە ڕیز وەستابون و سەنگەرێکیان دروست کردبو کە تەرزەی هەورەڕەش کاری تێ نەئەکردن، نۆرەی هێرشی چۆلەکەکان، ئینجا پەرە سێلکەکان هات کە

چقڵ و درکـەکـانیان لە لەشی هەورەرەش هەڵدە چەقاند، لاو لاوەکان دەست و پێی هەورە رەشیان بەستبوو خۆیان لە ملی ئاڵاندبوو.

. . . ئاسکە چکۆڵ لە هەموو لایەکەوە رێنمایی ئەکردن، گوڵـە بەرۆژەکـان. بە خێـرایی دەنکەکانیان بەرەو چاوەکانی هەورەرەش ئەهاویشتن.

. . . هەرچـەنـدە هەورەش قیـرانـدیو ددانە پیسەکانی لێ جیـرکـردنـەوە سوودی نەبـوو، رۆژخـان بە پرچـە زێرینی‌یەکانی‌یەوە لەپشت هەورەرەشەوە دەرکەوت و پێکەنی.

. . . هەمـوو هاواری خۆشیـان بەرز بۆوە، وەنـەوشـەی کورتەباڵا بریندار بوو، ئاسکە چکۆل دەیویست دەم و لێوە خرپنەکانی ئەو بلێسێتەوە ماچی بکات.

. . گوڵـەکـان و هەمـوو کیسـەڵ و گوڵـە بەرۆژەکـان و هەموو. . . هەموو هاورێ شەهیدەکانی خۆیان کۆکردنەوەو بەیادی ئەوانەوە، لە سەروی باخەکەوە خانوویان بۆ دروست کردن، تا هەموو دەم بژین و لەیادنابن.

* * *

. . . بەیـانـی ئەو رۆژە کەڵـە شێـرە سوور بە دەنـگـە زوڵاڵەکەی گۆرانی گوت:

**ئەی رۆژە سوو[illegible]ەی ئازاد**
**رەنگ و رووی [illegible]ە خشانت و،**
**پرچە زێرین[illegible]ە سەرمانا پەخش بکە. . .**
**ئێمە بەرامبەر بە[illegible]،**
**خوێنی خۆمان لا هەرزانە. .**
**ئەی رۆژی سود بەخش،**
**تا ئەبەد وەدرەوشێ**
**تا ئەبەد سەرکەوتوبە. .**
**تا منداڵە بچکۆلەکانمان**
**لە داوێنتا یاری بکەن.**

* * *



# سزاو پاك بوونەوە

سەلاح عومەر

**«ئەوەی جوان و پاك بێ، پیرۆزیشە»**
**لە زمانی پاڵەوانی یەکەمی چیرۆکەکە**

پاش بینەو بردەیەکی زۆر مەسەلە بەوە کۆتایی هات کە بۆ یەك بن. بە رووالـەت وەکـو ژن و مێردێکـەوە بەسترانەوە، جاران، پێش بە ئەنجـام گەیـانـدنی پیـلانەکە بەخەیاڵی هیچ کامێکیان نەدەهات کەوا بەجووتە لە ژوورێکی رازاوە بەتەنێ بەرانبـەر یەك دانیشن چونکـە هەریـەکێ بەجـۆرێکی جیاواز لەوی‌تر بیری دەکردەوە، راو بۆچوونیان دەربارەی زۆر شت جیابـوو، نەدەگـەیشتنـەوە یەك. بۆیـە جۆرە رقـابـەرایـەتی‌و دوژمنایەتیەك کەوتە نێوانیان، هەریەکێ هەوڵی دەدا ئەوی‌تر ژێر بخاو خۆی ببێتە شۆرەسواری مەیدانی ئەو بۆچوونەی باوەری پێ‌یەتی، رۆژێ لە رۆژان یەکتریان خۆش دەویـست ئا، بەڵام هێـنـدەی پێ نەچـوو رقـێـکـی ئەسـتـوور لە شوێـنـی خۆشـەویستی‌یـەکەیان روا. ئەگەر جێ‌بەجێ کردنی پیلانێکی

ئاپـکـانەو شیتانە نەبوایە مەحاڵ بوو، بۆ مەبەستێکی وا لێرە کۆبنەوە. هەنـووکـەش هەروان، ئیمشەو شەوی یەکەمیانە، ئێوارە بە شێوەی عادەتی خزم و برادەریان بەرێ کرد. بێ دەنگ بەرەو ژوور بوونــەوە. هەتـا لە دەرەوە بوون هیـچ شتێکی نائاسایی لە رووخساریان نەدەخوێندارییەوە، بەڵام هەنووکە، لەوەتەی هاتوونەتە ژوورەوە، بەجۆرێکی سەیر خۆیان لە یەکتر گرتوە، لێك مۆر بوونەتەوە، پشلە ئاسا لێك دانووساون. هەر بزانـە بینـەقـاقـای یەکـتریـان گرت، جاری زۆر لێك نزیك نەبوونەتەوە، نێوانیان چەند مەترێکەو وا بەرەبەرە کەم دەبێتەوە، بێدەچێ پاش کەمێکیتر رووداوێکی جەرگ بڕ، تەڕو ووشکی ئەم شەوە پیرۆزەیان هەڵبلووشێ، مەرگەساتێ روودەدا، لەوانەیە ئێرە ببێتـە گۆرەپـانی زۆرـ ـازیـەکی زۆر ناهـەموار، تاخوێن نەرژێ، دژایەتی نێوانیان کۆتایی نایێو رەگ و ریشەی برین و ناسـوری ناپـاکی چنـ.. مانگی لەمـەوبەریش هەڵناکێشرێ. کەوابـوو، ئەوسـا تای تەرازووی بوون و گەورەیی یەکێکیان بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێ. ئەوەی دوێنێ لەژێرەوە بوو، ئیمشەو بەرەو سەرەوە بەرز دەبێتەوە، ئەوەی لەسەرەوەش بوو، ژێرەو ژێر روودەچێتە خوارێ، نۆبەی ئەوی ترە ویـستی ووردوخاش بکـرێ. «بـو ئەوەی هاوکێشەی نێوانیان یەکسان بێ پێویستە هەردوو جەمسەری تاوان و سزا یەك بگرنەوە»

«پیاوەکە» ئاگای لێنییە چ قورێکی خەستی بۆ گیراوەتەوە، لە گوێی گادا نوستـــوە. بیرو هۆشی هەمــوو لە خاڵێکی دیارکراو کۆبۆتەوە، دەیەوێ زوو بگاتە مەرام و ئارەزووەکانی بگەینێ. خەون بە راکشان و لەزەت وەرگرتن و گەوزاندنەوە دەبینێ. دەماری شەهوەت سواری سەر دڵی بووە، چاوەڕێیە بۆ جاری دووەم پیاوەتی خۆی تاقی بکاتەوە. تامی هەنگوینی کردوە. وا دیارە هێشتا زۆری ماوە تێربێ. وا دەزانێ هەموو جارێ مەســەلــەی وا بەئــاســانی وەدەست دەهێـنرێو زوو دەبرێتەوە. بەڵام خۆ لە هەموو هەوران هەر ناباری. تازە ئەو بابی مرد. بشمـرێ. وەك ئەوجـاری بۆ رێـك ناکـەوێتەوە. ئیمشەو بارودۆخ زۆر گۆراوە، دوێنێو پێرێو چەند مانگێ لەمەو بەر شتێکی تر بوو. چونکە ئەو مرۆڤەی ئەوسا پیلانێ وای لێکرد بچووك بێ هەنووکە گەورەیەو هێزو تینی ئازایەتی هاتۆتەوە بەر. زۆریشی نەماوە شالاوێکی مەردانە بنێو دۆو دۆشاو تێکەڵ یەکتر بکا.

مرۆڤێ بیـەوێ، بەهێزو گەورەش دەبێ، جاری وا هەیە پاڵەوانێکی بەجەرگیشی لێ دەردەچێ.

«پیاوەکە» خەریکە لە خۆشیان بزەی دێتێو سمێل بادەدا، کێـچ کەوتـوتە لەشی بۆیە سات ناساتێ، لەوێ هەڵدەستێو لەوێ دادەنیشتەوە، توتکە ناگرێ تا خۆی بە فەتارەت دەدا. دەیــەوێ زوو بگـاتـە مەرام. بە بیروبـاوەڕی خۆی دەچێو پێدەکەنێو دنیا بەهی خۆی دەزانێ، وا دەزانێ هەر ئەو لەم دنیایەدا سەرکەوتنی وەدەست هێناوە، کوایە زیرەکیو زۆرزانی وای لێ کردوە ئەو پیلانە نەگریسەی بەکار بێنێ، گوایە زیرەکانە توانیـویـەتی جوانترین و بە فیزترین کچی ئەم شارە دەستەمۆ بکـا. نەك هەر تەنهـا جەستـەو لەش، بەڵکو بیروباوەڕێکی نامۆشی ژێرەو ژێر نقووم کردوە، لەمانە پتر بیر لە هیچ شتیتر ناکاتەوە، بۆ بیر لەشتی دوور لە سنووری ئیمشەو بکاتەوە، ئەگەر وابکا دەبێ ئارەقەی شەرمەزاریو زەلیلی بە نێوچەوانی بێتـە خوارێ، ئاخـر بەر لە بەئەنجام گەیاندنی ناپاکییەکەی سـفـرێکی پاش ژمـارە بوو، کەس بە سەگی بەردەرگاو سەر گوفەکانیشی قبول نەدەکرد، ئەو کات خۆشی لەو باوەڕەدا بوو کە پیاوێکی کەم و نزم و بێبایەخە، چونکە بە دەیاها جار بۆ ئەم بەژن و باڵایەی هەنووکە وا بە نزمی لێی وورد دەبێتەوە، کرنۆشی دەبرد، وەکو سەگ لێی دەپارایەوە تا پەیمانی ژوانێکی پێ بدا. ئا ئەو بەژن و باڵایە رۆژێ لەرۆژان لەبەر چاوی وەکو تەلیـسمێکی قفل دراوی لێ هاتبوو، هێندەی هەوڵی دەدا بۆی نەدەکـرایـەوە، بە مەزەنـدەی خۆی لەبەری هەڵدەلەرزیو بە سوپـەرمـانی تێدەگا. وا نەبوایە بەپێی خۆی نەدەهات لێی بپارێتەوەو دەستی ماچ بکا تا رازی بێ ببێتە ژنی. وا دەزانێ ئەگەر ئێستا بیەوێ وای لێدەکا هەست[illegible] پێلاویشی ماچ بکا.

(وام لێکرد ئەو مەجبوری من بێ[illegible]پارێتەوە، تۆڵەی مانـدووبوونی خۆمم لێکردەوە، دوو[illegible]ەوەندەی ماندووبوونی خۆم بەولاو بەم لادا هێنـام و بردم. هەوەڵ جار کەرو ئێستر بووم، خۆم لەبـەر چاوی سووك و ریسوا کردبوو، چەندەها جار لێی دەپا رامەوە، دەمویست بە رێراست دەستەمۆ بێ. بەڵام بێ سوود بوو، ناچارم داوێکم بۆ دانایەوەو پێم وەکرد. لغـاوم کرد، قەراسەم لە ملی هەڵکێشا. هەنووکە کوێم بوێ بەرەو ئەوێ رایــدەکێـشـم، چوارپێ!! هەقمـە بە کەری بشوبهێنم، چونکە ئەوەی ئەو دەیکرد چ ئادەمیزادێ خەیالیشی

بۆی ناچێ. ئاخر چ مێشکێ ئەوە وەردەگرێ: «خۆشم دەوێ بەلام شووت پێ ناکەم. من شوو ناکەم، دەمەوێ بۆ هەمیشە پاك بمێنمەوە.»

ده تۆخوا وەرە سەرت سور نەمێنێو مەشێوێ، زۆر سەیر بیری دەکردەوە، نائاسایی رەفتاری دەکرد، دەتگوت لە دنیایەکی ترە، کەسیشی پێ راست نەبوو، تەنها خۆی نەبێ. گاڵتەی بە ئێمەمانان دەهات، بە شێتی بە رووتـدا هەڵدەشاخاو پتر پێیدادەگرت، کە باوکی نەتوانێ پەشیمانی کاتەوە، ئەی کێ دەتـوانێ؟ ئەوەی کوێرانە بە دوای شتێکی نەبـوو بگەرێ، دەکـەوێتـە بن گۆمێکی لێل و بزر دەبێ. ئیمرۆکێ باوەری بەشتی پروپـووچی بێمـەعنـای وەکـو پاك بوونـەوەو رۆح، رەبەنایەتی هەیە، ئیمرۆ مرۆڤ بە عەقل بیردەکاتەوە، بە دڵ و دەروون بیر بکەیەوە، لەنیوەی رێ عارد هەڵدەلوشی.

پیـاو یا دەبێ خۆی لەگەڵ بارو دۆخی کۆمەڵگا رابینێ یا دەبێ بچێ بەتەنێ دوور لە ئاوەدانی بژی، بەلام ئەو دەیگوت: «لـێرە دەژیم و تێکـەڵ هیـچ شتێ نابم، خۆم دوورەپـەرێـز گرتووە، نامەوێ لە هەر شتێ پەیوەندی بە شارستانیەتەوە هەبێ نزیـك بمـەوە، نامـەوێ ببمـە بورغیو ئامێر.». ئاخر نابێ لێرەبیو نەبیە بورغیو ئامێر، شتێ هەموو دەمێ لەبەر چاوو لەگەڵت بژی بێشکە کارت تێ دەکا. ئەگەر نارازی برۆ لە کۆخێکی رووت و قووت بژی، کەس نەتگاتێ، هەرشتێ بۆنی شارستـانیـەتی لێبێ بۆنی مەکـە، برۆ بە گۆشـەگـیری لەناو ئەشکـەوتێکی تاریـك ونـووتەك تا تەمەنت ماوە بەسەر بەرە، ئیمرۆ پاکی نەماوە، هەموو شتێ تا بینەقاقا نقومی ناو قورو چلپاوبووە، هەموو شتێ رەشە.

ئەمن ناتوانم وەک[illegible]ئەو دەلێ بژیم، ئەو کۆشك وخانوو بەرەو کەرەوێت و س[illegible] خواردنـە خۆشـە چۆن بەجێ دێلم. ناتـوانم، پێم ناکر[illegible]، فێربـوویمـە، بە نان و ئاوی رووت وشـك دەبمـەوە، کێ دەتـوانێ لەسـەر عاردێکی رووت و رەق وتەق بنوێ، لەتاریکی نەتوانێ هەنگاوێ باوێ، کوێرانە بجولێیتەوە، سەرمای زستان بێسۆبە تەنها بە سووتاندنی دارو هاوینان بێ موبەریدەو پانکەو تەلاجەو موجەمیدە بژی، ئەوە چ ژیـانێکە، ئەوەی پێی دەکرێ بابچێ بۆخۆی وابکا، من نایکـەم، پێـم ناکـرێ. زوو بیرم لە حاڵ و وەزعـی خۆم نەکـردبـایەوە هەنووکە لە دنیایەکی تر بووم، ئاخر یا دەبوایە تەرکی دنیاکەم گۆشەگیرو رەبەن، وێڵ و سـەرگەردان لەناو چیاو چۆلان بخولێمەوە، یا دەبوایە خۆم بکوژم، لەناو گۆریش کرە تێم دەئالا. خۆ کەر نیم!! لە ترێ سەش دەچووم و کەسیش بالا زراڤە نەعلەتی بۆ رەوانە دەکردم، چەندەهاش دەیانگوت گێل و کوێرفام بوو، ئیمرۆ کێ لە پێناوی کچ و ئافرەت خۆی بە فەتارەت دەدا.

ئافـرەتێکی سەیرو خەیاڵ بلاوو سەر لێشێواو بوو، سەد قورئـان دەخۆی ئەجندە چووتە بن باڵیو شەیتان نەقیزەی لێ دەدا، بەم جۆرە بیرکـردنـەوەو رەفتـارانـە گرفتـار بێ، ئاخـر سەرپێچی کردنی یاســای سروشت و ژیــان و کتێبی ئایینیو پێغـەمبـەر شتێکی گاڵتـە جاری نییە، سەر شێتیو لە ئاین وەرگەرانە، پیاو کافر دەبێ، کافر بوونە. ئەو نەگریسە خۆ بایی تۆزقاڵێ باوەری لە لەشدا نەمابوو، ئەوانەی لە دین وەرگەراون چۆن هەلس وکـەوت دەکەن ئەویش وای دەکرد. گاڵتەی بە زۆر شتی ئێمـە دەهـات، هەروەکـو ئەو لەناو کۆمەڵگایەکی یوتـوپیایی بژی، بە کورفام و گێل و کەرو نەخۆش و پیس و ناپـاکی لە قەڵـەم دەداین. دەیگوت (ئێوە ئاژەڵن، ئاوەگڵن. ماری هەشت سەرن) وەتدەزانی لە ئەورپا گەورە بووەو لەوێ پەروەردە کراوە، تۆ بڵێی ئەوەی لەوێ پەروەردە بێ وەکـو ئەوی لێبێ. کورە وەڵلاهی باوەر ناکەم، ئاخر هیچ ئایینێکی پیرۆز ئەم جۆرە ئادەمیـانە قبول ناکا، لە هەندەرانیش جێی نابێتـەوە، ئەوەی گاڵتە بە عورف و عادەت بکا، سەرەرۆیە. سەرکێشە، جێو بالینگانی لەسەر گۆفەکان فرێ دەدرێ.

یاسـایێکی سروشتیو ئاسـمانیـە، ژن و پیاو بۆ یەك بن و پێکەوە بژین، جووت بن و زاوزێ بکەن. باوەرناکەم لەوەتەی مرۆڤـایەتی خولقاوەو مرۆڤ لە دایك بووە، شتی وا بووبێ. ئافرەتێ بە نزیك بوونەوەی لە پیاو پیس و ئاوەگڵ بووبێ. لە کتـێبـانیش شتی وا نەنـووسراوە. ئەوەی وا بڵێ لە ژیـان نەگـەیشتـوە، زەوق مردوە، ئادەمیزاد نییە، ئامێرە، رۆبۆتە. ئارەزوو و هەست و ویست و مەرامی سەهـۆل بەنـدکـراوە. ئەوەتا ئاژەڵیش ئەو غەریزەیەی هەیە، زیندەوەری بچووکیش. کرداری جووت بوون، تەوژمـی لەزەت و شەهـوەتـی پێ دەبـەخشێ. بەلام ئەو بێبـەختە شتی وای بە کفرێکی زۆر گەورە دەزانی.

(پاك و پیرۆز، وەکو منداڵێ تازە لەدایك ببێ، وەکو بەفری

سبی پیش ئەوەی بکەویتە سەر زەوی، بۆ هەمیشەو تا دواین چرکـە لە تەمـەن وا دەبم. بیر لە شووکـردن ناکـەمـەوە، دەست گەمەو ماچ وموچ و خۆ لێك خشاندنیش دەرچوونە لەو بیردۆزەی باوەڕم پێیەتی. بە دەست من بێ ناهێڵم کەسێکی تریش لەم سەر زەمینـە بە جۆرێکیتر بجولێتەوە، یا هەموو کەس. ئافـرەت و پیـاو، من ئاسا بن، با بە درێژایی تەمەن دوور بن لە یەکترو یەکتریان خۆش بوێ با لە ناوەوە یەکتریان خۆش بوێ. بە رۆح لێك نزیك بنەوە ئەمە بەسە، با هەموو کەسێ ببێتـە پێغـەمبـەرێ. من ئەفلاتونم بۆیێ خۆش دەوێ چونکـە وا بیری دەکردەوەو باوەری بە خۆشەویستییەکی لەم بابەتە هەبوو. دیکارت لە هەمان کاتدا هێنای شتێکی پیرۆزی ی بەخشیـوم. دەتـوانم ووتـە بەنـرخـەکـەی بەم جۆرە لێك بدەمەوەو وای لێ بکەم.

(جوان و پاکم کەواتە پیرۆزم، پیرۆزم کەواتە هەم) ئەگەر بوشم بلوێ. حەمامێکی گەورەو زۆر فراوان لە بەفر دروست دەکەم، مەخلوقاتی ئەم سەرزەمینەی هەموو تێدەئاخنم، تا پاك نەبنەوە دەریان ناهێنم. بە ئاوێکی پیرۆز یا دەرمانێکی وەکو ئەو دەرمـانـەی کە مریـەم بۆ پیرۆز کردن و پاك کردنەوەی عیسا بەکـاری هێنـا. هەرچی بێ، زەیت، یا بەشێـوەی مەرهەم، هەمـوو مرۆڤـایـەتی دەشـۆمـەوە، پاکیـان دەکـەمەوە، چونکە ئادەمیزادی ئەم سەردەمە، وانەبێ پاك نابنەوە)

هەنـووکە ئەمن ئەم قسە بێ دەربێ قۆرانە بە قوروٚشێکی سووتاو ناکرم. . تەنها سەرم بۆ رەلەقاندو، تێی نەدەگەیشتم، ووتەی ناو کتێبان بەچی دەچێ، کرداری لەگەڵ بوایە. . . ئێ، ئەگەر راستی دەکرد بۆ نەدەچوو، لە گوندێ لە شارۆچکەیێ، لەسەر ترۆپکی چیایێ بژی، بەو خوایە واشی بکردبایە دوو رۆژی پێ نەدەچوو باشیان دەناسم، کەس نییە بەدوای کڵاوی بابـردوو بکـەوێ ژیـان لە خۆی تێك بدا. هەموو نایلۆنن، بەئـەتـەکیەت نەبێ ناجولێنەوە، خواردنی چاك نەبێ ناخۆن، نوینی گەرم نەبێ نانـوون. باخچـەو گوڵ و گولـزار نەبێ دانـانیشن. ئەویش یەکێکـە لەو هەمـوو مەردوومـە، خۆ لە چاخەکانی پێش زایین دانازیین، دنیا گۆڕاوە، ئیمرۆ ئامێر ئاسا دێن و دەچین. من لەچی دابووم و بۆچی هەولم دەدا، ئەو بە چ جۆرێ وەڵامی دەدامـەوە، پاك بوونـەوەو پیرۆزی چیو تەرەماشی چی؟ هەموو شتێ لەکاتی خۆی باوی هەیە. بەفر سپییـە بەڵام تیشکی رۆژ دەیتـاوێنێتەوە، گوڵ پاك و جوان و بۆندارە بەڵام وەرزی خۆی هەڵدەوەرێ.

«جەستەی ئادەمیزاد دەستی لێ بدرێ، دەپووکێتەوە، سیس و لاواز دەبێ» ئەوە قسەی قۆرە.

گوایە بەلێك نزیك بوونەوە خانەکانی لەش یەکیان ئەوی تر دەخـوات، ئەگەر وایە بۆ ئەو هەموو حەشاماتە لەسەر بستە خاکێ پێکـەوە لەدایـك بووینـە، بۆ ئافرەت ئافرەتەو پیاویش پیاوە، کەوایە بۆ هێشتی لێرە لە دایك ببێ!. کەنیساو ئایینی مەسیح بۆ رەبەنایەتی بە شتێکی پیرۆز دادەنێو پەیرەوی دەکا؟ چونکـە بە نزیـك بوونـەوە لە خوای دادەنێ. تەرکی دنیا بۆ نزیك بوونەوەیە لە خوا، خۆ بۆ مەرامێکی بێ سەروبنی وەك ئەوەی ئەو دەیگوت نییە.

وەختی خۆی «بـەرسیسی عابیـد» چوو، لە ئەشکـەوتێ، دوور لە ئاوەدانی خوا بپـەرستێ، چەنـدەها ساڵ بە زیکرو پارانەوە خەریك بوو، ژیانی خۆی بۆ شتێکی پیرۆز تەرخان کردبوو، هەتا شەیتانی بە فروفێڵ لەرێی وەرگەراند. تاوانی وای پێکرد چ ئاژەڵێ ئەوە ناکا. یەك و دوو وەرگەرا، لە هەموو شتێ بوو، لە دین و دنیـاش بوو، ژیـانیشی بە فیرۆ چوو، ئەوەی کردی هەمـوو پاکیو خواپەرستییەکەی سریەوە، هەتا سوجدەشی بۆ شەیتان برد. خۆ تۆ «بەریسی عابید»نی. خۆ لە سەدا یەکی ئەویشت نەکـردوە، بۆ جاران هێنـدە بە خۆتـەوە دەنازی؟ ماڵ کاوڵ من نەبام و ئەو داوە نەبوایە هەنووکە تۆش سوجـدەت بۆ شـەیتـان دەبرد، تۆم کریەوە، لەناو ئۆقیانۆسێ دەرم هێنای کە نە سەری هەبوو نە بن، [illegible]ێشکت حەسایەوە، ئەوانـەی دەوروبـەریشت حەسانەوە، خ[illegible] هەتاهەتایێ نازی، نەمـرەنی!! ماوەیەکی کورت و کەمە، [illegible]وشی بژی، بێدلی خۆت مەکە، چیت حەز لێیە بیخۆ، [illegible] چ دەبینی تامی بکە، ئاقیبەتیان هەر بستە خاکێکی قوڵ [illegible]راوی نوتەك و تەنگە. لەشیـان دەرزێو کرم دەیخـوا، جا کەواتـە بۆچ ئەو لەشـە نازدارەت لەسەر عاردێکی رەق و تەق رابکشێ؟ بەژن و باڵای وەکو تۆ پێویستە لەسەر ئاوریشم درێژ بکرێو لەناو باخچەو لەسەر مافووری کاشانیو کۆشکی خاوەن شکۆیی هات وچۆ بکا.

ئەویش ئەوە قبول بکا، ئەمن ناهێڵم، جوانیو لەش و قژی وا دارو دیوار لە باوەشی بگرن، باوەشی من چیەتی، چ جێ

خۆشتر لەوە هەیە لەسەر سنگ و مەمکی یەکتر بخەوین، پێکەوە بخۆین و پێکەوە درێژبین و پێکەوە یاریو دەست بازی بکەین، با بێ لە باوەشی من بخەوێ، با بێ سەر بە سنگی من بکاو قژی بەسەر هەردوو لامدا پەرش و بڵاوبکاتەوە، ئەمن تێناگەم ئەو گۆشەگیریو تەنهاییو ڕەبەنایەتی‌یە چ لەزەتێکی هەیە، دە توخوا کامە ژیان خۆشترە، لە نێوان چوار دیواری تاریك یا وەکی تر، بێشکە ئەو ژیانی ڕەبەنایەتی بێ خۆشترە. بەلام من نەء، ئەمن چۆنم حەز لێبێ وا دەژیم، بۆ لە فرسەتان بازبدەم، ئەوەی بمەوێ دەیکەم، ئەوەی بمەوێ وەدەستی دێنم، هەمووشتێ دەکەم، من وا لە ژیان دەگەم دەمویست فێری ژیانی کەم. پێلەقەی لە بەختی خۆی دەدا، جارێ ماویەتی، بەلام لەمەودوا، لەم شەوبەرەو دوا دەستی پێدەکەمەوە، فێری دەکەم چۆن بۆ خۆی بژی، دەزانم هێشتا لەزەتی لە جووت بوون نەبینیوە، ئاخر جاری یەکەم ئاگای لێنەبوو، لە حەوت خەوان بوو، دەی دەی لەمەوپاش، تازە بۆ یەکین، پێکەوە ژیانی داهاتوومان بەسەر دەبەین. نەمگوت ناهێلم بۆ کەسێکی‌تر بێ، هەر بۆ منیو بۆ من بووی، بەهەلەدا چووبووی واتدەزانی پیاوێکی زۆر بێ دەسەلاتم و هیچم لە دەست نایێ، ئەوە بۆم دوپات کردیەوە، بێ هێز نیم و ئەوساش بێهێز نەبووم، مەسەلە لە جێیەکی تر بوو، ئەوسا منیش وەکو تۆ بیرم دەکردەوە، سەرلێ شێواو بووم، بەژن و بالات کوێری کردبووم، قازانج و زەرەری خۆم نەدەزانی، تا ئەو کاتەی لە هیکرا بۆم دەرکەوت بە پیاوم نازانیو پێم رادەبوێری، کە زانی دروم لەگەل دەکەیو خۆشمت ناوێ، بیرو ڕام گۆڕا، بریا... ا بە هەر شێوەیەك بێ ژێرت بخەم، بە هەرچ ڕێگایە... ڕنگە نی‌یە، مادام بۆ من بووی ئەوە وادەزانم دنیا هی منە، خۆ نەمهێشت بیروباوەڕەکانت بەسەر ئارەزووەکانم سەربکەوێ، خۆت لەسەرەوە دەبینیو منیش لەژێرەوە، بە پیاوت نەدەزانیم، باشە لە چیم کەم بوو، گێل و ناشیرین، ئیسك گران، کورت و درێژ، باریك و قەلەو، ئەوەتا جوان لێم وورد بەوە، دەزانم ئەوانە هیچ نەبوون، بۆ ئەوانت نەبوو، بەلکو روح گەورەو هەوا بەرزو بەفیز بووی، واتدەزانی تۆ مەخلوقێکی پیرۆزیو نابێ کەس دەستت لێبدا، تۆ وەرە بەشەر، ئەوەندە باوەڕت بە بیروباوەڕێکی بێ‌سەروبن هەبێ، ڕۆژێ چەندەها جار لەسەر سەرەڕۆیی خۆت بەگژ خەلکدا دەچووی، دلی هەزارەهات دەرەنجاند، خۆ خەلك لە دارو بەرد دروست نەکراوە، هەموومان وەکو یەکین، ڕاستە تۆ جوان بووی، لەوان شوختر بووی، بەلام پیروزتر نی. دۆست و ناسیاو برادەرت هەموو بە هیچ دەزانی، لەگەل (تری!) خۆت نەدەحەوایەوە، توخوا ئەوە پیاوەتی‌یە یا ئازایەتی، ئەوەی تۆ لەگەل باوکتت دەکرد مندالیش نایکا. ئەو ئازارەی تۆ بە باوکت دەگەیاند مەگەر گورگ بە مەری بگەیێ، باوکت لەبەر سەرپێچیو سەرەڕۆییت ڕووی نەبوو بێتە ناو خەلك. هەر ڕۆژێ ناوو ناتۆرەیەکیان بۆ دەدۆزیەوە، دایکی ڕەحمەتیشت لە داخی تۆ سەری نایەوە، یەکێکی‌تر بوایە ڕۆژێ بە دەیەها جار دەچوو دەستی ماچ دەکردن، ئەمن نەبام باوکت حاشای لێ دەکردی، شوکری خواو من بکە، لە وون بوون رزگارم کردی، ژیانم بۆت کریەوە، دە بۆخۆت ئەوجا بزانە چۆن بژی!

دەتۆ وەرە تەنها شەوەك، پترنا، بە ڕەزامەندی خۆت لەگەلم بخەوە، ئەوسا قەدری عافیەت دەزانی، دەزانی تامی ژیانی بە جووتە چەندە خۆشە!!

ئاخر لە چ زەمانێکا دیوتە دوو کەس یەکتریان خۆش بویو نەیانەوێ بۆ یەك بن، ئەوا شیرین و فەرهادو ئەوا لەیل و مەجنون و خەج و سیامەند، هەزارانی وەکو ئەوانیش، کێ بەوە ڕازی‌یە دوو کەس، ئافرەت و پیاوێ یەکیان خۆش بوێ تەنها دوور بە دووری، جا توخوا خۆشەویستی وا چ تام و لەزەتێکی هەیە، جگە لە سووتان و خەم و دووری، بۆ تۆ تەنها بیر لە بیروباوەڕی خۆت دەکەیەوە؟! ئەی ئەو وتە بە نرخانە چی لێدەکەی کە لە دێر زەمانەوە، خەلك وەکو شتێکی پیرۆز گوێیان بۆ ڕادەگرێ، ئەفسانەیین، ئەفسانەیی نین، چ هەقیان هەیە، خۆ فێنکیو ئارامیەکیان پێ دەبەخشن. توخوا

کام وتە بە نرخ ترە (سووتان و عەشق و ئاگر تێبەربوونی بێ ئامانج)یان (جاران ژن و پیاو یەك پارچە بوون پاشان لێك بوونەتەوە، بۆیە هەنووکەش بەدوای یەکتر دەگەڕێن تا ببنەوە یەك) وا دیارە لەبەر ئەوەشە من بە دوای تۆدا ویل و سەرگەردان بووم. بێئۆقرە دەسوڕامەوە، ماندوو و مردی بە دواتدا دەگەڕام، تا بتگرمە باوەش و ببمە تۆ، ئەگەر وانەبوایە بۆخۆم لێم پال دەدایەوە چ خۆشم تووشی ئەو هەموو گیرمەو کیشەیە نەدەکرد. خەریك بوو بۆت شێت ببم، وەکو ئەوانەی بە شێت

بوونت دان. کەچی تۆ هەر گوێشت لێنەبوو، سیحرباز، شەیتان، ئەوەی چاوی پێت بکەوێ دەموودەست عاشقت دەبێ، چاو تروکاندنێکت بەسەر بۆ ئەوەی هەزارەها بەسەرگەردانی دەشت و کێوان بکەی. منت وەکو پووش، ئاگر تێبەردا، دەنکە گەنم ئاسا هاریمت، وشکت کردمەوە، بە قسەیەك هەڵتدەپەراندم. گوایە منت خۆش دەوێ. هەر بە قسە وابوو دەنا گاڵتەت پێدەکردم، درەنگ بۆم ڕون بۆوە، ماوەیەکی زۆر لە گوێی گادا خەوتبووم، دەنا هەر زوو پیلانەکەم بەئەنجام دەگەیاند. خۆم وا نزم و ڕیسواش نەدەکرد، داوێکی چاکم بۆ نایەوە، دە هەنووکەش لە ژێرەوە بووم، بەڵام هەنووکە خۆم بە پیاو، ئازاو گەورە دەزانم، لەوساوە حەساومەتەوە. خۆش بوو کە دەهاتی، بە جۆرێکیتر دەدوایو ئیتر بابەتی جارانت دووبارە نەدەکردەوە، بەشێوەیەکی تر دەهاتیە پێش. منیش کەیفم بەخۆ دەهات. گرانم دەفرۆشت، وام لێکردی دەستم ماچ بکەی، ئەدی ئەوە زیرەکیو زۆرزانیو گەورەیی نییە، هەم تام و لەزەتم لێ وەرگرتی هەم ژێریشم خستی. تۆ ئاگات لێنەبوو چ بەزمێکم پێکردی، کە تەواو بووم پێم عاردی نەدەگرت، خەریك بوو بەرەو ئاسمان بیمەوە، بەرز بوومەوە، گەورەتر بووم. هەنووکەش بەرزم، گەورەم، تازە دۆڵ دراو تەقەی برا، تۆ دۆڕاندت، من بردمەوە. هەنووکەش حەزم لێیەتی، ئاخر جوان و شۆخیوا خۆش مەشرەبە، پیاو سەرخۆش دەکا. پیاو بە دەست خۆی نییە شەوو ڕۆژ دەم بنێتە گیانی تێر نابێ. وەختە بوێ شێت بم، کچێ دەی دەی قابیلە چی بووە، ئەمن دە ئەوەندە بە قەدەر ئەزیەت و ماندووبوونی تۆ، ئەزیەت و ماندووبوونم دیوە، پاك لە پاك، هەردووکمان وەکو یەکەین، بمتوانیایە هەر زوو وازم لێدەهێنای، ئەدی ئەو هەموو گیرمەو کێشەیەم بۆچی کردوە.

(ئەو دەمەی زۆرم حەز لێیە، زۆری نەماوە خۆم هەڵدەمە سەرت) دە وەرە پێش، لێم نزیك بەوە، جاری وەختی ڕق و گلەییو شتیتر نییە، ئیمشەو بۆ ئەوە نییە بە قسەی قۆڕ بەسەری بەرین، شتی ترمان لە پێشە، ئەوانی تر بخە قالیی سوحبەت، بێزاربوونی چی، تەرەماشی چی، بابە ئەوەی هەنووکە مەیلم لێیەتی بۆم جێبەجێ بکەی. هەرچی دەڵێی وا دەکەم، پەشیمانم، سەد جار پەشیمانم، من هەڵە بووم، پێی لێدەنێم ناپاکیم دەرهەق کردی، بەس تۆ ڕازیبە، هەرئێستا بۆت سەد جار وەکو جاران بە چۆکدا دێم، خۆم وەکو جاران لێ دەکەمەوە، داشیدامە چۆنە وام هەڵسوڕێنە. چیت دەوێ وادەکەم. بەڵام وەرە با هەندێ هەڵتپێشێوم. وا دەمم ئاوی کردوە، سۆزگ بووم کچێ تۆ خۆشی، لەزەتی دنیاش هەموو وا لە جەستەی بەلورینت کۆ بوتەوە، هەقمە بۆت شێت بم، ئەوانی تریش هەقیان بوو، بریا کارو ئەنجام بە جۆرێکیتر بەم شەوەی دەگەیاندین، نازانم چ مەرەقی تەنهاییو گۆشەگیریت گرتبوو، ڕەبەنایەتی چیو دوورکەوتنەوەی چی، ئێئێ بابە هەموو شتێ تۆ دەتگوت: ڕاستە، تەنها بە دەمی خۆت بڵێ شووت پێ دەکەم، بەم جۆرەی هەنووکە نا، بەوەی جاران داوام دەکرد. ئەمە بۆ ئاورێکمان لێ نادەیتەوە، قورم قەپ ڕووی لەولا کردوە، وەختە شێت بم، دەشتێ بڵێ، سبەینێ کە هاتین وا نەبوو، نازانم بۆ لەوەتەی هاتووینەتە ژووری، یەکسەر گۆڕا، ئاخۆ بیر لە چی بکاتەوە، لە دنیایەکی ترە، تۆ بڵێی ئیمشەویش وەکو جارانی لێنێتەوە، نا، بابە، نا، تازە ژن و مێردین، هەر منی هەیە، خۆ ناچێتەوە لای باوکی، حەدی چییە، ناوێرێ، چما بچێتەوە نایکوژێ، تەلاقی نادەم، بچێتە پەرەکەی ئاسمان، هەموو شتێکمان براندۆتەوە، ئەو پەشیمانە لەو هەڵس و کەوتانەی پێشان دەیکرد، خۆی گوتی: هەنووکە شوو کردنم لا ئاساییە، جاران دەترسام، بەڵام پاش ئەوەی تاقیم کردەوە، بیروڕام گۆڕی. ئافرەت بۆ شووکردنە!!

لە کوجەتۆ، کونۆتۆ، نازانم چی، دیکورا، دیکاردۆ دیکۆرت نازانم کێ پەشیمان بووە، گوتی: چیدیناوێ ئەو فەیلەسوفانەی مێشکیان کاس کردبووم ناهێنم، (شووکردن تاوان نییە) منیش ئەمەم دەویست، گوێی خۆم گوێم لێبوو وای پێگوتم، دەبا هەنووکە وا ...زیك مەبەوە، پەنجە لە لەشم مەخشێنە، ناهێڵم کە...ل لیم نزیك بێتەوە، ئاوەگڵ دەبم، با بچم هەندێ بیگوشم ئەوجا چی دەڵێ با بڵێ، تازە هیچی پێناکرێ، من هی خۆم کردوە، تازە با هاواز کا بەچی دەچێ، ئیمشەویش بای باڵی خۆم دەدەم، تا مر دەبم دەمی تێ دەنێم، چۆن دەتوانێ سەرپێچی بکا. ژن و مێرد ئەی بۆچی ژن و مێردە، حەرامیش نییە مێردی ئەوم، ئەوەتا بەتەنێ لە ژوورێکین، کوێم بوێ دەست لەوێ دەدەم، لە بنی پێی تا تەوقی سەری مولکی منە، پەنجەی پێدا دەخشێنم، لە جیاتی جاری، سەد جار دەیلێسمەوە، ماچی دەکەم، سەرپشت،

لەسەر زگ، چۆنم بویّ وا دەکەم، قبول بکاو نەکا ئەوەیە، با بچێ سەری لە دیـوار بدا، وای برا خۆشـە، خەریکـە لە خۆشیـان دەبـوورێمەوە، نازانم نە پێبکەنم نە هەستم سەما بکەم، ئەگەرچی جارێ زووە بەلام من تەنگاوم. کێچ کەوتۆتە لەشم، با لێی بچمە پێش. تەمـاشا تەماشا، بزانە ئەو قژە قاوەییە جوانەی، شەوق دەداتەوە، ئەوە بە چی وای لێکردوە؟! روخساری لەگەڵ مانگ شەڕ دەکا، ئاخۆ چ خۆشی‌یەکە دەست لەناو ئەو تاڵەموانەی بێنی‌و بەی، چ لەزەتێ لە مزینی لێوەکانی بچێژی؟! هەنووکە سەرم لەسەر ئەو هەرمێیانەی سەرسنگی نەبـوایـە، هەر لەوێ تا مردن خەوم لێ کەوتبایە، هیچی ترم ناوێ، لەوێشم بشارنەوە، گۆڕێکی بچووکم لەوێ بۆ لێدەن و لەوێم بشارنەوە، پڕی دەمێ چۆنە، قابیلە چ دەقەومێ، حەلاڵی خۆمە، بە دەفتەرو قەلەم وا نووسراوە، تۆ بڵێی بهێڵێ لەوێ پشی‌یە خەوێ بکەم! با جارێ ئەوێ بمێنێ، جارێ شتی‌تر لە گۆڕێ‌یە، بەشی ئەو زۆری ماوە، تەمەنێکی دوورو درێژە، چ زۆریش شەو زۆرە، جارێ تەنیـا لێی نزیـك دەبمـەوە، با ئەوانی دی بمێنێ، بەڵکو هەر بەتەواوی لەگەڵم ئاشت دەبێتەوە، تۆ بڵێی رازی بێ‌و بتوانم باسی پیلانەکەی بۆ بکەم! یا تۆ بڵێی خۆم بۆ شتی‌تر هەڵگرم و تام و لەزەتی لەشی لەبیر بکەمەوە! کورە وەڵـلاهی وابـزانم پێم ناکـرێ، ئەوا ئەمن لەسەر ئاگر راوەستـاوم، پێم ناکـرێ، خۆم پێ راناگیرێ، هەر ئێستا بێ سێ‌ودوو دەیخەمە ژێرە خۆم و تا مر دەبم دەمی تێ دەنێم، هەر ئەو هەوە، ئەوی‌تر هەمووی فشەیە، ئەدی بۆ چیم هێناوە، تا بۆم بوو خەریکم بەو ژیـانم لەسەر دانێم، ئاخر بە کەراتی نابی، هەوەل جار بە قسەی خۆش دلی رازی کە، بیدوێنە، قسەی عەجایبی بۆ [illegible]ەم، بە پێکەنینی دێنم، کە زەوقی بۆوە، ئەوسـا هەمـو[illegible]ڤاسـانـە، خۆ بە قسـە نی‌یـە، داوای لێبووردنی لێدەکەم، [illegible]ابیلە نەم بووری، جا بۆ نەم بووری، نەبـوتـە ژنم؟ من پیـاوی ئەو نیم؟ هەمـوو ژیـانی لەگـەلم بەسەرنابا؟! بۆیە پێویـستە بمبووری، لێم دەبووری دەیبوورم، بمبـووری باشـترە، دەیبـوورم باشـترە، لێی دەپارێمەوە لێم دەپارێتەوە، وەکو جاران سوجدەی بۆ دەبەم، بابە پەشیمانم، نازانم بۆچی هەندێ جاران خۆم زۆر بێ هێز دێتە بەرچاو، بێهێـز دەبم، وا دەزانم هەر لەسـەر دنیاش نیم، لەبەر ئەو پارچە زێرە بچووك دەبمەوە، کە لێی دوور دەکەومەوە خۆم بە گەورە دەزانم، بەلام کە تەماشای دەکەم بەردلم دەگرێ. ئاخر لەوەتەی هاتووینەتە ژووری، خۆی لێم گرتوە، قسەم لەگەڵ ناکا، بۆ دەرمان ئاورێکم لێ ناداتەوە، تەنیا لە ژێرەوە لێم مۆر دەبێتەوە، لێی دەترسم، وەکو جارانی لێبێ. بە فیزەوە لەگەم بجوڵێتەوە، لەژێر کەوتنەکەی پەشیمان بێتەوە، بەزمێکی ترم پێ بکـا، کە لێی وورد دەبمەوە، وەکو پێشان لەبەرچاوم دەبێتە تەلسمێکی سیحـراوی، قفـل دەدرێتـەوە، خۆشم لە ژێـرەوە دەبینم، هەست دەکەم من دۆڕاندوومە، ئەو لە سەرەوەیەو من لەژێرەوەم.

* * * *

«پیـاوەکـە» بە ترسەوە چوە پێش، لە تەنیشت «ئافرەتەکە» دانیشت، ماوەیـەك کەڵـەبـاب ئاسا بە دیاریەوە هەڵتروشکا. زمانی بوە تەڵەی تەقیو، نەوێرا بڵێ لەڵ، بەلام ئافرەتەکە لێی دوور کەوتەوە، کشایەوەو ڕووی بەرەو ئەو دیو وەرگێرا، هەر ئێستـا زۆرانبـازیـەکە دەست پێدەکا، لێدانی دڵی پتر دەبێ، ڕەنگێ دێنێ‌و ڕەنگێ دەبـا، بیر لە چۆنیـەتی شالاو بردن و راوەشـانـدنی چەقـۆکـەی ژێـر دۆشەکەکەی ژێری دەکاتەوە، مێشکی ماندووە، لە مێژە، چەند مانگێکە، لەوەتەی پیلانەکەی بەسـەر سەپێنـراوە، بۆ دەرفـەتێکی وا دەگەڕێ، تا گەیشتۆتە ئیمشـەو کوێرایی چاوی داهاتوە، ئیمشەو گرنگترین ساتە لە ژیـانی‌دا، زینـدووبـوون و مردنی لەسـەر پایـەی ئیمشـەو راوەستـاوە، یا دەبێ شتێ بکـاو بژی، یا دەبێ بمـرێ، کە دەست وبـردی کردو شالاوی بردە سەر، دەبێتـە مرۆڤێکی‌تـر بیرکردنەوە وەکو ڕەشەبا مێشکی دەهەژاندەوە، بینی لە ئاست بالای ئەودا لەنگەری بەستبوو، گوێی لە هیچ نەبوو، هیچی نەدەبینی، گوێی لە وورتە وورتی پیاوەکە نەبوو، چ دەڵێ‌و چ ناڵێ، لەدنیایەکی‌تر دەخولایەوە، «پیاوەکە» بێئاگا خۆی ڕەپێش دەکرد، بەردەوام دەمی دەجولایەوە، ئا لەم ساتەشدا ئافرەتەکە بە شڵەژاوی ڕووی وەرگـێرا، دەستی درێـژکـرد، لەژێـر دۆشـەکـەکـە چەقـۆکـەی کە هاتنە ژووری لەوێی دانابوو، دەرهێنا، خۆی سوڕاند، بە چاوی پڕ خوێن و تۆڵەوە لە هیکرا رایـوەشـانـد، یەك و دوو سەرسنگی کابـرای گرتەوە، خوێن فرکـەی کرد، چەنـد جارێکی تریش رایـوەشاند، کشایەوە، خۆی گەیـانـدە بن دیواری لای دەرگاکە، پاڵی دایەوە، لێی راکشـا، چاوێشی بریـە لاشـە گەوزاوەکـەی ساتێ لەمەوبەر

بەخۆی‌و سەرکەوتنەکەی دەنازی‌و کەشخەی لەسەر ئەم لێدەدا، دەتگوت لە شەڕێکی جیهانی زۆر گەورە گەڕاوەتەوەو سەرکەوتنی ئەم ناوەی پڕکردوە.

تازە لە مردن ڕزگاری بوو و ژیانێکی نوێی بۆ خۆی ڕەخساند، دەمارەکانی مێشکی هێدی هێدی هاتنەوە شوێن خۆیان، حەسایەوە، هەستی کرد ئەو قورسایی‌یەی چەند مانگێ بوو لەسەر سنگی دانرابوو، لابردراوە، وایدەزانی زۆر سووك بووە، بەرەو سەرەوەش هەڵدەکشێ، ئیتر تەواو، کۆتایی بە شانۆگەریەکی زۆر تراژیدی هات. بووە پاڵەوانێکی مێژوویی‌تا لە داستان[illegible]ی بکرێ. بابەتی وا ڕۆمان و چیرۆك و سەرگوز[illegible]تەی ڕۆمان نووس و شاعیرو نووسەرانە. با شتی لێ‌هەڵێنجێ. وەڵامی ڕاستی بۆ هەموو ئەو ووتانەی لە ئاستیان دوشدا دەما دۆزیەوە، هەنووکە دەیتوانی وەکو دیکارت دووبارەی بکاتەوەو بڵێ: من جوان و پاك و بەهێزم، کەواتە هەم. بۆ گەورەیی خۆم دەژیم و، بۆ بوونی خۆم تێ‌دەکۆشم.

تازە ئاسودەو کامەران ئەو تەمەنەی ماویەتی بەتەنهاو بە ڕەبەنایەتی دەژی، لە کەس نزیك نابێتەوە، ناشهێڵێ کەسێ گەمە بە لەش و ئەندامەکانی لەش و بیروباوەڕەکانی بکا. بۆ چوونەکانی خۆی هەموو بە ڕاست دەزانی. بۆ جاری دووەم لە دایك بوتەوە، پاك و جوان و پیرۆزە، وەکو بەفر سپی‌یە، وەکو منداڵ پاکە، وەکو گوڵ جوانە، چیدی بیر لە ڕیسوایی‌و بچووکی‌و بێ‌هێزیی دوێنێ‌ی ناکاتەوە. ئیمشەو مرۆڤێکە خاوەن ویست و کەرامەت و شکۆمەندە، ئیمشەو پتر لەسەر بۆچوونەکانی پێ‌دادەگرێ. ئیمشەو پاڵەوانی دنیا هەمووی بۆی بێتە زۆرانبازی خۆی پێ‌یان ناگۆڕێتەوە. بە ڕقەوە سەرنجی ئەو کەسەی ڕۆژێ لە ڕۆژان خۆشی دەویست، ئەو کەسەی بە ڕوح خۆشی دەویست، دەدا. ئیمشەو دوژمنێکی زۆر گەورەیەتی، لە هەموو کەسێ پتر ڕقی لێ‌یەتی.

(بەو جۆرە نەبێ ئیسراحەت ناکەم، مێشکم ناحەسێتەوە، ڕێزو حورمەت و گەورەییم بۆ ناگەڕێتەوە، گاڵتەی بە قسەکانم دەهات، بە شێت و کەم عەقڵی لە قەڵەم دابووم، بێ دەسەڵات و هیچ لەدەست نەهاتوو، وایدەزانی پاش ئەوەی پیلانەکەی بەسەرمدا سەپاند، ئیتر تەواوە، خۆمم لەدەست داوە، ئیتر سەر هەڵدەگرم لاوشەو ڕووناکی هیوام کوێر دەبێتەوە، ناچار دەبم لێی بپاڕێمەوە، بۆ ئەوەی قبوڵم بکا، پێم ڕازی بێ. ئەویش وای دەویست، مەبەستی ژێردەستە کردنی من بوو، دەیویست وەکو ئامێر، بە پلاك، چ وەختێ بیەوێ پێم بکاو چ وەختێ نەیەوێ بمکوژێنێتەوە، من پلاك و گلۆپ نیم، من مرۆڤم، هەست و بیرو هۆشم هەیە، هەروەکو ئەو هەموو مرۆڤەی سەرزەمین بیر دەکەمەوە، خاوەنی بۆچوونی خۆمم، لەگەڵ ڕاو ئارەزووی خەڵك یەك ناگرمەوە، حەقی خۆمە، بۆ ببمە لاپەڕەیەکی کۆپی کراوی یەکێکی‌تر، بۆچی کت ومت یەکێکی‌تر بم، هەموو کەسێ لە ژیان باوەڕی بە شتێ هەیەو لە پێناوی‌دا تێ‌دەکۆشێ، هەوڵ دەدا تێیدا سەربکەوێ، لەوە پترم نەکردوە، مافی کەسم نەخواردوە، تەنها ویستومە چۆنم دەوێ وا بژیم، خەڵك چ کاری هەیە، هەقی چی‌یە، من نامەوێ شوو بکەم، کاتێ یەکێ بەنیازێ تەماشام دەکا، کانیاوی ڕقم هەڵدەستێ، حەزم لێ نی‌یە لە پیاو نزیك بمەوە، دەمەوێ دوور بم، دەست گەمەو گاڵتەم پێ شتێکی دوور لە حورمەت و ڕێزە، دەمەوێ تا ماوم لە ژیان بە پاکی بمێنمەوە، باوەڕم بە پاك بوونەوە هەیە، نامەوێ کەس پەنجەو لەشی لە لەشم نزیك بخاتەوە، هەتا بە تۆقەکردن شەرم دامدەگرێ، کە یەکێ بەم جۆرە دەبینم یا شتێکی لەو بابەتەم گوێ لێ دەبێ بێ‌ئارام و وەرس دەبم بۆیە تا پێم بکرێ لەم جۆرە باس و بابەتانەی دەربارەی ئەم شتەن دوور دەکەومەوە، حەزم لێ‌یە دوورە پەرێز ڕاوەستم، لەویش وا گەیشتبووم، دەمزانی بۆ ڕابواردن و لەزەت وەرگەتن منی دەوێ. پێش چەند ساتێ ئەوەم لە چاوی دەخوێندەوە، دەمزانی چ شتێ لە مێشکی دەخولێتەوەو بیر لەچی دەکاتەوە، چاوەی پڕ شەه[illegible]ت بوو، بەڵام خەیاڵی خاو بوو، مەگەر بمرم!

قەپرغە ئەستوور، سەگی برسی[illegible]ی، جاران کە مرۆڤ بوو خۆشم دەویست، وام زانی فی[illegible]ـیە، بەڵام نەمزانی گورگەو لە پێستی مەڕ خۆی شاردۆتەوە، ئاخۆ قوڵی چەندانێکی تری بەم جۆرە بڕیوە. لای خۆی گوایە خواپەرست و پاك و خاوێن و باوەڕی بە دوا ڕۆژ هەیە، بە قسەی لووس هەزارکەسی‌لەخشتە دەبرد زمان لووس و درۆزن، دەتگوت لەگەڵ شەیتان پەیمانی بەستوە، ڕێ لە خەڵك وون کا، بیانخاتە ناو قوڕو چڵپاوو چاڵیان بۆ هەڵکەنێ، خۆی بە دکتۆر «فاوستی» «گۆتەش ناگۆڕێتەوە، تۆ بڵێی دکتۆر «فاوستی» نەخوێندبێتەوەو کاری تێ نەکردبێ. ئەدی بۆچی زۆر

شتی وەکو ئەو دەکرد، من کاری تیّ نەکردبیّ، ئەدی بۆچی زۆر شتی وەکو ئەو دەکرد، من وای بۆ دەچم نهێنی یەکی زۆر گەورەی لەبن سەردا بوو، بەڵام حەدی چی یە دەگاتە ئەو، پیاویکی وەکو «فاوستی» زاناو بلیمەت، بیّ مێشکێکی ئەو ئاسای تیّ نەگەیشتوو، بە خزمەتکاری بەردەرگای ئەویش شایان نی یە، پیس و چەپەل، هەر ئەوەندە قسە بهاتبایە سەر خۆشەویستی و خواپەرستی، بە قسەی لووس و زۆرزانی و هەزارەها سەرگوزشتەی ئەفسانەیی و پر خرافیان دەیخستی یە سەر ساجی عەلی.

(ژن و پیاو لە سەرەتاوە یەك جەستە بووینە بەڵام پاشان بیّ ویستی خۆیان لیّك دابراون، بۆیە هەنووکەش بەدوای یەك دەکەرێن تا ببنەوە یەك)

وا دیارە بە مشار لیّك کراونەتەوە، خۆ تەختەو بزمار نین پیّك وە بنووسیّنەوە، مّن نامەویّ میخ بەندم بکەن، لەخاچی ژن و میّردایەتیم بدەن، با ئاوەگڵ نەبم. بۆچ پۆخڵەواتی و هەراوهۆریاو خراپی چەندەها ساڵ بەسەر خۆمدا برێژم، من ئەوە ناکەم، ،خۆم بەشتیّ نابەستمەوە باوەرم پیّی نەبیّ، من ویستم زۆر جیاوازە، لەگەڵ ویستی خەڵك کەم یەك ئەگریتەوە. برینداریش بکرێم درەنگە برینم ساریّژ دەبیّ، یەکیّ خراپەیەکم لەگەڵ بکا بە تایبەتی خراپەیەکی لەو جۆرەی ئەو لەگەڵی کردم، لەبیرم ناچێتەوە، نەفامی گێل و وێل، مرۆڤ هەیە شتی وای لەگەڵ بکریّ لە پیّناو تۆڵە سەندنەوە خۆشی لەناو ببا تەقەی سەری دیّ، ئاخر زۆر شت هەن لەبیر ناچنەوە. راستە هەندیّ شت هەن وەکو بلقی سەرئاو زوو پەرت و بلاو دەبنەو، زوو لە بیر دەچنەوە، بەڵام زۆری تر هەن مەحاڵە، چونیّ هەتا ئیّسقان شۆر دەبنەوە، ژیان تاڵ دەکەن، بۆیە پیّش[illegible]ەی چەقۆکە راوەشێنم، خۆم بە هیچ نەدەزانی، زەلیل و [illegible] و بیّ دەرەتان، رقم لە خۆم دەبۆوە، بەڵام لەوەتەی لاشەکەتم خەڵتانی خوێن کردوە، وا خەریکە لە خۆشیان قاقا پیّ دەکەنم، برینم ساریّژ بووە، سەمای سەرکەوتن سازدەکەم، با هەتا نەتوییوە، بمبینیّ شتوّ ئادەمیزادی خاوەن ویست و گەورەو بەهیّزم، با بزانی شتوّ سەما دەکەم،

* * * *

ئافرەتەکە هەڵدەستیّ و لە جیّوە دەکەویّتە هەڵەکە سەما ماوەیەك لە جیّوە سەما دەکا پاشان بەرە بەرە لە لاشە گەوزاوەکە نزیك دەکەویّتەوە، ماوەیەك دۆشدادەمێنیّ، پاشان بە دەوریدا دەسوریّتەوە، ئەم دیو ئەو دیو دەکا. رادەوەستیّ، بەووردی، بە رقەوە لیّی وورد دەبیّتەوە، قاچیّ بۆ پیّشەوە، هەتا سەر سنگی، دەیهیّنێتەوە جیّی خۆی، ئەم بەرو ئەو بەری پیّ دەکا، پیّشەوەو دواوە، تەنیشتی، بە جۆریکی تر، ئەندامەکانی لەشی دەهەژێنێتەوە، بازەدا، خۆی خوار دەکاتەوە، لیوّی دەجولێنێتەوە، بیّ مۆسیقا، لەسەر نزمی ئیقاعێکی شێتانە ئیقاعی دل و دەروونی، جوانتر جوولانەوە بە پانتۆیم نیشان دەدا، بالیەیەکی سەیرە، سەمایەکی سەرەتایی یە، لە شیّوەی سەمای هیندیە سورەکان، باڵی ی هاوچەرخیش هەربەم جۆرەیەو بەم شیّوەیەش هەست و نەست دەردەبریّ، ویستیکی پۆلاینە، هەولدانە بۆ مانەوە، بیّ ئەوەی ماندوو بیّ، گەرمترو بە جۆشتر خۆی هەڵدەدا، سەمای ژیانیکی نویّ یە، «زۆرباش»کاتی خۆی بەم جۆرە هەست و نەستی خۆی بەرامبەر ژیان و لەزەت وەرگرتن و خۆشەویستی ژیان دەربریوە، ئیمشەو چەند بەختەوەرم، لە جاران پتر خۆم بە گەورەو بەرز دەزانم، من پاك و پیروزم، کەواتە هەم، ئەوەی پاك و جوان بیّ پیروزیشە، وەکو کلوّی بەفر سپی یە، ساف و سپی وەکو گەوهەرە، ئەوەی دەیەویّ با عاشقم بیّ و بوّم بسووتیّ، بەڵام لە دوورەوە، با لیّم نزیك نەبیّتەوە، مەحاڵە بهیّلم یەکیّ پەنجەم لیّ بدا، با عەنتیکەبم، من وا بیر دەکەمەوە، خۆشەویستی تەنها بە روح، ئەوەتا ئەوەی رۆژیّ لە رۆژان لیّم نزیك بۆوە چی لیّهات، ئەو ناپاکی یە نەبوایە نەیدەتوانی لیّم نزیك بیّتەوە، نەمزانی چ شەیتانیّ چووە بن باڵی، وای کردم لەبەرچاوی خۆشم بکەوم، وەرە بەشەر تۆ ئەوها گلاوو پیس و نەگریس بیّ. من هیّندەی لە خۆم دوور دەخستەوە، ئەو هیّندە پتر پیّی دادەگرت. بۆیە لەژیرەوە کەوتە داودانان، چاڵیکی قووڵی بۆ هەڵکەندم، وەکو کویرەش کەوتمە ناوی، بەناو قورو چلپاودا نقومی کردم، ژیانی لیّ تیّك دام، بیزاری و بیّ ئۆقرەیی تا بینەقاقام هات. ئاخر من رقم لەو کەسەیە بیر لە شوووکردن دەکاتەوە، ئەو کچەی باوەریکی تری هەبیّ دوژمنمە، ئافرەت بیّ شووکردن پیرۆزە، شووکردن مردنە، خوێن هەلدەمژیّ، مرۆڤ دەتاوێتەوە، ئاگای لەخۆی نابیّ، وەختیّ هەرهیّندە دەزانیّ پیر بووەو ئەوساسویّ بوونەوە پارە ناکا، مخابن نی یە مرۆڤ زوو پیر بیّ، با شوو نەکا زوو پیر نابیّ، پیر بوونی دوا

دەکەوێ.

من بەفریکی سپیم. گوڵێکی جوانم، من پیرۆزم، بەهۆی منەوە شاخ و کێوو ئەو بستە خاکەی بەسەریدا رادەبووروم بەهادارو پیرۆزە.) کەم کەس بەم ووتانە رازین، دەیانگوت: مرۆڤێکی بە فیزو روح گەورەیە، خۆی بە زل دەزانێ، هاوتەمەنەکانم زۆریان رق لێم دەبۆوە، با رازی نەبن و رقیان لێم بێتەوە. تازە دنیا بە هی خۆم دەزانم، پەشیمان نیم لەوەی گوتومەو لەوەی ئیمشەو کردومە، بەدەست خۆم نەبوو دەبوایە وابکەم. بە تێگەیشتنی خۆم من راستم، تاوانم نەکردوە، خەڵك چی دەڵێن با بیڵێن. من هەقم، ئەو ناهەق بوو، تاوانبار، [illegible]کور، [illegible]رە خۆرە، من راستم، کە واشم کردوە شتێکی پال[illegible]م بە ئەنجام گەیاندوە، بابەتی گێڕانەوەیە، با بیگێڕنەوە. با بەو شتەوە بناسرێم، ئەوانەی گوێم بۆ شل دەکەن. جیاوازم دەکەنەوە لە خەڵکی ئاسایی ئەوا من رێم خۆش کرد، با ئەوانەی وەکو منن خۆیان بدۆزنەوە، با خەڵك خۆی بدۆزێتەوە، ئەوەی لە گەڵیشم نییە، با پیرۆزبایم لێنەگا، بە نەفرەتیشیان رازیم. گرنگ ئەمهێشت ویستم ژێر بکەوێ. پێی بەرز بوومەتەوە، لە جاران پتر شانازی بەوە دەکەم خاوەن بیروراو ویستێکی پۆلایینم، لە خەڵکی ئاسایی جیاوازم. خۆم بە مرۆڤێکی بەرێزو حورمەت دەزانم، لەژێرەوە نیم. دوێنێو پێرێ وابووم، ئیمشەو بەرزم، رەزا سووکم هەوڵم داو بەدوای خۆم گەرام، خۆم دۆزیەوە، هەنووکە دەزانم من کێم و بۆچی هەم. خەڵکیش وەکو چۆن خۆم دەناسم ئەوها دەمناسێ. ئەوەی نەزانی کێیە لە ژێرەوەیە، بێهێزە، سەرناکەوێ تا خۆی نەدۆزێتەوە.

با وەکو من بێ. ئەوا من خەریکە بەرەو ئاسمان دەفرم و لەسەرەوەش تەماشای ئەوانەی بێتوانان دەکەم، هەنووکە هاوار دەکەم با بێن بۆیان بگێڕمەوەو پێیان بڵێم من گەورەو بەرزترم، با ئاشکرا بێ پێم خۆشە. بڵێن: تاوانبارێکی نائاساییە. سوبەرمانە. ئاخۆ ئەو چۆن خۆی دێتە بەرچاو، گەورە، بچووك. نە، ئەو گەورە نییە. بچووکە. زۆر بچووك. لە دەنکە گەنمێ بچووکتر. جاران پێش ئەوەی ناپاك بێ، لەبەرچاوم گەورە بوو بەلام ئێستا لە هیچ هیچترە. خۆشم ناوێ. ژیانم خۆش دەوێ. بۆیە خۆم نەکوشت. زۆر جار بیرم لە خۆکوشتن کردەوە. بەلام لەبەر ئەوەی تاوانبار نەبووم. ژیانم لا پێویستتر بوو. چونکە ژیان خۆشە لە هەر کوێیەك بێ. قوون دەرگایان بکەوێ. ناخۆشترین جێ. کوێی دەڵێن دەچم، سیبریا، ئەفریقیا، دانی پیادەنێم، زیندان زیندان، بەندایەتی لەوە خۆشترە، لەژێرەوە حەسرەت و داخ بمکوژێ، ژوورێکی بچووك، بێدەرگا، پەنجەرەی تێدانەبێ، بارووبەرەکەی دوومەتر بێ، با ساپیتەی زۆر نزم بێ. هەر ئەوەندە بێ کە بتوانم خۆمی تێدا بجووڵێمەوە، تەنها با بتوانم بە پەنجە سەرو قژو روومەتم، ئەندامەکانی لەشم بەسەر بکەمەوە. بۆچ وا سەیرم دەکەی مۆنی ناپاك، سەگسار؟ بەزەیشم پێت دێتەوە، خۆ من وەکو تۆ نەگریس و ناپاك نیم، وەرە دانی پیا بنێ کە ناپاکی، دانی پیا بنێ کە بچووکیو لەژێرەوەی، بڵێ تۆ بەهێزو پاك و پیرۆزو جوانی، ئەوا سبەینێ زۆر بەرێزو حورمەت دەتشارمەوە، بەشداری لە کۆڕەوی شاردنەوەشت دەکەم، لە زیندانیش پرسەت بۆ دادەنێم. ئەها چەند گەورەم، چی، ئێ، گوێم لێ نییە، ئەوەم پێ خۆشە، باشە کوێت دەوێ، کام گۆڕستان تا لەوێت بشارمەوە، منگە منگی ناوێ، ئەگەر وانەکەی لێرە بکەوە، من وا دەڕۆم و تازە تۆ نەماوی، زۆرت نەماوە، هەر ئەوەتە دەجولێیەوە، من دێم هەڵتدەگرم، دەتبەمە سەر سیمەکە، دەتەوێ ئەگەر بەربووم بێمە سەر گۆڕت، باشە دێم؟!

(ئاخ خەریکە دەمرم. ئێرە کوێیە؟ من لە کوێم؟ ئەو ژوورە بۆچ وا لەبەر چاوم تاریك داهاتوە؟ ئەی ئەو شتانە چین وا لەبەر چاوم دەجولێنەوە؟ وەرە پێش، لێم نزیك بەوە! تۆ لە کوێی؟ کوا ناتبینم؟ سەیرە، ئەو خەڵکە بۆچ وا سەما دەکەن؟ زەماوەندی کێیە؟ پرسەیە؟ بۆ کێ مردوە؟ من یا تۆ!! ژن بۆ کێ دێنن، جا توخوا ئەوە چییە سەمای تێدا بکەن!! ژووریو شاییان نەگوتوە؟! برۆنە دەرێ، گۆڕە[illegible]ی بەردەمی ماڵی باوکم جێیەکی زۆر باشە، راوەستن من[illegible]دێم، شایی خۆشە، زۆرم حەز لێیە هەڵپەڕم، هێشتا مان[illegible]بوویمە، بۆ من چیم لێهاتوە؟! راست دەکەی ئەو خوێنە...؟

لاشەکە بەرە بەرە خاودەبێتەوە، هەردوو دەستیشی بەم لاو بەولادا شۆڕ دەبێتەوە، ئاوزینگ دەدا، «ئافرەتەکە» دەکشێتە دواوە، زۆر دوور دەکەوێتەوە، جارێکیتر پشت بە دیوارە رەق و تەقەکەی جاران پشتی پێدادابوو دەدا. ئەوسا بە چاوی ئەبڵەقەوە دەروانێتە لاشەی ئەوەی ساتێ لەمەوبەر خەونی بە باوەشێکی نەرمەوە دەبینیو بە زیندویەتی خۆیەوە دەنازی.

مانگی حوزەیران ١٩٨٦


ئەو پیاوەی
زوو سەری
سپی بوو
●عەبدوڵلا سەڕاج●

باروزروفی وا هەن مرۆ ناچــار دەکــەن کە دەیــان ڕۆژ؛ بگــرە پتریش نە بخواو نە بخواتەوە. هیچیش هەست بە برسێتی‌و تینووێتی نەکات. سەرت سوڕ نەمێنێ لەوەی دەیژنەویت. نە دەم دابچەقێنە. نە بحەپەسێ. پیشەکی دەزانم تۆ بیر لە شتی ئەندامناسی دەکەیتەوە کە زیندەوەر بە خواردن دەژی ـ منیش دەمێکە گوتوومە: خۆراك تەنیا خۆراکی گەدە نی‌یەو بەس ـ جیاوازیمان تا لێرە دایە. ئەمن دەق بە پێچەوانەی تۆوە ئاماژە بۆ بارێکی دیکە دەکەم و بە هەڵەشەیی ناوی لێنانیم و گێلانەش؛ زاراوەی بۆ ناتاشم، جا با لە نووکەوە بۆی بچم ـ قسەی خۆمان بێت، جارێك و دوان پیا دەچمەوە و تێکەڵاوی هەیە لە نێوان کەسی سەرەکی چیـرۆکـەکـەو مندا. چونکە من خۆم لەودا دەبینم و ئەویش لە سەر دەمێکدا مێکی بەد بەخت بووە ـ سەرەتای چیــرۆکـەکـە لەوەوە سەری هەڵـدا کە جارێـك لە جارانی ناموێی‌ ‌و سەرگــەدانیم، ڕێم کەوتــە کوێــرە گونــدێـك. بە ڕێکـەوت خانـە خوێنەکەم جوڵا بوو ـ وابزانم ئەمەت بەلاوە ئاساییە ـ چاکە. جوڵاکە کوڕێکی زنداری هەبوو ـ ئەمەیش باوو سروشتی‌و بەجێیە ـ ئێستاکە ئامادە بەو کوێم بۆ ڕانەکێنەو. . هەڵمەچۆ. خۆ باش دەزانی ڕەش و سپی چییە. تا هۆشت بۆ دوور نەچێت و وا بزانیت کە نیازم وایە لە شەوو ڕۆژ بدوێم یان لە چاکەو بەد فەڕی. . جوانی‌و دزێوی‌و چی‌و چی. ! قســە بکـەم. نەخێر، مەبـەستم «ڕەش و سپی»یـە سادەکەیەو بەس. ناشلێم ڕەنگن ـ چونکــە ڕەنـگ و تۆنـەکـانی لەم چیـرۆکـەدا کاریگەرانە ڕەنگ دەدەنەوە. بە هەر حاڵ، شامم بۆ دانرا. سەرنجم لە خۆراکەکە داو هیچم بۆ نەخورا. جوڵاکە دەمی پرسیاری لێم نا «میوان ئەوە بۆ دەست درێژ ناکەیت؟» گوتم: «ناخۆم ئەگەر. . . .» گوتییەوە: «ئەگەر چی! میوان میوانی خودایە!» بە شێنەیی وشەکانم دەرخــســت «. . . ئەگـەر لەم عاجبـاتیـە ئاگـادارم نەکەیت.» تارمایی خەنـدەیێکی ئەفســوونـاوی لێـوەکانی داپۆشی. گوتی: «بخۆ، بخۆ، دڵنیابەو سەرچاوان.» ئەمن لە دڵی خۆمدا گوتم: دەشێ بە هەڵەدا چووبێت و لەوانەیە ئاسمان و ڕیســمانمان نێوان بێت، بۆیە. . .

ـ ئا پو، دەستم دامێنت، تۆ باوکی ئەم نیت؟

ـ با

ـ ئەی بۆچی ئەو سی ساڵێك لە تۆ بە تەمەنترەو سەرو ڕیشی چەرمووە!؟

ـ ئەویشت بۆ ڕوون دەکەمەوە. پەلە مەکە. ئەوەی بە شوێن ڕاستیدا بگەڕێت دەبێ ئارامی ئەیووبی هەبێ‌و لە بنی کوولەکەکە بدات نەك بە خولیدا گەوجانە بسووڕێتەوە.

ئەمن حەپەساوەکەی پێشوو بووم. ئەو لە سەری ڕۆیشت.

ـ گوتم بۆت ڕوون دەکەمەوە. وەلێ ئەوە تۆو ئەوە ئەو.

خۆی با بەسەرهاتی خۆی بگێڕێتەوە.

گوتم: مردوو لەمە چاکتر نەشۆردراوەتەوە. دەی کاکی برا تەقم کرد. کوڕەکەی ئاخاوتنەکەی لێم وەرگرت و دەمی کردەوە.

لالـۆ، تۆ دەزانی کە چەنـد ساڵێـك لەمـەوبـەر مردم و ئێستاش لە تەکت دانیشتووم!؟ «چرکەم لە خۆم بڕی‌و ئیتر نازانم، ڕوخسارم لە چاوی ئەودا چۆن دەبیندرا» گوێ بگرە. چووم بۆ ڕاو. خوم بووم بە تۆرەوە. دیارە حاڵی دونیا وایە! لە گوند دوورکەوتمەوە. شوێن پێم ڕاستە ڕێ‌بوو. گەز بە گەزی ئەو هەرێمە شارەزا بووم. قولانج بە قولانجی پێــدەشتــەکــە بەڵـەد بووم. «ڕاســت دەکـات. گونـدنشین پێیەندێکی گیانی بە گیانیـان لەگەڵ خاك و سروشتدا هەیە. شوێن پێ هەڵدەگرن. جێ ئاوی ژێر زەوی پەنجە نوما دەکەن و کارێزو بیر لێ‌دەدەن. پێشبینی‌ی باران و ڕەشەباو زریان دەکەن. لاپەڕەی ئاسمان دەخوێننەوە، وەك ئەوەی مانگ و ئەستێرەو کلکدارەکان، پیتی وردو درشتی چاپ بن. با بزانین چی‌دەڵێت.»

لە پڕێکدا، هەڵنووتام و. . . کەوتمە چاڵێکەوە. چاوم کردەوەو چاوم نووقـانـد هەتـا بەر دیـدەم تۆزۆکـەیێك ڕووناك بۆوە نیگام بە زارکی چاڵەکەدا هەڵزنا. ئاسمان هەندەی بێژنگێك دیاربوو. دەی قەیناکات بەڵکـو ڕێبـوارێـك دەنـگ و هاوارم دەژنەوێت. وەلێ هاوارم نەکرد. خوزێ چاوم نەکردایەتەوە. گلێنەی چاوانم سوڕداو لە جێگەی خۆم وشــك بووم. ئەتــرەشـم چوو. زراوم تەقـی. سامێکی نەگــریس تۆقاندمی. بووراموەمو لە هۆش خۆم چووم. ترس و سام و تۆقانی وا هەیە، هەستی مرۆ دەمژێ لە مەر کات و ... ی. بە واتاییکی دیکە؛ ئەو تۆقاوە لە دەرەوەی جێکاتدا دەمێنێتەوە» زۆری نەخایاندو زۆری خایـانـد، لە ڕۆژگـارو شەوگـار بێ ئاگا بووم. چەندین جار هاتمەوە خۆم و بوورامــەوە، ئەویش بە ژمــارە نازانـم. هەســت بە برسێتی ناکـەم. هەست ە تینـوویـەتی ناکـەم و زەق زەق دەنوارمە دیمەنەکەی پێش چاوم، بە خۆم دەڵێم: دەبێ تەلیسمم لێ‌کرابێت یان لە خەوندا بم! ئەوە چاوم. ئەوە دەستـم ئەوە گوێـم. لووتـم. زمــانم، گشت دەیسەلمێنن کە بێدارم و ئەویش دیمەنە بە سامەکەی. . . «لە کاتی

وادا. هەر پێنج هەستەکە یەك دەگرن و هەستێکی شەشەمین دێتە کایەوە. لەوانەشە هەستی حەوتەمیش بێتە هانای کەسەکەوە» دەبێ چی بدینم لەو چاڵەدا؟ «پرسیارەکەی لە من کرد نەك لە تۆی خوێنەر. لێوم بزواند: «ئەگەر خۆت بزانی! وەرامم دایەوە». کاکی برا، من دەڵێم مار. تۆ بڵێ: حەزیا بەڵام چلۆن حەزیایێك! لە ناو قەدی من ئەستوورتر. پڕوا بکە. ئا کە دەبووڕامەوە، حەزیاکە بە کنکری بەسوێنی دەهێنامەوە. من نیگام لەو دەعبایە ناترووکێنم و ئەویش حوونی ... زیتی لە دوور چاوم بڕیوە. چاوەکانی بە چاوی سەگ دەچوون. سەوز؛ سەوزێکی تیر. یان ڕەش بوون و تیشکی سەوزیان ...یەوە. زمانم پەڵپ بووە. بە خۆم دەڵێم:

ئێستاکە.. ها تاوێکی دیکە دەمکات بە تنۆکێك ئاو، قووتم دەدات. وەك بابوڵەیکی ئاسایی خۆی هەڵمندلووشێت. شەوو ڕۆژ لە لام بوونەتە ژن و مێردێکی یەك نەدیتەی چل ساڵی. «بە زمانە ساکارەکەی خۆی، کاتی ڕاستەقینەی ژیاوی مەبەستە، نەك چرکەی کاتژمێرو خولانەوەی وەرزەکانی» ناو زگی ئەو چاڵەم وا لێ تەنگ بیوو. لە من وایە چاوی دەرزیلەیێکی موو ئاسایە. «ئەمیش گرژ بوون و ڕاکشانی جێگایە» سەرت نەیێشێنم. مردن یەك مردنە. لە دڵی خۆمدا گوتم. ورەم خستە بەر خۆم. باشە بۆ نامخوات؟ ئەی کە نامخوات و هیچ هەڵوێستێکی بەدکارانەی نییە بۆ من بیرم بۆ ئەوە بچێت کە هێرشی بکەمە سەر؟ توند پەلاماری قورقوڕاگەی بدەم؟! ئەوا گیرام وام کرد. کەی هەردوو دەستم دەگەنەوە ئەستوورایی ملی؟ بە خەستی مێشکم خستە کارەوە بۆ ئەوەی دەرباز بم لە هاوسەرێتیی ئەو حەزیایە. سەرسام مەبە کە دەڵێم هاوسەر چونکە کاتێك شل و کەچ دەبووم و شەو... خوونیم دەگەیشتە ئەوەی لە وزەم دەرچێت، لار دەبووەوەو ئاگام لە ... نەدەما کە ڕادەپەڕیم. دەمدی حەزیاکە کلکی وەکو سەرین... ...ر سەرەکاسەکەم. ترسەکەم ڕەوایەوەو تووی ئاشنایەتیو هیوایێك لە ناخمدا شین بوو. «مرۆڤ، زۆر جار بە ترووسکەی هیوا دەژیت. تابلۆی نیگارکێشێکم لەبەرچاوە کە بۆ هیوا کێشاویە. مرۆیێکی هەژاریچاو بەستراو کەمانچەیێکی بە دەستەوەیە کە تاکە «ژێ» یێکی نەبێت، گشت ئەوانەی دیکە پساون. بە پەنجەی لەرزۆك، ئاوازێکی بە جۆش بە دوا ڕۆژی خۆی دەسپێری.» ڕۆژێك، دوان سیان. دەو سەد. وای لێهات چەکەرەم لە حەزیاکە ئاکردو کاو نا کاوێکیش، دەستم بە ژێر زگیا دەهێنا.

موچرکێکی سارد سەرتاپامی دەهەژاند. گوتم: ئەمە چارە نووسمە، با ورە بەر نەدەم. ژیان هەندە کورتە چ جای ئەوە کە دزێوی و نامردێتیی پێوە بلکێنین. «بەختەوەر ئەو کەسەیە کە مردنێکی پیرۆزی چنگ کەوێت.»

ڕۆژێك لە ترپەی شتێك ڕاچڵەکیم، تومەز هەموو ڕۆژێك ئەو شتە کەوتوتە خوارەوە. تەماشای بەرپێم کرد. پاتکۆڵەیێکی سپیم دیت وەکو سەلکە پەنیر. نەموێرا دەستی بۆ درێژ بکەم. کەچی لێکم هات و گشت تووڵەو تازیی نەوسم بەرەڵڵا بوون. هەستم بە ژانێکی ناکاویی گەدەو ڕیخۆڵەکانم کرد. دەست بەرم.. نەبەم. «دوو ڕێیانە دژ بە یەکەکەی ناوەوەی مرۆڤە هەڵبژاردنەکەیە... هێنەکەیە». لە ناکاو، حەزیاکە کلکی ڕاوەشاندو دوو لەتی کرد. بەشێکی خوارد. تێگەیشتم کە بەشەکەی دیکە بۆ منە. دانەویم و نەختێك لە شتەکەم جوی. تامێکی سەیری هەبوو؛ نە تاڵ، نە سوێر، نە شیرین و نە تفت! خواردم. تۆش بوویتایە دەتخوارد. «بێگومان دەمخوارد. گیانلەبەری برسی بە تەنگی چێژو بۆن و بەرامەوە نایێ، دەیەوێ لە مەرگ بە دووربێت. دەیەوێ هەبێت» بەو تەرحە گشت ڕۆژێك خۆراکەکەمان برابەش دەخوارد. هەتا ڕۆژێك زۆر کەیفساز بووم و فیکەم کێشا! حەزیاکەش ناوقەدی لەنجاندو دەنگێ لە پەراسووەکانیەوە هات! بە دەنگی زەنگوڵەی ملی نێریی دەچوو!! بووینە هاوڕێ. ئەو بە کلکی ختوکەی دەدام و منیش ناولەپم بە پوولەکی ناو قەدی دەهێنا. ئەمەی بۆت دەگێڕمەوە مەگەر بەدەم ئاسان بێت. وەرە سێ ساڵی تەواو لەگەڵ حەزیادا بگێزەرێنە!

«گوتم: چۆن زانیت سێ ساڵ لەوێ مایتەوە؟

گوتی: باوکم، ژنەکەم کورەکەم و کەسوکارم ڕایانگەیاندم». ڕۆژێك چاوم لێبوو، زنجیرێك شۆڕبوەوە! چ زنجیرێك! قوڵفەکانی دەبریسکێنەوەو ئاوی چاوی دەسێنێ! شۆڕبۆوە.. شۆڕبۆوەو گەیشتە زەمینەی چاڵەکە. منیش دەمم داچەقاندووە. حەزیاکە جووڵاو ناوقەدی خۆی لە زنجیرەکە ئاڵاندو کلکی بۆ من ڕاوەشاند هەنگاوێك چوومە نواوە. ئەو سێ جار کلکی لە ناوقەدم ئاڵاندو هەر ئەوەندەم زانی، بڵند دەبینەوە!

پێڵووم داخست و ترسەکەی یەکەم جارم هاتەوە لەش. چاوم کردەوە. دیم وا لە چاڵەکەوە دەرچووین. ئاسمانێکی بەرینم لێدەرکەوت. لە بەرزایی باڵایێکەوە، حەزیاکە کلکی شل کردەوەو کەوتمە سەر

عەردێکی تەڕ. تاسا بووم. نەمزانی حەزیاکە کوێوە چوو! سەرنج دەدەم وەرز ئەو وەرزە نی‌یە کە هاتم بۆ ڕاو! هەتاو دوو سێ ڕمب بەرزە. لە پاڵمەوە، مێرووستانێك گۆشەی نیگامی ڕاکێشا. مێروولەکان بە هاوکاری‌و تەبایی دانوولەیان هەڵدەخست. بڕوایم بە چاوی خۆم نەهات، نەبادا لە خەونێکی قورسدا بم. خۆم بەڵگەم لە خۆمدا دۆزییەوە کە خەون نەبووە. وا ڕدێنکم هەتا سەرچۆکم هاتووە، سپی... سپی وەکو لۆکەی بیگەرد. دەستم بۆ سەرم بردو چەند تاڵێکم بە چاوەکانم نیشان دا. سەریشم وەکو چوری شیر سپی ببوو! وێجا چاوم گەشایەوە، وەك چۆن تیشکی خۆر تەمی بەیانی دەڕەوێنێتەوە، ئاوها عاردو بانم بە ڕوونی دەدیت. بە خۆمم گوت: هەستە، ڕابە، زووکە، ئەوە تۆو ئەوەش گوند. هەستام. لەگەڵ هەنگاوەکانمدا پرسیارەکان لەدایك دەبوون و پێش بڕکێیان لە مێشکمدا دەکرد: دەبێ بمناسن؟ دەبێ بڕوام پێ‌بکەن؟

دەبێ بە شێتم نەزانن؟ دەبێ مابن؟ باوکم، ژنەکەم، کوڕەکەم، ئەوانی دیکە. دەبێ.. دەبێ.. دەبێ.. «ئەم ئەفسانەیە لە مێشك و ناخ و گیانی پێشینانماندا، ڕاستی‌یەك بوو هاوشانی گشت ڕاستی‌یەکان».

لەبەر دەرگاکەماندا ڕاوەستام و چاوم ڕەوانەی ژوورەوە کرد. هیوای کوڕم بە دەست بانگ کرد. هاتە پێش و گوتی: «ها! ئاپۆ چیت دەوێ؟» گوتم: «من باوکی تۆم. ناوت هیوا نی‌یە؟» گوتی: «با. بەڵام تۆ باوکی من نیت!» ڕایکردە ژوورەوە. تاوێکی دیکە، خونچەی ژنم هاتە دەرەوە. گوتی: «فەرموو، مامەکە چیت لێمان دەوێ؟! نان.. ڕۆن.. پارە». بە هێمنی گوتم: «دەرووزەکەر نیم! من مێردی تۆم. تۆ خونچە نیت؟» سەری سوڕماو نیوە تووڕە ب[illegible]ێکی هاویژتە ناو دەم و دووی «هایهووو... هایهووو! خاڵە گێچەڵمان پێ‌مەکەو سەریشمان سووك نی‌یە. بڕۆ بە ڕێگەی خۆتەوە.» گوتم: «دە بچۆ باوکم گازکە. محە جوڵای ناوە.» خونچەی ژنم پەستی‌ی نواند «ئەمە چ گۆبەندێکە! بێنە دەستت ماچ بکەم و واز لەم قسە حەڵەق و بەڵەقانە بێنەو زامی کۆنم مەکولێنەرەوە.» منیش کەمۆکەیێك تووڕە بووم.

«کچێ، ڕاست دەکەم. دەی بچۆرە ناوەندی ئاوایی‌و گشت گوندییانم لێ خڕ کەرەوە.» خونچە، هەراسان بوو. دەنگی بەرز کردەوە. «کابرای کەنەفت و سەرلێشێواوو خرەفاو، نیازی کەتنت هەیە!؟» ئەوەی گوت و دایە هاوارو فیزاح و گریانێکی بە کوڵ. هاوسێ‌و خاوو خێزانی گوندەکەمان گردبوونەوە. گوتم: «برایان، خوشکان، ئیشی بە فام و ئاوەز دەکرێت. ئێوە گوێ بۆ برا بچووکی خۆتان شل کەن. تۆ وەیسە نیت شوانی مام عەزیز؟ تۆ هەمینی مام ڕەسوڵ نیت؟ ئەم هەرزەکارە برزۆی ڕەشە گاوان نی‌یە؟ ئەم فلان و ئەو فیسار کەس نی‌یە. سەر لەبەریانم ناو برد. باوکم لێم نزیك بۆوە. سەرنجی لە سەرو گوێلاکم دا. من گوتمەوە: خونچە، ئەی بایز مێردی تۆ نەبوو کە چووە ڕاوو نەگەڕایەوە؟ باوەڕ بکەن من ئەو بایزەم. هەقیشتانە بڕوا بە من نەکەن و چاوتان بە درۆ بخەنەوە. ئیتر لەوە پاش، بە وردی سەربردەی ون بووەکەم بۆیان باسکرد. باوکم پتر هاتە پێش و چاوی لە چاوم بڕی‌و یەکسەر باوەشی بۆم کردەوە.

فرمێسك تك تك بە چاومەوە هاتە خوارو توند توند بە خۆمەوە گوشیم. بابە.. بابە.. هەر ئەوەندەم بۆ گوتراو قوڕگم پڕ بوو لە گریان».

«لێرەدا، بەسەرهاتی بایز کۆتایی هات. ئەمنیش دوایی بە چیرۆکەکەم دێنم. تکایێکم هەیە لە تۆی خوێنەر. لە پاشە ملەمدا، نەڵێی کاکی نووسەر بە ڕۆژی نیوەڕۆ چەواشەم دەکات و بە وشە دەیەوێ بمانهاوێتە ناو تەونی جاڵجاڵۆکەوە، چونکە سەری خۆی سپی بووەو داکۆکی لەسەر چەرمووان دەکات. لەوانەیشە بفەرموویت: ئەمە کەی چیرۆك بوو؟ ساکارانە بۆ حەزیاکە مەچۆ، گوایە حەزیایێکی ڕاستەقینەیەو لە خۆتەوە بستێ ئاخی بۆ قوت مەکەو باڵی لێ‌مەڕوێنە، نا. تۆش وەکو من بەو ش[illegible]ی بزانە کە شوان مێگەلە پەرت و بڵاوەکەی پێ کۆ دەکاتەوە، [illegible] تەو تەپڵ ئەگێوەی دابنێ کە خێزان و هۆزی قولەڕەشەکان دەخاتە هەڵەکە سەماو خوێنیان دەجۆشێنێ.»

# چەپکە نێرگز

● نجیب گەرسیانی ●

پتر لە زیندان هەستت بە ماندوویی دەکرد. هەموو ئەندامەکانی لەشت شەکەت بووبوون. مێشکیشت هیچ لەوان ئاسوودەتر نەبوو. وەك هەموو جارێك داوای بووردنت لە هاوەڵەکانت کردو بڕیاری نەچوونە دەرەوەت دا. ئەوانیش بە دەم غەلبە غەلب و تریقەی پێکەنینەوە بەجێیان هێشتی. زۆرت حەز ئەکرد تاوێك بنووی‌و بۆ چەند ساتێك بحەوێیتەوە، گەلێکیشت هەوڵ دا بەڵام دەنگی هاتوچۆی ئۆتۆمبێلەکان نەیانهێشت ئاواتەکەت بێتە دی. ناچار لەو کارەش پاشگەز بوویتەوە. هەر لە پاڵەوە کەوتیتە بیرکردنەوە بەراورد کردنی نێوان خۆت و هاوەڵەکانت...:

- بۆ ئەبێ من خەم بۆ هەموو شتێك بخۆم و بە دەگمەن پێبکەنم یا بزەم بکەوێتە سەر لێو!؟ لە کاتێکدا ئەوان بە دەگمەن خەم لە شت دەخۆن و بە بچ[...]ووکترین شتیش دەتریقێنەوە! بە ڕاستی جێی سەرسوڕمانە.. [...]ێ کاممان ڕاست بین؟ من یا ئەوان؟!. هەرگیز خۆم بە هەڵ[...]، ئەوەی وتوومە ئەیڵێم و ئەیڵێمەوە.. چۆن گریان هۆی تایبەتی خۆی هەیە ئاوەهاش ئەبێ پێکەنین هۆی تایبەتی خۆی هەبێ..

هەستایتە سەرپێیان. باوێشکێکی درێژو قووڵت داو چەند جارێك دەستەکانت بەم لاو بەو لای خۆت دا ڕاوەشاند. پاشان لە پەنجەرەکە نزیك بوویتەوە، بە نووکی پەنجە کەڵەت پەردەکەت ترازاند. بە شەقام و دۆڵ و گردەکاندا تا دەگاتە شاخەکەی ئەوبەر هەڵتڕوانی. هیچیان کەف و کوڵی دەروونە هەڵچووەکەتیان دانەمرکاندەوە. ناچار هەردوو گاێنەی چاوەکانت لە سەرێرا وردە وردە بەرەو دواوە بزواند. لە ناکاوێکدا - چالاك یان بە کوسەڵی نێرگزەوە قورتەوە.

گەشکەیەك سەرتاپای گرتیتەوە. دەمێك بوو گیرۆدەی ئەو خولیایە بووی شتێك لە بارەی نێرگز فرۆشەکانەوە بزانیت. بە تایبەتی ئەو منداڵەت زۆر لا مەبەست بوو. لە مێژ بوو سەرنجی ڕاکێشابووی، چونکە نە لە پۆل و نە لە دەرەوەی پۆلیش دا لە منداڵانی تر نەئەچ هەناسەیەکی زۆری هەڵئەکێشا تۆیش لەگەڵ هەموو هەنا... هەڵکێشانێکی‌دا کپەی ئازارێکی سەخت لە ناخەوە دەیهەژاندی‌و تاسە دەیبردیتەوە. گەلێ جار هاوەڵەکانت لە سەر ئەم جۆرە شتانە دەیانداتە بەر توانج و پلارو بە مرۆڤێکی بێ‌هێزیان دەدایە قەڵەم. تۆیش دەتڕوانی‌یە دەم و چاویان و خەندەیەکی تەوساوی سەر لێوی دەگرتیتەوەو زۆر لە سەری نەدەڕۆیشتی، هەر چەندە لە ناخیشەوە وات هەست ئەکرد دڵت دەرزی ئاژن دەکرێت. هەندێ جاریش کە تینت بۆ دەهات بەر لێشاوی ڕەخنەو نەفرەتت ئەخستن:

- چۆن بیر لە چالاك نەکەمەوە!؟ بۆ چالاکی تاقانە لە ژێر [...]ری باوك و دایکێکی ئاسایی‌دا نەش و نما نەکات؟ ئاخر بۆ منداڵێکی حەوت هەشت ساڵانە لە ئێستاوە بکەوێتە ژێر باری خەم و پەژارەی باوکێکی ئیفلیجەوە!؟

کورسی‌یەکەت لە پەنجەرەکە نزیك خستەوەو لە سەری دانیشتیت. زۆرت لێوە نزیك بوو. هەرچەندە ئەو لە تۆ بێ ئاگابوو، بەڵام تۆ لە هەموو شتێکی ئەو ئاگادار بوویت. بە هەڵێکی باشت زانی. بە قەد ئەوەندەی بتوانی بە چاکی ببینی هەر ئەوەندە پەردەکەت ترازاندو سەرت بە دیوارەکەوە نووساند.

بزەیەکی منداڵانەی پاك و بێ‌گەرد ڕوومەتی گەشاندبووەوە. خۆشی‌یەکی بێ پایان هەموو لەشی داگرتبوو. وەك بەرخۆلەیەکی

بزیـوی بەهـار بە دەوروبـەری خۆیدا کەوتبـووە هەڵبـەزو دابەزو لە جێیـەکـدا ئۆقـرەی نەدەگـرت. جار بە جاریش خوڵـەکە ئەترازاو بێ سڵەمینەوە ئەچووە سەر قیرتاوەکە. لە پڕێکداگەڕایەوە سەر خوڵەکەو دەستی ڕاستی بە چەپکێ نێرگزەوە هەڵبڕی:

- ئۆخـەی خوایـە، ئۆخـەی سوکی کردەوە.. ئەمـە ئەوەستێ.. ئا دیارە.. ئەوەسـ.. ئەوە... نەء... نەء.

لە چاو نووقـانـدنێکـدا وەك با گڤـەی هات و بە لایدا تێپـەڕی. موچڕکێك سەرتاپای لەشی گرتیەوەو یەك دوو جار بە بێ ئاگا سەرت بە دیوارەکەدا کێشا. خۆزگەت ئەخواست لەو ساتەدا هاوەڵەکانت لە گەڵ بوونـایـەو ئەو تابلۆیـە دڵتـەزێنـەیـان ببینـایـە. بەڵام دڵنیـابووی تەنـانـەت ئەمـەش هەستی نەئـەبـزوانـدن و ناچاریان ئەکردی دیسان پێیان بڵێی: «ئەوەی مرۆڤ لە ئاژەڵ جیا دەکاتەوە هەستە.. هەست».

هەندێ نەفرەتت لە کارو پیشەکەت کرد کە لەگەڵ ئەوانەدا کۆی کردبـوویتـەوە. پاشـان گەڕایتـەوە سەر ڕوانینی چالاك. دەستی ماندووی نائومێدی بە لارانیدا شۆڕە بووبووەوە، دەم و چاوە گەش[illegible] پێگـەردەکـەی گرژکـردبـوو، گۆنـاکـانی وەك دوو سێوی لاسوورەی سەرما بردوو چرچ هەڵگەڕابوون. تاوێك لەو بارو دۆخەدا مایەوە، پاشان بەرەو هەوراز هەڵیروانی. تا چاو بڕکات هیچی بەدی نەکرد.

بە نابەدڵییەوە کتێبەکەی بەر باخەڵی دەرهێناو کردییەوە: «گورگی ناڵبەند، ڕۆژێ ئەسپێك، لە ناو پاوەنێکدا دەلەوەڕا، لە ناکاو گورگێکی برسی، فڕەی ئۆتـۆمبیلێـك کتێبـەکـەی پێ دانـاو وەك کێچ ڕاپەڕی. بەڵام ئۆتـۆمبیـل پێش ئەوەی بگـاتـە ئاستی ئەم لە شەقـامە سەرەکییەکە لای داو ملی نا بە لارێیەکەوە. کتێبەکەی کردەوەو بە [illegible]کەیدا چووەوە:

«من ناڵبەندم،..، ئەسپەکە لەو زیرەك تر بوو لە ناکاو جووتەیەکی لێ داو دەم و ددانی تێك هاڕی»

هەرچـەنـدە بە دەنگی بەرز دەیخـوێنـدەوەو چووبوە ناو جیهانێکی تایبـەتییـەوە بەڵام جار بە جار لەگـەڵ هەورازەکـەدا سەرەتـاتکێی دەکـرد. بۆیـە لە پڕ کتێبـەکـەی دانـایـەوەو کزدی بە دوو سێ چەپك نێرگزاو دەستی ڕاستی هەڵبڕییەوە:

- خوایە گیان ئەمە بوەستێ.. خوایە.. خوا.. خ.

شتێکیان بۆ هاویشت. ئەوەی بیر چووەوە کە نەوەستان نێرگزی لێبکـرن. بە پەلـە بۆی دانـەوییـەوەو هەڵی گـرت و لەگـەڵ خۆیدا کەوتە قسەکردن:

- جا ئەمە چییە؟ لەوان وایە نایناسمەوە! ئەو ڕۆژە نەوزاد پیشانی دام. دەبا ساغ بوابە بزانە پاکم ئەکرد یا نا؟

تا ئەو قسـانـەی نەکـرد دڵنیـا نەبووی کە شتەکە توێکڵە پرتەقاڵە.

هەر بە یەکـجـاری شێت گیـر بوویت و زۆرت ڕق هەسـتـا. لە داخان دا تا توانیت جنێوت دانیو حەزت ئەکرد ڕوو بە ڕووی ئەو جورە کەسـانـە ببیتـەوەو بە هەمـوو گەرووتـەوە بە سەریـان دا بقـریشکێنیو پێیـان بڵێیت: «ئێـوە مرۆڤ نین.. ئێـوە گورگن.. گورگی دڵبەندن».

توێکڵەکەی فڕێداو سەری بە سەر کتێبەکەدا شۆڕکردەوە: «مام گورك بە لووره لور بۆی دەرچوو».

کتێبـەکەی پێـوە داو هەسـتـایـەوە. چنگی نیگا لە ئاسۆی هەورازە دوورەکە گیرکرد. گەشکەیەك خـستییە جوڵان و قسەکردن:

- کەیبـوایـە جووتـە پێـڵاوەکەم بکڕیایە؟ بەخوا تەقەی پێڵاوی پاژنە بەرزیش خۆشە!! نەوزادی مامە شێخ کە هەڵئەسێتە سەر تەختەرەش ئەیکاتە چی تەق و هوڕێ!؟

هەڵبوون و کوژانەوەی گڵۆپێکی بچووکی لای ڕاستی ئۆتۆمبیلێك وەك ئەوەی تەواوکـەری هێنـانـەدی بەشێـك لە ئامـانجـەکـانی بن، خستیانە هەڵەکە سەما.

- ئۆخەی دایکە گیان.. پێڵاو.. جانتا..

دە دوانزە هەنگاو لە چالاك تێپەڕیو سووك لایدایە سەر خوڵەکەو وەسـتـا. زەلامێکی قەڵـەو جامـەکـەی لای ڕاستی داگـرت و نە گەڵیـا کەوتە سەوداکردن. پاشان هەر حەوت چەپکە نێرگزەکەی لێ سەندو ئۆتۆمبیل فرتەی بۆ کرد. سەرەتا لە خۆشییاندا زۆر سەرنجت نەدایە مەسـەلـەکـە، بەڵام کاتێکت زانی چالاکی کل[illegible] و بەستەزمان وەك جووجکێکی سەربڕاو خۆی بە سەر عەردەک[illegible]ێشاو کەوتە هاوارو گریـان و خۆکـوشتن. بە پەلـە لە ژوورەکـە[illegible]ڕیت و بە تەکان گەیشتیتە سەری.

کاتێ چاوی پێت کەوت بە دەم هەنسکدانەوە پێی وتی:

- مامۆستا هەموو نێرگزەکانیان بردم و هیچیان نەدامێ.. تۆیش بەو پەڕی سۆزەوە لە ئامێزت گرت و دەستێکت بە سەر سەریدا هێناو پێت گووت:

- گوێ مەدەرێ ڕۆڵەگیان، سبەی فێری نووسینی ژمارەی گەورەت ئەکـەم بۆ ڕیسـواکـردنی ئەو کەسـانـەی تەنـانـەت نێـرگـزی دەستی منداڵانیش ئەدزن.

ئەمـەت وت و بە دوو قۆڵی بەرەو تەختـاییـەکـەی خوارەوە هەنگاوتان ناو کەوتنە نێرگز کردن.

# فەرلاڤێ زڤستانەکا سار

- عەبدلایێ جندی -

ما د نێــرا وێ خولیــاقــەتێ ئەوا تە دەرزیـك هەلاڤێتبـا ب ئەردی نەدکەت، ئەوی وەلێ ب چریسەت هێڤدکرێ وی بخوژی سـەر ل وێ بەرێخـودانـا خوە نە دەر دئێخست ، لێ وی ڤیابا و نەڤیابا، دڤیا ئەوی ئێـك کربـا ، چکـو ئەو دیمـەن بخوە فلمەك بو، زارڤەکەر و بینـەرژی هەر ئەو بحـو بوو. ناڤچـاڤێن وی د وەسـا بوون، ئەگەر ئێکی پیچەك شەهرەزایی هەبا دا بباشی وان ناڤچاڤا خوینیت. یێ راوستیـای بو پشتـا خوە دابـو دیوارەکی، ساکوێی وی یێ لبەر بو، هەر دوو دەستێن خوەژی کر بــونــە د بەریکێن ساکـوێـدا . ل وی وێڤـەتـر هنـدەك پالا ئاگـرەك هلکربو، تێهنا وی ئاگری دگە هشتە ویـژی. زڤـستـانێن وەلێ بسـەر دەڤەرێدا نەگرتبوون. ئەوژی وی سپێـدێ ژتم سپێـدا زوتـر گەهشتبـوو مەیدانکێ، ب ئنیەتا هندێ بەلکی خودێ بکەت دگەل ئێکی بچتە شولی ، نەمازە ئەو یێ خوێیا بو لناڤ پالا ب دەست هەلی و زیرەکیا خوە د کاریدا. هەر چاڤەك لێ ببـو دەهـ چاڤ، وەسـا بەرێ خوە د دا مەیدانکێ بەلکی خودان کارەك بهێـت دگـەل خوە ببـەتە کاری، جارنازی ئەگەر بباشی ئێك نە دیتبا دا خوە بلندکەت ولــەر تلێن خوە را وستت بەلکی شیابا ئەو کەس بباشی مێـزە کربا، د وان دەمادا قونتەرچیەکێ نیاسێ سمبێل بادای لبەررا بوری و کوتێ:

- ئەو تە چیە وەسا یێ ت؟ هەبت نەبت ڤێ سپێدێ تە کێپایێ یێن خارین! دێ وە ێ. ژخوە شیادا نەدزانی دێ چ بێژت ئینا گوت:

- ها. . . بهێم! کیڤە بهێم؟!

- وەرە چایەکێ ڤەخو.

گاڤا ئەو ئاخفتنا دوماهیێ گولێ بوی تێکچو، گوت:

- سوپاس.

مانێــرا وی کابـرای و سەرێ خوە هەژانـد و د دلێ خوەدا دگـوت« کێپـایێ! ولـلا توژی یێ بەتـرانی. ئەڤـەیە(یێ تێر های ژیێ برسی نینــە). من گوت دێ بێت(وەرە دا بچینــە شولی). ژ ڤریڤـە سـەر ئەدارەکـا خوە یا بەرێ و کابـرایێ دیژی وێڤە چوو، لیقە لێقا ویبو نە ل منە و نە ل تە. د بەرراژی ب دەستەکی سمبێلێن خوە باددان.

ئەوێ سالێ تە حلیـەکـا وەسـا بو شول گەلـەك کێم ببـو، وەلێهاتبو شولێ ئاڤاکرنێ نە دهاتەکرن ژ بەر بارانا، وان پالاژی ب دلی با و ب دلی نەبـا تم سپێـدا دهـاتنـە مەیـدانکێ، لێ ژ سێ پشکا پتر ب دەست بەتـالی دزڤـرینە مال و هەر ئێکی ژوان ژی چیایەکێ هزر و بیـرا د دلێ خوە دا ئاڤـا دکـر، کا چاوە ڤەگـەرینەڤە مال و بەریکێن وانژی چ تێدانە و دێ سویند خوی یێ ب تایتێ هاتینە شویشتن، نە دورەژی هەر ئێکی ژوان چەنـد بەرسڤـەك بەرهـە ڤکر بوون بو چەند پرسیارەکێن دزانین دێ ژێ هێنەکرن ، ئینا هەکوچ شول ب دەست نەدکــەتن وەکی پەزێ برِ بە ب کەڤیتێ هەر ئێکی ریــامـال دگــرتـە بەر و ب رێ دکـەتن. ئەو ما دڤیـا خوە راگـریت و بمینت بەلکی خودێ بکەت دگەل ئێکی بچتە شولی. د وان دەمادا تبابەك خودان کار دهاتنە مەیدانکێ مینا قەساباد شە هرەزا بوون د ژێگرتنا پەزێن قەلەو، وانژی وەلێ پالێن سینگ پەحن بەژن هلکێشای ژێ دگرتن؛ ئەوژی ئێك ژوان پالا بو، لێ وێ روژێ ژی هێز و سینگ پەحنی و زەلام باشیا وی چ پارە نەکر، بەلکی وەلێهات پتر کەرب ژ خوە ڤەبن پشتی کو دوو سێکەکا ژوان خوەیێن کار پالێن خوە د جە ماندن چاڤ ب وی دکەتن د گوتنێ:

- ئەرێ ئەڤــە تو لڤێـرەی؟! ب خودێ من تو نەدیتی، پا پالێن مژی تمــام بوون ئەگـەر دا دگـەل مە هێی. دێ بلا بو روژەکـا دی بت؟ بەرسڤـا وان نە د دا و د دلێ خوەدا دگـوت «هـون ژ چڤێلێن خوە نائـەبن». هەر ئەو ئوشت بوون وە لێکـری کو دەرێ همبــانکـا بیرهاتنێن خوە ڤەکەت«هێی. . . هێی، خوزیکێن پار، براستی پار گەلەك ژ ئی سال چێتر بو، ب خودێ ئاخفتنەکا راستە دەمێ مەزن دبێژن(سال ب سال خوزیا لمن ب پار)دێ جەما دێ چکەم ئەژی وەکی ڤێ عالەمێ، خودێ کەریمە».

ریــا مال گرتــە بەر پشتــی کوچ سوود ژ خوە راگــرتنــا خوە یال مەیدانکێ نە دیتی؛ ڤەگەریانا وی یا ڤێ جارێ تام و رەنگەکێ دن ئێ هەی، ئەو ژێ بێهنـا خوە بەرهـەڤکـرنێـیـە بو جەژنێ. جەژنــا نێزیك بووی، جەژن ژی وێ ئێکێ نزانت کا شول هەیە ئان نە، ئەو یا لــــەر ئێـــك و دووا خوە، وێ کار و کوکێ خوە یێ تایــەتی

دڤێت. هزر و بیرێن ویژی هەریٚ پتر لێتێن، وەلێهاتن هەتا بوورینە(خەم)، ئینا سەریٚ گولولکا خەما لێ ئالزی نەدزانی کیژ داڤێ بگرت و کیژکێ بەردەت. خەما مالا وی د دلیدا گەلەك مەزن دبو، کا ئەو چاوە دیٚ جەژنێ بسەرفرازی بورینت و زارۆوێن خوە دلگەش بکەت، یا ژێهاتی ژ دەڤی دەرکەت:

- ئاخ... ئاخ دنیا! ئەز نزانم تو یا پویچی ئان مروڤ دبیٚ وەفانە!!.

- جەما چ بێژم! نەء... وەکی ئەز بیر ل ژینێ دکەم و تشتەکی بزانم، دنیا هەر دنیایە، لێ گوهرین بارا مروڤایە، لەوما هەر گاڤ مروڤ مینا(جیوەیە).

ئەو هەر یێ لسەر ئێکا خوە ویێ جەهدە و کولانا دبرت و ریا مال دگریتە بەر، پێنگاڤێن وی یێ خوە دهاڤێن، جار خوەش، جارنازی لسەر خوە، ئەوژی هەریٚ د هزر وتە خمینێن خوەدا، لێ جارنا وان هزرا دڤێن خوە ژێ ڤەدزن و برەڤن، هندی یێ تێن د کاریٚ خوەدا سەرنا کەڤن. دبت هون بێژن چما؟! ئەز دبێژم چکو ئەوی دڤێت وان هزر و تە خمینا بکەتە هەڤال و هوگرێن خوە. تا وەلێهات حەز دکر درەنگ بگەهتە مال ریا مال ببتە ریا سالەکێ ئان پتر، ئەو بوو ژ دەڤی دەرکەت و گوت:

- چما ئیرو ریا مال هند نێزیك بوویە!!.

وێ سپێدێ کابانیا وی بەری مەلە بانگدانێ رابو تێشتەك بو بەرهەڤکر بو، پشتی ژ مال دەرکەتی و ریا مەیدانکێ گرتیەبەر، ئەویٚ قەستا نڤینکێن خوەکر، لێ بەری برازێت زارۆ باش نخافتن و ب چاڤا دگوت« دیٚ بنڤن هەی مەرگێ من گوری وەبت، تێر بنڤن بەلکی زوی مەزن بین دا ب مەرا بگەهن و هاریکاریا مە بکەن». ئەو بوو زارۆ نخافتن و رازا، لێ ئەو نڤستن چرا مەرحەبا هەکو خوە ب وی حالی دبینت. مێریٚ ویژی چەند پێنگاڤێن خوە درەنگژی بهاڤێت لێ هەر یا ژ خوەیە یێ نێزیکی مال دبت، ئەو بوو پشتی بێهنەکا خوەش گەهشتە بەر دەریٚ مال و راوەستیا.

«ئەز ئیرو چاوە دەری بقوتم و ب ژوورکەڤم! ما ئەز دیٚ چ بێژم و چ ئاخڤم.. خو ئەز درەواژی نزانم ڤەهونم، نەء.. نەء من نەڤێت خوە هوی درەوا بکەم(هەتا مار راست نەبت ناچتە د کو نێڤە)ئاخفتنا مژی هەتا یا راست نەبت جهێ خوە ناگرت، ئو هەما من درەوکر یەعنی چ!! دیٚ چ ب دەست من ڤەهێت، یا ژ هەما چێتر ئەوە دیٚ بێژم شوٚل نەبو ئەز نە چویمە شولی.. هەریٚ... هەریٚ پا وڵلا یا مای و نەمای چەند روژەکێن بو جەژنێ ماین، ئەم دیٚ چ کەین بیٚ دراڤ!!».

مینا شەقلێ داری یێ لبەر دەری راوستیایە، بایەکێ وەلی سار ژێ یێ دهێت لسەر و چاڤێن وی ددەت دیٚ هزار سویندا خوی دیٚ بێژی گویزانە وەلێ تێژە.

دەستێ خوە بلندکر دا دەری بقوتت، ئینا هێژ دەستی وی بدەری نەکەتی هێدیکا دەستێ خوە بەرداڤە خاریٚ و د دلێ خوەدا دگوت «خودێ‌ۆ.. ئە ڤە چ ژینە ئەم دبورینین؟! ئەز دترسم ڤی عەمری ژی ژ مرە حسێبکەی! های.. های دنیا، بلا هندەك پلیپتانێ ب دینارا بکەن و هندەك ژی بلا خەونێن کەسك و سوور ب دینارە کێڤە ببینن. تف ل ویٚ یاسا دادپەروەریێ». ئەو بوو پشتی تف کریە ئەردی چ چارێن دن نەما ژ بل کو دەری بقوتت و ب ژوور بکەڤت. سەریٚ خوە بلندکرەڤە و دگەل ویٚ بلندکرنێ دەستێ خوە هەلاند و دەرگەه قوتا، دوان دەمادا ژ خوەرە دگوت«چەندنەخوەشە مروٚڤ ژ بێکاری ڤەگەرێتەڤە مال».

دەرگەه لێ هاتە ڤەکرن پیەکێ خوە ئاڤێت و یێ دی ژی بلندکر دا دانت...

- فلان کەس ئەڤرو ژی هاتیەڤە، نە چوویەشولی؟!

ب بەرسڤەکا نە ژ دل سەریٚ خوە هەژاند و لسەر خوە گوت:

- بەلێ، ئەڤروٚژی هاتمەڤە.

- دیٚ جامێر خەما نەخو، دیٚ ئەو بت ئەوا خودێ نڤێسی، بێهنا خوە فرەه کە و خودێ کەریمە.

- حورمەت من خەما خوە نینە، ئەزێ د خەما جەژنێ و کار کوٚکێ وێ، نەمازە ئەڤە چەندە مرادا( سەمەدار)ی ئەوە ئەو ژی مینا هەڤالێن خوە جە ژنەکێ خوە ببینت یێ کارکری، دا دلێ وی ب خوە نە سوژت لناڤ هەڤالا، چکو تو دزانی زویکا دەڤا بچوکا دشکێت هەکو دبینن کێماسیەك لێ.

- ڤێجا چ بکەین هند ژ مە تێت.

پشتی بێهنەکا خوەش بێهنا خوە ڤەدای و خوە تێهن گەرم کری، دلێ وی خوە نەگرت و خوە دیٚ بێژی کێچێن کەتینە لەشی، حەویانا وی ل مال نەدبو راست رابوڤە ریا دەری گرتەبەر بەری کو ژ دەرا زینکێ دەربازبت کابانیا وی گازی کریٚ و گۆت:

- عەبدێ خودێ دیٚ کیڤە چی؟

لێ هندی یێ دگەل هزرێن خوە مژویل بوو، گوهـ ل کابانیا خوە نەبو، ئەو بو چوو، ریا بازاری گرت و نە زڤریڤە هەتا کو دەستەکێ جلکا بو سەمەداری کری.

هەکو بویە سپیدا جەژنێ چوو بەردەری و ما بەرێخوەدا کولانێ دیت(سەمەدار) ژ تەڤ هەڤالێن خوە یێ ب بزاڤ و حەنك و لاقدیترەئینا. بشکوری و ژ خوەرە دگوت «تە پیروز بت سەد جار پیروز». هەکو هزرا دەینی ژی هاتیە هزریٚ، ما هێفکرە دەستێن خوە و گوت(هێژ گەلەك هێزا د وە مای )ئو ب گرنژینڤە ب ژوورکەت.

١٩٧٩/١٠/٦ سلێمانی

# شەوی یەلدا

شەوی یەلدایە، یا دەیجورە ئەم شەو
کە دیلدەم دوور لە تۆ بێ نوورە ئەم شەوا؟

جەبار جەمال غەریب

کپی ئەوشـــەو ژانێکی قورسی تێدایـە، کپی لە هەمـوو شتێکـدا ترسناکە، ترسیش ئاکە موتەکەیە مرۆڤی مالی کردوە. ئەوشەو ئاسمان گلێنجانێکی لەبن نەهاتووەو بەسەر گەردەلوولی سەرم دا دەبارێ، لە کپیدا دەبمە ئاگرو گرِ لە خەرمانی ئاسمان بەربِدەدەم و هەموو دنیا بێدار دەکەم.

دەهـا ئەوشـۆ تەمـەنـای کلپەو دووکەڵی گیانی منیش کەن. گیانی زەردەخـەنـەو ئێـوارە ... ا. ئەو ئێـوارانـەی قـەی وەریو وەك گەڵای وەریـو لە پێـ... ئالا. ئەو گەڵایانەی چەندان وشەی زەردیان لەروو زەردی خۆیان پێچاو بۆ مەرگیز مردن.

ئەوشـــەو شازنـــە ونـەکـەم ئاسکێکی سپی‌نـەرمی چاورەشـە بەرەو بەغداو ئێوارە نازو چرپەو هەناسەی تازەم دەبات. لە ناو تەمی سپی گیـانـیـــدا ون دەبم، رووحم هەسـت بە ترسێکی سەیـر دەکـات. چاوەکانم لەسەر نیگای بیبیلەکانی هەڵدەخلیسکین.

- لەوە دەچێت نیازتان بێ «هێشکلیفێکی» کوردی دروست کەن.

- خۆزگە «کاترینا» بوومایە دوای ئەو قەرەجە رەشە دەکەوت و لەناو تاولی سپی گیانیدا وەك فریشتە دەژیام[1].

خەمێکی کۆن خۆی لە نێو چاوەکانی‌دا شاردبۆوە. دە ئەو خەمە بیـارێنـەو وەرە باوەشی غەریبیم. با لەژێـر بارانی رقی ئەو «مـرۆڤـە» شێتـەدا لە نێـو یەکـدا بتـووێینـەوە.. با ببینە دوو کەروێشکی کوڵك نەرمی گوێ شۆڕ.. گاڵتە بە مرۆڤ و دووکان و بازارەکەی بکەین.. گاڵتە بە هێزو فیزەکەی بکەین دوو کەروێشکی سپی ناسکی گریاو گریـاو بۆ هەمـوو ئەو شاخـانـەی رمـان، گریاو بۆ هەموو ئەو زەویانە لەپـەریـەکچـون. دە بیـارێ با بتـوێینـەوە.. با ئێمە لە شەرمی ببینە کەروێشـــك و مرۆڤیش لە شەرمـــان سەری گێـــژی هێنـــدەی دیکـە ئەستـــووربێ.. ئێستـا تێـدەگـەم ئەو، لاشـە بچـووکـە چ هێـزێکی سحری‌و ڤینێکی گەورەی تێدایە.

- بۆچی ئەو هێزە سحریە ناکەی بە شاژنی مەملەکەتی خۆت؟

- خۆزگە دەمتوانی

خۆزگـــە، لەشـــەوێکی‌وا دا کە لافـاوی پیـسی دنیـا مرۆڤ وەك چڵە قامیشێك پێش خۆی دەدا، دەبێتە دنیایەکی هێندەکەسك ئاوی دەبات..

ئەو شـەولای‌لایە بۆ ئەستێرەکان دەکەم و دەیان خەوێنم، ئاسمانیش رازی دەکـــەم ئاوداتـە هەر دوو گوێچکـەی خۆرو چەنـد مەترێ لە سەرووی ئاسۆوەی دانێ نووکە شەقێکیش لەو شاخەی ئەو بەرماتەوە هەڵدات و پانی کاتەوە. دنیا دەبێتە ئێوارەیەکی «وەزیریە»و دارەکانی ئەوبـەرو ئەوبـەری شەقـامـەکە وەك دوو دڵداری دێرین سەر پێکەوە دەنێن.. یادگـارەکـانی منیش دەبنـە باڵنـدەی بزیـوو لەنێو دارەکان دا دێـن و دەچـن.. بۆنی گوڵـــوك و گەڵاو دارەکـــان دەهـــاژێنن. دوو زەلامیش تێکدەئاڵێن و وردە وردە بەرەو ئاسۆ دەرۆن... تا دەگەنە لێواری خۆرەکە جا هاواریان لێ‌دەکەم کە بگەرێنەوە بەڵام نایـستن.. بەغار بەدوایان دەکەوم کاتێك کە دەیانگەمێ.. تەنها قاوغی لاشەی منە بەجێ ماوە دەنا هەردووکیان لەناو رۆژەکەدا سوتاون.

چەنـــدان جاری‌کـــە لەکپی ئەو شەودا دەسـووتێ‌ی وکپ نابی.. دەبنوو.. دەبنوو ئەوە سێ ساڵە «کاترین» لە نێو گەرداوی بەفرباریێنی شاخەکان دا چاوەرێیە.. تۆش دڵرەقانە چاو و دڵی دەهارِی.. ئاخ چ برینێکی دەم کراوەیە! خوێنی کام بیابان پری دەکاتەوە!؟ شێتیەکی بێ کۆتـــایی‌یـــە.. مردنێکی ئەبـــەدییە.. کزەبـایـەك دێت و لە نێـو کۆڵانەکەدا دەنگی سەگ دێت.. لە شەوی ئاوادا شەرە سەگ تەنها ترس وەبیر خەڵك دەخاتەوە..

- کچێ ئاخـــر خۆشـەویستیم هێنـدەی رقم ترسنـاکـە.. کچی ئاخر

خۆشەویستیم دوای مردنیش روحت بە یێ ئازار ناکا.

ئەو شۆ تاریکی سەگ و دز تێکەڵ یەك دەبن.. سمێڵی بابری شاخنشینەکانیشمان لە یەخەی ئافرەتە دەسەمۆکان نابنەوە.. دەبا ئەو شەو ژیان و مردن ئاهەنگی زەماوەندیان وێکرا بگێرن.. کامتان خوێنی شێخ بە شاقەلی نەپرژاوە.. کامتان لە کوشتنی «حەلاج»دا بەشداریتان نەکرد.. لەکاتێکدا دایکی خۆتان ناناسنەوە پشیلەیەکی دەستەمۆی سمێل فشی چاو جیزتان هێناوە، هەموو مل شۆر لە بەردەمی‌دا وەستاون، وائەزانن پڵنگی باوکتانە! چاوگەش گیان لەو وشانە شەرم مەکە.. ئەو وشانە دەکەینە نووکتە.. با سیحری ئەو وشانەش فش کەینەوە.. با ئەوانەی کە خۆیان بە باڵۆنەکانیانەوە هەڵواسی‌وە، لینگەو قوچ بکەونە خوارێ.. با هەرکامیان رەشایی پاشەڵی ئەوی‌کەیان ببینێ تا قێزیان لە مەردایەتی پووچەڵیان بیێتەوە.

ئاخ لە مۆتەکەی خەیاڵاتی ئەوشەو! دە کچێ لە هەر شوێنێی هەی وەك پەڵە بارانێکی سەوز بەسەر دنیای غوربەتم دا بیارێوا لەسەر چەرپاکەم قووت بەوە.. بۆ هەمیشە دەچینە ناویەك... لە نێو یەکدا دەبینە مۆمیا.. جێگاکەم بەشی هەردووکمان دەکات.. تۆزێکی کە وەرە پێش.. دەستەکانت باوێ سەرملم... با بە دیوارەکە نەکەوی..

- هیچ نەگۆڕاوی، کە ئەوشۆ نەهاتبای دەبوومە گرێکی سەوزو مەزارێکم ئاوەدان دەکردەوە.

- سەربنێ بە سنگمەوە.. سەربنێ بە دڵمەوە بزانە چیت پێ‌دەڵێن..

بزانە لە حەیفیان ناسووتێ‌ی.

تاڵەقژەکانت ختووکەی ملم دەدەن.. دەموو چاوی بچووکت لە نێو ریشم دا ون کە.. گوێت لە دەفەی سنگم بێ.

بە ناو خۆتا شۆڕبەرەوە..

لە بن سیلەی نەمامێکی تازە پشکوتووی گیانتا

منداڵێکی رووت خەوتووە.

تازە چاوی کردۆتەوە..

پەپوولەیەك لەسەر پێڵووی هەڵنیشتوە..

تیشکێکی رِوونی هەنگوینی وەکو چاوت.

بەر چاوەکانی کەوتووە..

خۆت مەجووڵێنە.. دەنگی دڵم لە قەی باڵی کۆترێکی سەربڕاو دەچێت گوێ لە دەنگی باڵە سووتاوەکانی بگرە.

توخوا گیانە دەری مەکە..

ئەو منداڵە دڵی منە.. لە ژێر گیانی پیرۆزی تۆدا خەوتووە..

لە ناو جوانی‌و دنیای پاکی عەشقی تۆدا پاڵکەوتووە.

دەڵێی گەڕێ با لە مردنا هێمن بێ..

دەڵێی گەڕێ با لە مردنی ئەوشەو یا ..!

دەمی لە ناو دەمتا ون بێت.

مردن کۆتاین خاڵی ژانی مرۆڤە... لەدایك بوونێکی نوێ‌یە.. ئەوشۆ دەنگی سەگ ئاوازێکی نەبڕاوەیە.. ئاهـ.. چ.. شەوێکی سەختە..

ئاهـ لە تەنهایی.. ئاخ لە مۆتەکەی خەیاڵاتی ئەوشۆ.

دەبنوو سەربنێ ژێر باڵی خەو.. بە نێچیری خەوێکی بێ کۆتایی شەو لە تاریکی خۆیدا دارو بەردو شاخ و قەڵەمی شکاو دەشارێتەوە.. جاران شەو وڵاتی دزو قەڵای مەردان بوو،

ئێستاش میراتێکی نابووتەو لە ئەستۆی شاعیرو بە ئەمەکانیان بەستووە.. نیوە شەوەو گۆران لەگەڵ قەڵەم و کاغەز ماندوودەبێ... «دەستی چەپی» دەخاتە ناو گیرفانی پانتۆڵە رەشە خەت خەتەکەی، بە نێو بەفردا بە تەنیشت پەیکەرە سپی‌یەکاندا تێ‌دەپەڕێ.. بڕۆیتە هەرشوێنێ هەر کوڕەکەی «خاك و خوڵی»و نووکە رمی رۆمەکان لە ورووژانی مێشکت ناکەوێ.. دەتۆ بنو خۆ شاعیر نیت.. دە لە تاریکی شەودا وەك دارەکەی ئەوبەرتانەوە ون بە.. شاعیر»یش وشەیەکی «فلکلۆری» یەو، شیعر ئەورۆ فەریکە گوێزێکی سەوزەو لە نێو دەمی بێ‌دەدانی شاعیرەکاندا فڵتە فڵتیەتی. «حەبیبە» جارێکی کە ناچێتە[...] سەر مەزاری «شێخ هەباس»و لە باوەشی رۆمەکان دەخزێ.. د[...] ئەو شۆ «نالی» نەبێتە چەنگە خڵەمێشێکی رەش و دەمو چاوی [...]گرانی سواخ نەدا!!!

ئەوە کەڵەشێر خوێندی‌و پیرێژن[...]ـدی چاوەڕێ‌ی کوڕی ناکات... سەر دەنێتە سەر سەرینە پەڕەکەی‌و دەنوێ... دەبنوو پیرێژن.. وا من چاوەڕێ‌ی «حەبیبە» دەکەم... هەمووی لە چاوی ئەفسووناوی تۆ دەترسێ.. ها هەر ئێستا دێتە ژووری.. پێڵاوەکانی دادەکەنێ تا دەنگیان نەیەت.. وردە... وردە پێیە بچکۆلەکانی دادەنێ‌و دێت.. هەموو لەشی تەڕە.. ئەوە لە کوێ‌وە؟ وات لێهات لە باران بترسی؟ ئەدی بارانی ئێوارانت بە بیرنایە؟ کە دەستمان تێکدەگرت و بە نێو باران دا وەك بووکە بە بارانە دەسووڕاینەوە.. شەقامەکان جوگەلە ئاویان پێدا دەهات و خەڵکەکە دەچوونەوە

ژووری هەر ئێمەی عەشقە باران بە ئەنقەست پێیەکانمان لە ئاوەکەدا ون دەکرد.. هەورەکان وردە وردە دنیایان تاریك دەکرد.. چاوەکان وەك سەری کیسەڵ دەچوونەوە بن قاوغەکانیان... منیش دەستی چەپم لە کەمەرت دەئاڵاندو تۆش سەرت بە شانم دەکرد هێدی هێدی دەرۆیشتین.. دەبباری..

ئەو بارانەی لەگەڵ ماچی تەنهایما، ئەتوێتەوە..

دەبباری

ئەو بارانەی لەسەر کولمەی یارەکەما،

وەك ئاورینگ ئەلەرزێتەوە

دە دابکە..

لە غەریبیو عەشقی منا..

دە دابکە..

لە سووتانی دڵی منا..

بە نێو ئەو شارەدا دەبوینە دوو پەیکەری گەروك و باران دەیشتینەوە.. گەلاکان دەشۆرانەوەو دەبوونە زیو.. پەرەی گوێمان سوور دەبوونەوە.. دنیا تەمێکی تاریك دایدەپۆشی... هەموو ڕۆژانی باران گیانی من پەلەی دەدا، هەمو ڕۆژانی باران گیانی من سەوز دەبوو.. خورەی ئاوەکەزیادی؛ دەکرد دەنگی یەك باڵندەش نەدەهات، دەبا لافاو هەموو شتێ بشواتەوە.. گەلای زەردو خەڵکی گەنیوو لەگەڵ خۆی ڕامالێ.. لە ولاتی ئێمە پێویستە سەدەیەك باران ببارێ.. پێویستە دیوارو سایتەی خانووەکان هەموو لابرێن.. تا تێکرا بکەوینە بەر باران.. تا ئەوانەی وەك سیپاك لەودیو دیوارە ئەستوورکانەوە کو وتوون بکەونە بەر باران... بەلام ئاخ لە ئەستووری دیوارەکان' حەبیبە، وەك پەرە سێلکەیەکی تەڕ سەری بە شانم کردوە.. تر ، و دەموچاوی بە باران شۆراوەتەوە... لە نێو تاریکی باران دا جگە لە ئێمە تاکە زیرووح نابزوێ.. کزەبایەکی سارد دەست پێدەکات و دەستەکانمان لە بن باڵی یەك دەنێین.. چاوە تەڕو فراوان و کراوەکانی «حەبیبە» لەبەر باران هێندەو هێندەی دیکە سیحراوین.

- تۆخوا چاوگەش

لەژێر سێبەری باران و بۆنی گەلای دارەکانا..

وەرە باوەشی غەریبیم

وەرە باوەشی تەنهایم

با لە نێوان کولمەکان و لێوی تۆدا بارانی گەش بخۆمەوە.

با بە سەری کەزیەکانت

«دڵێکی عاشق هەڵواسم لە ناو باران دا بخوسێ»

بە خوساوی لە ژێر دار پرتقاڵێ دەوەستاین.. بۆنی «قەداح» مەستی دەکردین بارانەکە سووکی دەکرد. تاکو تەرا دڵۆپە باران لە گوڵاوەکانی دەدا.. بە هێواشی خۆرێکی تازە دنیای شۆراوەی ڕووناك دەکردەوە، ئێستا بەغدا لە چاوی منداڵێکی رووح سووك دەچێت. دەکەوینەوە سەر شەقامەکان و تیشکی خۆر وشکمان دەکاتەوەو هەڵمەمان لە شان و مل هەڵدەستێنێ.. لە ناوەراستی ئاسمان دا پەڵە هەورێکی سپی بەجێمابوو.. دەمانویست بێینە تەمێکی ئاڵ و لەناو هەورەکەدا چاوشارکێ بکەین.

بۆنی گەلاو باران و «حەبیبە» دنیایەکی سیحرین... دنیایەکی دوورن.. ئای لەو شتە سادانەی مرۆڤ لە خۆشی‌یان دا سەر شێت دەکەن.. دو باڵی لێ دەروێنن و بە قەدەر دنیا زەردەی دێنێ. هەر ئەو شتانەش ئەو شۆ لە من بوونە مۆتەکەیەکی رەش و بە قورسی لەسەر سینگم پاڵیان داوەتەوە.. دەبنوو دەی.. کەڵەشێر خوێندیو پیرێژن نووست و حەبیبە هات و رۆیی.. چاوەکانی تۆ هەر زیتن. باران باریو خورەی برا تۆ هەر دەنگت دێ، لەوە دەچێت ئاسمان تاکە خەم خۆرت بێت بە دیارتەوە ڕۆژ بکاتەوە، ئاسمان بکە پەڵە قەرسیلێکی سەوزو وەك کزەبای بەیانیان دەست بە پشتە نەرمەکەیدا بێنە، لە ناوەندی قەرسیلەکەدا کۆگلێك دروست کەو بیکە سەرین و هێمن بنوو.. با لە هێمنیدا قەرسیلەکە هێندە گەورەبێ ئەگەر لە خەویش ڕابیو هەستیشیە سەرێ دیارنەبی. با ببیە پارچەیەك لە ولاتی قەرسیل. مەبە «هیثکلیفی» رق و تۆڵە.. ولاتی کاثرین.. ئاسوودەیی کاثرین مەشێوێنە.. با هەموو شەوێ ژانێکی بێ ئۆقرە لە چاوت گەرێ. بە تۆ بە تەنها بارتەی خەم بی با هەموو شەوێ چاوەکانت بینە بەرگی «شێخ هەباس»و بەنووکی رمی رۆمیەکان بدرێن. تاریکی شکابنوو.. پێش ئەوەی بە خەبەرت بێنن.. دەبنوو چاوو دڵ و مێشکت قورس بوون.

لەم شەرحی دەردی غوربەتە، لەم سۆزی هیجرەتە

دڵ ڕەنگە پێ بە ئاو بە چاوا بکا عبور.

پەراوێز:

١ - هیثکلیف و کاثرینا: پاڵەوانی بەناوبانگی رۆمانی مەزنی «بەرزاییەکانی وێثەرینگ»ن، نووسینی رۆمان نووسی ناودار «خاتوو ئیمیلی برۆنتی»یە.

■ چیرۆك ■

# کۆرپەیەکی بێ ناز..!

● سۆران مەحوی ●

تازە خێزانی کرد بوو. . ژنەکەی سکی چل شەو بوو. . چۆن لە تەمەنی زگورتێتی دا بە کولەمەرگی دەژیا. . ئێشتاش ژیانی خێزانی لەوسای باشتر نەبوو.

ئەوەنــدەی نەبـرد بێ سەر وشـوێن کەوت. . ئەوون بوونـەی ون بوو. . تا دەچوو درێژەی دەکێشا.

دایکی بیـری هەر بەلایەوە بوو. . بەو دیمەنە بیرەوەرییە تاڵەکانی خۆی دەهـاتـەوە یاد. . چووە خامۆشی یەکەوە. . «. . ئاخۆ پەرەی دڵـەکـەم ئێستـا چی بەسـەر هاتـووە؟!!چش. . . لـەوەش چی لە دامـاوەکـەی خێـزانی بکەم؟!!. . تۆ بڵێی کۆرپەکەی کەبوو. . باوکی ون بووی ڕۆژێ بێ لە ئامێـزی بگـرێت؟!!. . خـوایـە کۆرپەی هیچ کە سێك بێ ناز نەکەی؟!!.»

ڕوو داوەکـە لە مێشکیـا بنجی دیمـەنێکی ژەنگـاوی داکوتا بوو. . بیـری باڵـە فڕێی پێکـەوت و بۆ زۆر بەرز دەفـڕی. . یـەکە یەکە ئەستێـرەکـانی ئاسمـانی بێ سنـوور دا تەی کرد. . و لە باڵە ئەوە دا چۆوە خامـۆش یەکە «. . . ژیان بۆ زۆر کەس واها تووە. . ڕەنگە بۆ زۆر کەسـی کەش هەر وەهـا بڕوات. . بەڵام گرنـگ ئەوەیـە بەرگەی بگرێت. . ئەگینا سەر ئەنجام لە هەموو شتێك دەبێتەوە دەدورێت!!.»

بە دەنگێکیبەرز:-

- بڕوا ناکەم نانێکی سووداوی بێ پەیدا ببێ؟!.

«. . ویژ دانیش قووبوول ناکات بە ڕووی سوورەوە. . ئەو بۆ ئەم ڕەشـە خێـزانـە خۆی برە نجێنێ!!. . هـەر ئەوەمان ماوە لەم دوایی یەدا ببینە تەحا تەحای خەڵکی!!». بەدەنگێکی بەرز:-

- بەشێکی خەڵکەکە بێ مروەتن و خوشك بە براوە دەنێن.

پاش ئەوە چۆوە خامـۆش یەکـە«. . ئـەی چارە ئەبێ چیبێ؟!!»بە دەنگێکی بەرز:-

- خۆم ئەزانم دوایی ئەوەش هەموو گۆناو ڕووەکە هەر دێتەوە ملی من.

دوای تۆزێ بیـرکـردنـەوە چۆوە خامـۆشی یەکـە«. . لـەو عومرەدا نەمـاوم نان و پیـازم پێـوە بخۆن. . چاك وایە. . ئەو کارە من هەر لە ئەستـــۆی خومـی بگـــرم.». تەزووی وریـــە. . لـــە مێشکی ورووژاوی کاری کرد. . نـەخێـر ئەوەندەی تر تەپۆ بوو. . چۆوە خامۆشییەکە«. . . قەت ئەوەندە بێ غیرەت نەبووی؟!!. . باکت لەچیـیــە. . وابــزانـە ئێستـاش هەر تاقی لاوێتیـە و وەك جاری جارانیش بەگۆلاو برین و ئاو ڕۆ کردنی ناو ئەستێل و دێراوەکانەوە خەریکی. .»

بە دەنگێکی بەرز:-

- نەء. . ژیان بەم حاڵەشەوە ناچێتە سەر؟!!.

بۆ دوا جار چۆوە خامـۆش یەکـە«. . هـەمیشـە ئەم کارانە ڕەفتاری ئەوانـەن بە چاویلکـەیەکی لێڵ و تاریکەوە هەردەم دەڕوانە ژیان و نازانن ژیان لەوە زیاترەو لەوەش لە زۆر ڕوووەوە پیرۆزتر دەبینرێت».

بۆ دواجار بە دەنگێکیبەرز:-

- پێـویستـە بیـرێ لەمە بکەمەوە. . و چارە سەرێکیش بۆ دابنێم. . تەنانەت ئەو وزەیەی هەشمە هەمووی بۆ بخەمە گڕ.

×-٥-٥×-٥-٥-×

بریــاری ئەوەیدا گشت ڕۆژێ شەبـەقی بۆ سەر کاری کورەکـەی بچێت. . گـەلێ کۆك تر لە«ئـەحـۆل»کـارەکەی دەگێرا. . سەرجەم گوزەرەکـــە جگـە لە«ئـەولـڵای مام عەزیـز» بەخیلیـان پێ ئەولـڵا لاوێـکـی پاك و نەفسبەرز بوو. . تەنهـا ئەو لە گوزەرەکــە دا دڵ نەوایی«پووره شەمەی»دەکردو جەرگی بۆ دەسووتا و ورەی دەنایەبەر:-

- دەك سەد پیاوی بێ غیرەتت بەقوربان

شەمـە جوولا. . زیـاتـر پشکـۆی مەینـەتییـەکـانی ژیان بە پێیدا دەچـزا. . نەخێر کەوتە گێرانەوەی بەد بەختییەکانی ڕۆژانی ڕەشی رابوردووی خۆی:-

- تۆش وەك ئەولادم وایت لە ئەحوڵت جیا ناکەمەوە!!

بە دەم ئاخ هەڵکێشانێکەوە:-

- چیت لێ بشـــارمـــەوە. . کات هەر ئەم وە ختـە بوو. . باوکم لە شەرەکـەی قازی دا بە قەنـارەدا کرا. . وە دایکیشم وەك ئێستای من بێ مێرد مایەوەو کۆشێ منداڵی بەمل دا کەوت.

پاش تۆزێ بیر کردنەوە:-

- کەسێ نەبوو!! بەڵێ لایەکمان لێ بکاتەوە!!
شەمە بەدەم ئەم قسانەوەی تا دەهات، چاوەکانی پڕ لە فرمێسك دەبوون، هەیتا، هەیتاش ئاخ وئۆفی هەڵدکێشا:-
- خاڵیشم وێنەی ئەحوڵی خێر نەدیوو تاقانە بوو. . ئەو سەرەی نایەوە، کەس نەیدیبووە!! ئیتر لەوەودوا کەسێ نەبوو بەخێومان بکات.
هەر لە سەر قسەکانی دەڕۆیشت:-
- ئەوڵڵاگیان. . من شەڕم ناوێ، شەڕ دوژمنە. . شەڕ بێ حەیایە!! بێناموسە. . کاولکارییە، ڕوخاندنە مردنە!!
«. . تف لەشەڕ. . لەوەی شەڕی دەوێ!! لەوانەی جەرگی ئەم و ئەو بە ساجەوە دەنێن».
چەند دڵۆپە فرمێسکێك بەرچاوی کرت و بە ڕوومەتە چرچەکەیدا جوگەلەی بەست. . بەکزی یەکەوە. وتیەوە:-
- ئێستاش خەمی بوونی کوڕپەکەیمانە!.
- بۆچی؟!!
- چۆن ؟!! بۆچی؟!!
- ئەی کوێری نییە؟! ئەو کوڕپەیە لە باوەشی نازو نیعمەتی باوکێتیدا بێ بەری بێت؟!!
بەو قسانەی شەمە ئەوڵڵا ئەوەندەی تر گیانی سۆزو بەزەی تێ گەرا. . بە هەستێکی گەرمەوە کەوتە لاواندنەوەی پووری و ڕووی لێنا:-
- باسی چیدەکەیت!!ئەوەی چوو چووا!! پاش تۆزێ وەستاندن:-
- منیش!!
- تۆش چی؟!!
- دەڵێم:- شەڕ بێ ئاه بە، زۆرشتی بە دواوەیە!!..
«. . . دەك سەد پیاو ێ غیرەتت بە قوربان بێ».
-٥. ٥ . ٥×٥. ٥
هێشتا لە گەرمەی قس دا بوون. . کە چوونە سەر باسی «حاجی ئەورە حمانە خێل». . وئەو بێ مروەتە چۆن هەست و بەزەیی دۆراندوە. . وهەڵی ڕۆژانی شەڕو ئاشووب وەرگرتووەو چاوچنۆکانە دەیەوێت

هەموو کاڵەو پیتاڵی عەمارە پۆی چەند ساڵەی بێ نرخی بە نرخ و بەهای ئەمرۆ شاخ بکاتەوە. . بەڵێ لە گەرمەی ئەم ڕازەدابوون. . کەچی لەپڕ دەنگی هۆڕنی ئۆتۆمبیلەکە ڕووی پێوەر چەر خاندنە لای «تابووتە»کەی سەری و لە قسەی کردن.

تابووتەکە بەوەی لە تۆزو خۆڵ هەڵکێشرابوو. . دیار بوو لە ناوچەیەکی دوورەوە هات بوو. . نەخێر ئۆتۆمبیلەکە هێدی هێدی ملی نا بۆ ناو خەڵکەکە. . لە چەقی شەقامەکەدا گیرسایەوە- شۆفێرەکە لە گەڵ پیاوەکەی تەنیشتی بە گوژم چاوییان دەگێرا. لەکە سێکی دیاری دەگەران بۆ دۆزینەوەی کەس و کاری. .
شەمە بێ پرس لە ئەوڵڵا جیا بۆوە. . و ڕووەوەو ئەوان ڕۆیشت. . «. . خوایە ڕەحم کەی!! لە مێژە دڵم خەبری داوە. .».
پیاوە ڕەدێن سپییەکە نوورانی یەکە. . بەرەو ڕووی هات. . وکەمێ خێراییەکەی هێواش کردەوە:-
- ها. . . خوشکم ئەوە خێرە؟!!
- تا. . . ئەوێ دەچم
«. . . خوایە ڕحم کەی!! لە مێژە دڵم خەبری داوە. .».

پیاوە ڕەدێن سپییەکە دووی کەوت. . بەبەر لووتی تابووتەکەوە دامان . . بەو دیمەنە خەڵکەکە حەپەسان. . هەر یەکە لەو ڕووەوە بە جۆرێ ڕاو بۆ چوونی خۆیان دەردە بڕی:-
- ئەوە تەرمی ئەحوڵی خێر نە دیووە؟!! داماوەکەی ژنی ئەمرۆ منالی بوو. . ئۆف چ کوڕپەیەکی بێنازە.
+ تاوان. . تاوانی شەڕە.

÷ ئەمە سەرەتایی تاوان بێ!!ئاخۆ کۆتایی بەچی بشکێتەوە؟!
× بێ دەنگی مایەی غیرەتییە!! بۆکەسێ هەیە لەمە بێ دەنگ بێت؟!!

شەمەوەك زفت بەجەرگەکەیەوە . شینی کۆن و نوێی تازە دردەوە. . «. . شووکرم بەس نەبوو. . دیاز ئاخیری نەبووم. .». جەرگەکەیان بۆ بردەماڵەوە. . هەموو خەمەکە تەنها بۆئەو مایەوە. . دوایش خەڵکەکە بە یەك دوو دڵۆپ فرمێسك ڕشتن هاوبەشی کلۆڵیان کردوبەوەشدا پرسەیان بۆنەگرت. . هەموو یەکجارەکی چوون یەك بڵاوەیان لێ کرد.

تێ بینی:-
ئەم چیرۆکە لە ساڵانی(١٩٨٣ - ١٩٨٤)دا لە ئێستگەی کوردی لە بەغدا، لە گۆشەی چیرۆکی هونەریدا خوێنراوەتەوەو توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی لە سەر کراوە.

# پێنج چیرۆکی زۆر کورت

طاهر صالح سعید

## - 1 - کەلاوە

دەگێرنەوە دەڵێن شەقامێکیان بری کەلاوەی پیرە دایکێك ڕێی پێ گرتن. لە بری ئەوە کۆشکێکیان دایە قایل نەبوو. کەهاتنە سەر ئەوەی بە بەر چاوی یەوە بیخەن و بە یەکجاری شوێنەواری بسرنەوە گیانی سپارد.

وەلام بەر لەوە لەچاو تروکانێك دا بەوەدا گەیشت. دووا یادگارو بیرەوەرییە تاڵ و شیرینەکانی تەمەنی دوورو درێژی لەگەڵ ئەو کەلاوەیەدا بپێچێتەوەو بیبات. بیبات و بۆ شەقامە نوێیەکەی جێ نەهێڵێت.

## - 2 - ئەم شەو

ئەم شەو بۆ جارێکی تر (بوخارست) بەرگی سپی بووکێنی دەپۆشێت و لە باوەشی ئارام و هێمنی دا سرەوت دەگرێت. بوخارست ئەم شەو لە وولاتەکەی نیمە دەچێت. بەفر دەبێتە میوانی هەرماڵێکو رێی و بانەکان دەبەسترێن.

ئەمشەو لێرەو لەم شارەدا، لەژێر کلووی گەورە گەورەی ئەو بەفرەدا مێزێکی لاکێشی زوورێکی چووار گۆشەی ڤیلایەك دوو کیژی بوخارست ی دوو لاوی (چوارباخ)ی لە دەوری خۆی خڕ و کۆ دەکاتەوە. ئائەو دەمەی پاڵ ئەدەن بەنیوە شەوەوە ئەوان بەیەك دا دێن و دەچن. بۆیەکتری دەدوێن وگوێ لە یەکتری دەگرن. دەخوێن و دەخوێنەوە. باوەش بۆیەکتری دەکەنەوەو یەکتری لەئامێز دەگرن کەیش شل دەبن، دوو دوو جووت دەبن. پاشانیش خۆیان دەدەنە دەست خەوێکی قورس.

بەرە بەیان دووای ئەوەی ئاسۆ خۆرێکی گەش بۆ بە فری سپی ئەو شەوە رادەگرێت چوار قوڵی پشت پەنجەرەی ئەو ژوورە دەکەون. چاو دەبڕنە ئەو بەفرەو رادەمێنن هەر چواریان بیر لەشتێك دەکەنەوە. ئەویش ئەوەیە کە شەوگاری شەوێکی دوورو درێژیان بەڕێ‌کردو تامێکی ناوازەیان هەشت. بێ‌ئەوە بە(زمان نەئەمان هیچ لەوان(و) نە ئەوان هیچ لەمان تێگەیشتبن.

## - 3 - پەڵە

ڕۆژانە بەر لەوەی هێشتا کەس پێ بنێتە ئەو دیو دەرگای ئەو فەرمانگەیە. دەنەوێتە گەسکەکەی و لە گەڵیدا دێت و دەچێت. بۆ جارێك و دووان و دە پیایدا دێتەوە.

ئەو ئەوە پیشەیەتی. ئائەو دەمەی ئەوفەرمانگەیە خۆڵی مردووی بەسەردا دەکرێت و خۆی دەداتە دەست کری وبێ دەنگی. ئەم دەمەو بەیانەش، وەك هەر دەمەو بەیانییەکی تر. ئەوی یە گەسکەکەی و لەگەڵیدا هات وچو. تا کاشییەکان بە بەر

چاوی‌یەوە لە پەڵەو لە کەکان پاك بوونەوە. ئەوسا هەناسەیەکی ئاسوودەیی پڕ بە سی یەکانی دایەوەو گەسکەکەی بە پێوە ڕاگرت و پاڵی دا بە دیـوارەکـەوە. کزۆڵـە لە پەرێـزی هەر یەك لەو فەرمانبەرانەی کە بەروو دووا قاپی فەرمانگەکە لەپێش وازی‌یان دا خۆی بۆ خستبوونە سەر گازی پشت.

ئەو لەوەدابو کە بەڕێوەبەری فەرمانگەکە ئەم دیو دەرگاکە کەوت و چاوێکی ووردو خێرای بە کاشی‌یەکان دا گێڕاو لەبەر دەم پەڵەیەکی بچووك دا ئیستێکی کرد. کە لەو خۆی شاردبووەوەو خۆی بۆ ئەم ڕاگرت. ۰

بەڕێوەبەری فەرمانگەکە بە لا لووتێکەوە ڕووی وەرگێڕا بەلای داو پێی ووت:

- پاك کردنەوە وا دەبێت؟!

بەو پرسیارە ڕەنگێکی هێناو ڕەنگێکی برد. دەمی چووە کلیلەو هیچی پێ نەکرا لەوە بەولاوە کە لە پاڵ گەسکەکەی دا ووشك بو.

- 4 - خەلات

ڕۆژانە پانیـاییـەکـەی دامێنی گەڕەکـەکـەی بەر پێی شار دەبێتە یاریگـەی منـداڵانی ئەو گەڕەکـەو، یا ڕیـسـەکـانیـان لەوێدا دادەبەستن. ئەم دەمەو ئێوارەیە بۆ جارێکی دی منداڵانی ئەو کوچـەو گەڕەکـە لە هێڵێکی ڕاست دا، شانی یەك دەکـەون و ئەڵقاو ئەڵقی گەڕەك بو[illegible] ڕەنگاوە کانیان ڕادەخەن.

ئەمڕۆ منـداڵانی ئەو[illegible]ـە باڵ بە هەنگـاوەکـانیـان دەگرن و لەوەش زیـاتـر دەبنە ڕەشـەبـا. بەو هیـوایەی هەریەکەیان لای خۆیـەوە ببێتـە خاوەنی ئەو جووتـە پێـڵاوە لاستیکـەی گوڕجك پڕێکی گەڕەك دەیکـاتـە خەلات و دەیـداتـە ئەو منداڵەی بەر لە هەمووان دەگاتەوە شوێن و جێگەی خۆی.

یەك... دوو... هەرسێکی

ئەوەتـە وا منـداڵانی گەڕەکـەکـەی بەر پێی شار وەك تیـسکـەی تفەنگ دەرچوون و هێڵەکەیان جێ هێشت. لێرەو لەوێ لێیان کەوت و، لێـیان گلا. ئەوانی دی‌کە، ئاوڕیان لێ نەدانەوە.

ئەنجام منداڵێکی گەنم ڕەنگی چاو گەش، دووای ئەوەی بەر لە هەمـووان گەیشـت بە شوێـن و جێی خۆی. بۆ وەرگـرتنی خەلاتەکەی لە بەر دە م کابرای گوڕجك پڕدا ، ڕەپ ڕاوێستا دەمێك خەلاتەکەی وەرگرت و وەك شتێکی گەلێك ئازیزو ناوازە توونـد توونـد بەسنگیـەوە نا. بە پەلـە پێخـاوسـە خوڵاوی‌و ماندووەکەی تیا حەشار دا.

- 5 - تۆبلێیت؟!

ڕۆژگارێك پێش ئیستا ژوورێکی قلە جنۆکەی قوژبنی فەرمانگەیەك. ژوورێـك کەلـە دوو مێـز بەولاوە جێگـەی بۆ چی تر نەدەهێشتـەوە.

ئێمـەی لە هەردوو ڕەگـەزەکـەی لە خۆی دەگـرت ولـە خۆی‌دا کۆ دەکردەوە. ئەویش و منیش بەدرێژایی سێو چوار ساڵی ڕەبەق. لەو سات و کاتەوەی پێمان دەنایە ئەو فەرمانگەیەوە، تائەو وەختەی خۆڵی مردووی دەکرا بەسەرداو، خۆی دەدایە دەست کری وبێ دەنگی، بەنهێنی بۆیـەکتـری دەدواین وخـۆشـە ویستیمـان دەگـۆڕییـەوە. ئەنجـامیش بەو بارەیـان دا کەوت، کە هەریـەکـەمـان چارەنووس بە ڕێگەیەك دا کەمەن کێشی کات.

ئێـستاش دووای تەمەنێك. تەمەنێك لە جودایی‌و لێك دابران و دوور کەوتنەوە. جار جارێك دوور لە چاوی پـس من و ئەو بە یەك دەگەین لە هەر جارێك لەو جارانەدا ئەو نەخشەیەك لە بەر دەم پاشـە ڕۆژی من و خۆیـدا ڕادەخـات. نەخشـەیەك کەچی سەهـۆڵ بەنـدانی ئەو چەنـد وەختـەیە، بیتـوێنێتەوەو گەرم و گوڕییەك بە لەمەولامان بدات. لەهەموو ئەو جارانە دا ئەو واو منیش خەو بەو ڕۆژەوە دەبینم تۆبلێیت ئەو(هەوراز)و (کەژ)ی بەستـەڵـەکـەی کەوتـە نێـوانمـانەوە لە یەکا بتوێنەوەو ڕوبارێکی خۆشەویستی دروست بکەن.

١٩٨٨

## ■ چیرۆك ■

# بەفرو دیوار



پێشکەشە بە ئەندرێ یفیمچ پاڵەوانی
چیرۆکی (ژووری ژمارە ٦)ی چیخۆف

* غفور صالح عبدالله *

خانووە سپیەکەم کردە قۆناغی پشوودان، تۆ بڵێ کونجی بریاردانێکی دیکە. ئەنجا دوای ئێرە بەرەو کوێ بریار بدەم و بۆی تێ‌ی‌تەقێنم؟! تۆتکە ناگرم.... ! دەمێك بوو وتەکەی ئەنتۆشام کردبووە حەمایل و لەسەر شانێکم دامدووریبو، یان

کردبوومە ملم، خۆم پێ ئەخلافاند. (بەختەوەریی راستەقینە بێ‌تەنیایی مەحاڵە) خۆیشم پێم نەزانیبوو کە چۆن، رقم لێ‌ی‌هەڵسابوو «لەو وتەیە»، دەمویست بەهەر کلۆجێ بێ لە تارمایی‌و خێوی ئەو وتەنەحلەتیە رەهابم، قووتاربم، بیرەوێنمەوە. ئەمدەویست بگەڕێمەوە بۆ ئەو شارەی کە دووای

دە ساڵێك دەربەدەری وەکو نامۆیەك و نەفرەت لێکراوێك بۆی هاتمەوە.. دەرەوەی خانووە سپیەکە گەلێ سەرما بوو «تۆ بڵێ تەزیوو بوو» سەرمایەکی بەلەزەت بوو [illegible] ئەو دەوروبەرەی وەکو پەرەسێلکەیەکی نامۆ تاساندبوو، [illegible]داروپەردوو لە گۆ چوو بوون، پەل وپۆیان شکابوو (سەرما [illegible] من بەلەزەت بوو، دەشبێ ملیۆن کەس تێر جنێوی کەن و نەحلەتی بەسەرا ببارێنن. یەکێکە لەو دیاردانەش کە هەمیشە هەڕەشەو گوورەشە لە بوونی مرۆڤ دەکا، یان دەشبێ لەمەڕ من جۆرە خەیاڵێکی خۆکوشتن بێ) ئەو سەرمایەی مۆسکۆو بترسبۆرگیش نەبوو کە ئەنتۆشا لە چیرۆکەکانی‌دا باسی‌کردوە، گوایە گوێ‌ی بنیادەم وەکو هەویری هەڵبزرکاو هەڵدەوەرێنێ، لە وڵاتی لای خۆمان

دەڵێن هەرکە بەفر باری کەشی ناو بەفر فێنك دەبێ، بەڵام کزەبایەك لە گەرووی دەربەنەکەوە وەکو دەمە گوێزان هەڵیدەکرد، بەفرەکەی دەبەست. بەفرەکەش تازە خستبووی، دەوەنەکانی قەدپاڵ ڕیزە کێوەکە سەرو پاڵتۆی بەڵەك بەڵەکی سپیان لە خۆیان لوول دابوو. . بەڕێزان، بۆ ساتەوەختێ، یان تەنها جارێ ئەگەر رووخسەت بفەرموون لە دنیای پڕ ئێشی بیرۆکەی چیرۆکەکانم بەلەسەبم، بۆ ساتەوەختێ بەهەزاران پینەو پەڕۆو قیری سپی دەلاقەی (نەزیفەکانم) دەم بەست کەم.

ئەگەرچیش ئەمەی ئەم جارە (نەزیفێکی) دیکەیە، بۆن و تامێکی دیکەیە، ژانێکی دیکەیە، پرۆژەی خۆکوشتنێکی دیکەیە. ناوم ـمقادر رۆستەم ـ ە، بەڕێکەوتیش بوومە نووسەر، یەکەمجار لە دەزگایەکی چاپەمەنی بوومە گسگدەر، لەپاشانیش کۆڵکێشی کتێب، دواجاریش کاری تیپ ڕێکخستنیان خستە ئەستۆم. بەم کارە فرە خۆشحاڵ و خۆشنوود بووم، ئەوەندەش خۆشنوود بووم بۆیە هەر ئەو ڕۆژە نامەیەکم بۆ شارەکەمان بۆ دایکم رەوانەکرد، کە کوڕەکەی سەری گوریسێکی گرتووە، چاوەڕێی ئەوەشی لێدەکرێ ببێتە شت. . نەبوومە هیچ. . . دایکیشم هەرکەزانی نووسەرم ئەو ڕۆژەی گەڕامەوە بۆ شارەکەمان یەکەم مووچەی فەرمانەکەمی بدەمێ، چەموڵەیەکی لێنام و وتی «ئێسکت خواتەوە وەسیەتەکەی باوکت باش هێنایە دی، ئەیویست ببێتە دختۆرر تا نەخۆشیەکەی چارەسەرکەی». . دایکم تا دوای چەند ساڵێکیش نەیدەزانی لە کۆلێج سەرنەکەوتووم، دەرم نەبردوە، لە ڕۆژنامەیەك دا بوومە نووسەرێکی دەرەجە هەشت، ستوونێکیان پێ دابووم، خۆم و خەڵکیم بەقسە بێ سەروبەرەکانم تەفرە دەدا. . دایکم نەشیدەزانی ئەو ساڵانەی کۆلێجم بەڕاونان و هەڵخەڵەتاندنی کچان بەسەر بردوە، چەندان کیژیش لەبەر سەرکێشیو بێبەقایی من دەسبەرداری خوێندن بوون و مێردیان کرد، واتا بەختیانم سووتاندو پاشە ڕۆژیان چووە کۆشی وەرزی مێردوزاق و زۆقی منداڵ بە خێوکردنەوە. وا دیارە، لەبەر ئەوەی خۆم بەختم لە نێو دۆزەخێکی قیرین دا تەراتێنی بوو. دەربازبوونیش لێی مەحاڵ بوو، بۆیە بەو تەرحە ڕەفتارم دەکرد یان ڕەفتارم بەو تەرحە بوو، بێئەوەی خۆشم لێی بە ئاگابم، تا کەوتمە نێو هەڵدێرێکی هەزار بەهەزاری تۆڵەی ئەوانەوە، ئارەزووە سەرسەختەکانم ڕووەو ئامێز ئافرەتێکی ڕەشتاڵە پەلەکێشیان کردم، هەزاران جار لە زەریای پرشەپۆلی هەوەسەکانی ئەودا دەبوومە پەڕۆیەکی بێنوێژ، دوای بێزارکردنێکی ئێجگار، بۆ سۆزو کلپەی حەزم بەدەم زۆرە زۆری گریانەوە خپ دەبوو، ئالای خۆ بە دەستەوەدانی هەڵدەکرد. . لەگەڵ بوونی یەکەم منالمان سێبەسێ بەجێم هێشت، لە دەفتەری بوون و بیرەوەریما کوژایەوە، دووای ئەوەش ئەویش مۆرێکی نوێتری نایە سەر لاپەڕەی هەڵپرووکاوی قنچکە دڵەکەم، بووە قوبەیەك لە زنجیرەی خۆکوشتنە بێدەنگەکانم. . ئەللا، کە ڕێکەوتێکی بەدبەختانەیە، هەرزەکارێکی گەرمیانی لە هەموو داب ونەریت و دواکەوتوویەك هەڵبێو، لەوپەڕی شارستانیەتا ببێتە میوانی جادەو کۆڵانە پڕ نەخۆشیەکانی سێکس و لەش فرۆشتن و بۆن و تامی سەندەویچ و بەدمەستیی، بەڕێکەوتیش لە کۆشی ئافرەتێکی برسی هەموو شتێ ئۆقرە بگرێ. . !. بۆ دەرەوە دوور هەڵمڕوانی، بەردە قارەمان بیوە شێرە بەفرینەو، بەرەو ئاستێك دەمی دابچڕاندبوو، بەفر دایپۆشیبوو، تەنها کوندرەکەی ژێری ڕەش دەچۆوە، چلوورە شۆڕەوە بووەکانی بەردەمی کە وەکو ڕیزە ڕمێکی گێروگەواڵ بیوونە کەڵبە دڕەکانی، هەندێکیان لە ناوەڕاستەوە، یان لە نووکەوە بە هەچ هۆیەك پێ شکابوون، بنیادەم بوونی سەیرە، یان دەشێ هەڵەبێ، زۆر ناویتریش هەیە دەتوانی لێیبنێی، خۆی دەمرێو، داروبەرد دەکاتە مێژووی بوون و نەمریی خۆی، ئەوەندە شتە مردووەکانی سروشت مێژووی بوونی دەپارێزن، کەچی خۆی ناتوانێ بیپارێزێ. . ! دەشێ ئەم گابەردە، گابەردەکەی ـ سیزیف ـ بێ، ئەگەر ئەویش نەبێ، دەشێ ئەم

گابەردە هەر لەسەرەتای بوونەوە سروشت بۆ دیکۆری خۆی لەوێی دانابێ. یان ئەو گابەردە بێ کە - پرۆمیشۆس - یان

پێوەبەستەوە، یاخود پاڵەوانێکی دێر زەمان هەر بۆ گرەوکردن لەجێگایەکەوە هێناویەتی ولەوێی داناوە.. لە درزی

شووشەبەندی خانووە سپیەکەوە، سەمفۆنیایەکی کۆرژن خۆی دەکردە ژوورەوە، کۆرژنی سەدان ئەسپ، یان کەمتر دەیان

ئەسپی رەش و سوورو سپی‌و کوێتە، لەو بنارەو لە ناو جەرگەی مێژووەوە کەشکەلانی پرکردبوو، یەکێك لە ئەسپەکان گلاو

هەپرون و بە شەپرون بوو، سوارەکەیشی خەڵتان خوێن بوو، لە پاڵ گابەردەکە خۆی شاردەوە، تاراسپیەکەی بنارەکە

پەڵەپەڵەی خوێن تاریکی کرد، شێرە بەفرینەکە لەناو دەریاچەیەکی رەنگە سووردا لەنگەری گرتبوو، دیاردەی

هەڵکشان و داکشانی پێك هێناو شەپۆلەکان خۆیان دەکێشا بە قەپرغەکانی شێرەکەوە. وەناگا هاتمەوە پتر لە پەنجا ساڵ بەرەو

دواگەرابوومەوە، رقم لە خۆم بۆوە، نەمزانی بۆ..؟. لە هەموو کاتژمێرەکانی ناوخۆدا سەعات لە دەمەوعەسر لاکەل بیوو،

خۆرەکە لەودیوی دەم کەلی دەربەنەکەوە بەبێ رەزامەندی خۆی کەوتبوە خەڵوەتێکی کاتیەوە، یان هەر لە بەیانیەوە گەواڵەکان

بەتەما بوون بەردەوامی بە پیلانەکەیان بدەن بۆ گۆرهەوشاردانی هەتاوەکە، جارێکی دیکە بۆشایی گەردوون بەقۆزاخەی پەمۆی

تەزیو بتەنن. دووای درەنگە نیوەرۆیەك لە جادەو کۆڵانە بەفر بەستووەکانی شارەکەی - برایم پاشا - خۆم دەرفرتاند،

ئۆتۆمبیلێ بووە حەشارگەی گەرم بوونەوەم، نەمزانی ئەو ماوەیەی نێوان شارەکەو خانووە سپیەکە خەوم لێکەوتبوو، یان

ئەوەتا کەوتبوومە نیوگەرمەی لە خۆچوونە ئەبەدیەکانمەوە، هەر ئەوەندەم ناگا لەخۆ بوو زەنگێکی ئەفسووناوی ناوەوە بەخەبەری

هێنامەوە، کە گەیشتوومەتە دەربەنەکە وبەرانبەر خانووە سپیەکەش، بە دوو دڵیە زگماکەکەمەوە، یان ئەبەدیەکەمەوە (راننەدە)کەم حاڵی کرد لەوێرا دیمە خوارەوە. (ئەڵلا بۆنی بەفر.. بۆنی بەفرو بۆنی جەستەی نارەقاوی ئافرەت..!)

خانووە سپیەکە لە دۆڵەکەی بەرانبەر ریزەکێوەکە بەتەرحی تاشە بەردێکی چۆری شیر مت بیوو، دیواری چوارەم و دینگەکان

تازە گەچکاری کرابوونەوە، لە دووررراش سەربانەکەی دیاربوو دارماڵ بەفر بوو، بەڵام سێ دیوارەکەی دیکە سەرومر ئاوێنە

بەندبوون، لەناوەوە دوو دەرگا لەسەر دیواری چوارەم دەمی رەشیان دابوۆوە، پێش خزمەتەکان لێوەی دەچوونە ژوورەوەو،

بە دەستی پریش داخوازی مشتەریەکانیان هەڵگرتووەو، دەهاتنە دەرەوە، لە رۆژی واش دا کەم مشتەریە، تەنها دووسێ لاو لە

قوژبنێ بەدەم فیشکەی جگەرەو پێك هەڵدانەوە، زۆرجار بەبێ دەنگی چاویان دەبرییە دەرەوە وتاس دەبیردنەوە.. ئافرەتێ‌و

دوو سێ منداڵ و زرتەبۆزێك قوژبنێکی دیان سیخناخ کردبوو، بەکاوە خۆوە بە نان خواردنەوە مڵۆش بوون، دیاربوو دیمەنی

بەفرەکە ئیشتەهای کردبوونەوە، یان رێگای پێ‌گرتبوون.. یەکێك لەپێش خزمەتەکان بەکاوە خۆو بزەیەکی (موزیەفەوە) لێم هاتە پێشەوە:

- فەرموو..؟

- قاپێ شیری شێرو، لەگەڵ کاسەیە بەفری خوایی..

- مەزە...

- پێ‌ی‌ناوێ، تاڵی تاڵی دەبرێ..

بزەیەکی تەوەساوی هاتێ‌و لێ‌ی‌داو رۆیشت. زۆرجار چاوم دەبرییە ئەو ئافرەتەی کە زرتەبۆزەکە بەرانبەری رۆنیشتبوو وپشتی لێم بوو. ئەو ئافرەتە بوو کە بە[illegible]ز لێ‌کردنیەوە دەمێکە هەقم گرتووە، چاوێك دەتووت هەر[illegible]ونگی تاریکی هەیە دەبەخشی. چەند جاریش بەمرو مۆچی لەگەڵ زرتەبۆزەکەی بەرانبەری دەئاخاوت، «ئاناسرگیفنا»یەکی وەیاد دەهێنامەوە لە گلێنەکانی‌دا خەست بۆتەوەو بنی ناوەتەوە.° بە تەماشاکردنێکەوە چاوی هەڵدەبری زۆر واتاو لێکدانەوەی وخۆشم کردە «گۆرۆف».. (سەرجەمی گەوهەری بنیادەم بریتیە لەهەستی برسیەتی‌و سەرماو بەدناویی‌و زیان وترسی هاملێتانە لەمردن، هەمو ژیانیش لەم هەستانەدایە). هەرکە دووای دەساڵ دەربەدەری وەکو نامۆیەك بۆ شارەکەم گەرامەوە،

دایکم پیاما هەڵشاخا «ها سەرەڕۆ لەکوێ بووی؟.. خۆت دادەنێی..»

- نەخێر.. سەرەڕۆ نیم.. سەعلووکم...

دایکم واتــای (ســەعلووکی) نەدەزانی بۆیــە بەتــوورەییــەوە بەرپەرچی دامەوە:

- نەخێر... خوێریت..

- بەدووای دەرمانی تەنیایەوە وێڵم..

- دەبــڕۆ کچــە قەرەجێــك هەڵخــرێنــە وئــەوەش دەرمــان و ببــڕێتــەوە... نەیــدەزانی ئەوەشم بەیــاســاغی تاقیکــردوتــەوە، لەگــەرمــەی ئامێــزی دەیــان مێــنەدا تەنیــایــەکــەم بەرانبــەرم دەستەویەخە دەوەستا وهەرەشەی لێدەکردم، تۆڵستۆی واتەنی، ژووری نووستن گەورەترین مەرگەساتە.. ئێستاش نە ژن و نە دۆستم هەیــەو نەدەزگیــران.. یان گوزەرانێکی پڕ ڕۆتین، بە هەزار بگرەوبەردە ماوەی فەرمانە بێ پەرواکەم لە دەزگاکە بەسەر دەبــەم. یان بە یەك دوو درۆ دایــکــم فریــو دەدەم و، بەرەو (خەراباتێك) لێژ دەبمەوە، لەوێش ڕا دووای خوێندنەوەی کتێبێ دەمەتەقییکی پڕ سەریەشە گەرم دەبێ. زۆربەی دەمەتەقێی ئەو شەوانــە، بە قســەکــەی «س»کپ دەبێ.. سەبــارەت بەخــۆر بابــەتــێــکــی خوێــنــدبــوّوەو، هەمــوو شەوێ لەو شــەوانــە هەردەیــوتــەوە. گوایــە دووای ئەوەنــدە ملیۆن ساڵەی کە خۆر تیشك بەزەوی دەدات لێیدەپرسن: ئایا تیشکی بەزەوی داوە، ئەویش وەرام دەداتــەوە: وا بزانم ئەستێــرەیــەکی وا هەیــە کە تیشکم پێی دابێ... پێشخزمەتەکە قاپە شیرە شێرەکەو کاسە بەفرە خواییەکەی بۆ هێنابووم، قاپەکە گەیشتبووە نیوەی، بەڵام ساردوسڕی سەرمــکــە کۆڵی بە بەنجی مەیــەکەدا بوون، تینی گەرمیــەك تەوێڵی ·ʼــووکــە دەدام، تەبڵەکی جگــەرەکــەش خەریــك بوو،ە ۃ ؛ جگــەرە دارمــاڵ دەبــوو.. ئەمجــارەیان هەرکــە چاوم هەڵبــڕیو نیگــام هەواڵەی ڕێگاکەی دەرەوە کرد، نەمــزانی پاڵتــۆ ڕەشێــك لەکــوێــوە وەکو پیرە هەڵۆیەك لە نووکی ڕێگاکە نیشتەوە، تا خۆی کردە ژوورەوەی ئاوێنە بەندەکانەوە چاوم لێی نەتروکاند، پاڵتۆیەکی ڕەش تا خوار ئەژنۆوەی لەبەر بوو، میلوانــەکــەی نیــوەی چەنــاگــەی گرتبــوّوە، چاویلکەیەکی خڕی لەچاو بوو، لەژێر شووشەکانیەوە چاوە خوڵە مێشیەکانی تروسکــەیــەکیِ سەیــریــان تێزابــوو، تروسکەیەك هیچ واتایەك نەگــەیــەنێ، تەنهــا ئومێــدبــڕوای نەبێ، چوارچێــوە خڕەکــەی چاویلکەکە بڕۆ تەنکەکانی دانەپۆشیبوو. ردێنێکی چەناگەیی - سەکــســووکــە - ماش و برنــج بــوو، کتێبێکی گەورە، یا چاکتر وایــە بڵێین دەفتــەرێکی قەبــارە گەورەی نابــووە بن هەنگڵی، تا بەجێشم هێشت بۆم دەرنــەکــەوت چ نهێنیــەکی لەگــەڵ خۆیــا هەڵگرتووە، بەبێ خوڵق کردن کورسیەکی لای مێزەکەی منەوە ڕاکێشــاو، لەلای چەپمــەوە ڕۆنیشت.. دیســان پێشخــزمەتەکە وەکــو ئەو ڕەفتــارەی لەگــەڵ منــا کردی بەهــەمان ڕەفتار لەویش نزیك بۆوە:

- فەرموو..؟

بێئەوەی سەر هەڵبڕێ:

- قاپێ شیری شێرو کاسەیەك بەفری خوایی..

- بەڵێ.. مەزە..؟

هەربەو دۆخەی پێشووی وەرامی دایەوە:

- پێی ناوێ، تاڵی تاڵی دەبڕێ...

پێشخزمەتەکە بۆ ئەویش هەمان زەردەی تەوەساوی هاتێ.. چاوێکی ترم بریــە «ئــانــاســرگیفنــا»کەی بەرانبەرم. ئەمجارەیان چاوەکــانی «خــەجــە»یــان وەبیــرهێنامەوە، ئەو ئافرەتە کە بەحەز لێکردنیەوە دەقم گرتووە، لە هەرزەکاریەوە دەیان خەونی پێوە دەبینم، خەجەش بە زۆرە ملێ بەکابرایەکی شێت و شۆریان بە شوودابوو، ئەنجامیش هەر لەگەڵ لووسکەیەك هەڵات و من و کابرا شێتەکەشی هەناسە سارد هێشتەوە.. کابرا پاڵتۆ ڕەشەکە بە جمگەی ناوەڕاستی قامکە درێژو زراڤەکانی دەستەچەپەی، تەق وتۆقێکی بە ئاوازو هەندەك جاریش نەشازی هەڵدەستان، دەتــووت لاســایی هــنــدیــە سوورەکــان دەکــاتەوە، وەکو دەنگی کوودیــەکی ناوەکــوڵ کراوی ووشکەوە بوو، درنگەی دەهات. چاوم تێبڕی بزەیەکی سەیر، بزەیەك لەنێوان بێئومێدی ودڵ بە دنیا خۆشی لەڕووخســاریدا دەخنایەوە، یان بزەیەك بوو لەنێوان خەم و تەوەســەوە ڕادەچــەنی.. جاروبــاریش نەرمــە کۆکــەیەك دەکۆکی، دیاربوو لەڕووی نەدەهات بە کامی دڵەوە بکۆکێ، بۆیە (شمسی) ماسوولکەکانی سەروچاوی هەڵدەزەپان، خوێن ڕووبــەری ڕووخســـاری دەتــەنی، ئاگــام لێبــوو جارێکیــان دەسەسڕێکی دەرێناو، دەم وپلی پێسڕیەوە، هەرکە ویستی بە پەلــە بێئــاخــنێتــە گیــرفــانیــەوە، خوێنێکی گەش چمکێ دەســەســڕەکــەی سوور کردبــوو، هەست بەکوڵدان بەرانبەرم لە چاوانی ڕادەدرەوشایەوە، بۆیە بە کزیەکەوە دەستێکی هێنا بەسەر

ئەو کتێبە گەورەیەی لەبەردەمی دانابوو، نەختێ چاویلکەکەی هەڵبڕی، بە دەنگێکی کەرخەوە وتی:

- دوو ساڵم لە نەخۆشخانەی - توێشە - بەسەر بردوە..

سەرێکی کەمتەرخەمیم بۆ لەقاندو بۆشم ڕوون بۆوە. گەر چی لەبەرم گران بوو ئاوها دانی پیا بنێ، وەکو دان بە تاوانێکی گەورەدا بنێ کە کردویەتی وابوو...

- دووای ئەوەی لە - سەخالین - کە قووتار بووم، ئەنجا بەرەو سەخالینی نەخۆشخانەی توێشە..

- هەموو لە سەخالین لە دایك بووین، ئەنجامیش لە سەخالین دەمرین..

کابرا پاڵتۆ ڕەشەکە وتی:

- تەنیا یی بە تەواوەتی تۆی ڕووخاندوە..

- چۆن دەزانی هەست بە تەنیایی دەکەم..؟

- هەموو نەخۆشییەك هەر زوو لە سەروچاوی مرۆڤ دا دیار دەکەوێ..

- مامۆستای..؟

کابرا پاڵتۆ ڕەشەکە وتی:

- نەخێر. کۆلێجی یاسام تەواوکردوە..

- ئێستا..؟

- بەرەڵام.. سەعلووك..

- بەڵام.. سەعلووك کەسانی کە لە مێردو یاخی ورەوشت بەرزو سوارچاکن..؟!

- بەڵێ... ڕاستە (بەبزەیەکی تەوەساویەوە ئەمەی وت)..

- کەواتە کوا ئەسپەکەت؟

- لەو ڕیزە کێوەی بەرانبەرت هەڵدێراو هەپرون بەهەپرون بوو (دەستی بۆ ڕیزە کێوەکەی بەرانبەر خانووە سپیەکە درێژکرد)..

بەتەواوی سەرگەرم ببوو و لەبەر خۆیەوە دەیووت، بەڵکو ئەوەی لە دەمی دەهاتە دەرەوە دەگەیشتە گوێم: بۆم ڕوون بۆوە ڕۆشنبیرێکی ئاسایی نییە بگرە لە دەم ودووی دیاربوو زۆریش دەخوێنێتەوە، ئەو قسانەی کە بە چاکی گوێم لێبوو وتی:-

- کازانتزاکی دەڵێ.. دەبێ بەسەر دیوارەکان بڕوخێنین، ئەگەریش چەندان سەر دادەڕزێ بەڵام سەرەنجام دیوارەکان هەرەس دێنن.. چاوم بڕیبووە «ئانا سرگیفنا»کەی بەرانبەر، کابرا پاڵتۆ ڕەشەکە دیسانەوە کۆکەکۆکی پێکەوت، خوێن سەروچاوی لەژێر پێستەکەوە سوور کرد، سەرلەنوێ دەسەسرەکەی دەرهێناو دەم وپلی سڕییەوە.. بەدەم ولەوسێکی پەڵتەوە لێم پرسی:

- دوا قۆناغت کوێیە..؟

- دوو سێ ڕۆژ دەبێ لە نەخۆشخانەکە ئیزنیان داوم، دەسا خانێك، یان خەراباتێك دەکەمە هێلانەو هەوار، یان گڵکۆ..

هەر ئەوەندە خۆم پێگیرا، یان بەتەواوەتی بێئارامی لەشی دەرزیاژن دەکردم، هەڵسام، بەنیگایەکی نهێنیەوە ماڵئاوایم لە «ئانا سر گیفنا»کە کرد، بێئەوەی ماڵئاوایی لەکابرا پاڵتۆ ڕەشەکە بکەم، ئەویش قاپەشیرە شێرەکەی فت کردبوو، بزەیەکی سەرە مەرگانە لە چاوانیڕا دەدرەوشایەوە. بەلەتردان لەدەرگای خانووە سپیەکە ئاوەدیو بووم، لە دەرەوە کزەبایە سڕەکەی دەربەنەکە بەربەرەکانی بەنجی مەیەکەی بۆ نەدەکرا، بۆیە بێپەروا بوو..

هەرکە گەیشتمە سەرجادەکەو نەگەیشتم، ئاوڕێکم بەرەو خانووە سپیەکە دایەوە، کابرا پاڵتۆ ڕەشەکە بەدەم سەماکردنەوە لە ناوەڕاستی خانووە سپیەکە، دەستێکی ماڵئاوایی بۆ هەڵتەکاندم، منیش بزەیەکی بێتام گرتمیو بە کاوەخۆوە بە دەستی چەپە بۆم سەندەوە، هەتا چاوم لێی لاکەل بوو سەمایەکی نەشازی دەکردو دەستی بۆ هەڵتەکاندم، هەر لەوساتە وەکو دڵم خورپەیەکی تێکەوتبێ، هەستم کرد سەمای سەرەمەرگە، دەڵێن بنیادەم هەرکە لەسەرە مەرگا بێ لەسەر نوێن دا لەقەفرتێ دەکا، ئەم سەرە مەرگەکەیشی لەگەڵ خەڵکی تر جیاوازبوو. دووا قسەی وەکو زەنگی کڵێسایەك لەمیحرابی مێشکما دەزرینگایەوە (دەبێ دیوارەکان بەسەر بڕووخێنین، دیوارەکان بەسەر بڕووخێنین...)..

وەکو دەست هەڵتەکاندنەکەی ئەو، [illegible]ستم لە ئۆتۆمبیلێك هەڵتەکاند تا بەرەو ئەو شارەی کە پاش [illegible] دەربەدەری وەکو تامۆیەك بۆی هاتمەوە، بمباتەوە...

* * *

کەرکوك/ سەرەتای ١٩٨٨

«*»: وتەیەکی چیخۆفە لە چیرۆکی «ژووری ژمارە ٦»ی‌دا هاتووە..



# کۆترە سپی‌یەکە..

عەبدوڵڵا ئاگرین

سلەیمانی نەورۆزی ١٩٨٥

توولە ڕێگایەکی بەردەلانی؛ لە بنارەوە تا گەردنی چیا قووچەکە پێچاو پێچ لوولی خواردوە، بە دەگمەن و مەبەستی قەدبڕی نەبوایە؛کەس پیایا گوزەری نە ئەکرد. ڕێچکەی ئەمجارەیان شەپۆلی شپرزەی کۆمەڵێ ـ ژن و منداڵ ـ پیر و گەنجی ـ گوندی بنارەو بە هەڵەداوان ڕووەو هەورازە کوورەکە کشان ، لەم ساتەدا تەزووی ترس تێکەڵ بە دەریای خەم ئەبێ.
هێلانەی دەروونی ـ سمایل ـ گەشکە ئەیگرێ‌و لانەی داهاتێکی پڕ کامەرانی بۆ پێك ئەهێنا.
لەگەڵ خەڵکی ئاواییدا بەدەم ڕۆیشتنەوە بۆخۆی ئەدوا:
ـ بەس نی‌یە ـ گۆنا ـ مان لە تەکدایە!
«ئەو »هەرگیز دەرفە ی لەباری ئەوتۆی وای بۆ نەڕەخساوە، بە بەرچاوی مام ئەو مانی باوکی‌و میمکە مەنیجەی دایکی‌یەوە شریتی تەمەنی سالەی ڕابوردویان‌بهێنێتەوە یاد.
ـ سمایل ـ کوڕی ئاقانەی خێزانەکەیانە، دایکی دوای سێ کیژۆڵە «نازدار، نازەنین، ناسك»ی‌پێ شادبووە.. ناسۆر پاش سێ‌مانگە؛ باوکی دوای هەرەسی بەفرە زۆرەکەی ساڵی گرانی‌یەکە کۆچی کردو بە هۆی سەختی‌و نسرمی شوێنەکەوە تا تەری بەهارو پەیدا بوونی نێرگز تەرمەکەیان نەدۆزی یەوە؛ ئەندێشەی ئەو ڕووداوە تا سێ مانگی ڕەبەق پشکۆی ئاگری بە جەرگا ئەچزانن ـ سمایل ـ کوڕێکی گەنم ڕەنگی باڵا هەڵچووە، تەمەنی بیست وپێنج ساڵ ئەبێ. حەز ئەکا دەست بەخۆیدا بهێنێ، هەر بۆیە پۆشتەو پەرداخ نەبینرێ...بەڵام تا بڵێی لە قسەو گۆدا شەرمن و هێمنە، لەگەڵ خێزانەکەیدا لە باوەشی گوندە دڵ فرێنەکەی بناردا ژیانی لەگەڵ پاراستنی داربەڕوو و بەخێوکردنی«کاراسك» بەسەر ئەبرد.. بەژیانی سەخت ڕانەهاتبوو.. ئەت وت:ـ دوگلە بەسەری شارە!.
«ئەو»تا ئەهات گوڵ خولیای گۆشکردنی «کارمامز» هەراسانی بە کاسەی سەری هەڵئەگرت.. تەنیا بەو مەبەستەی لە شالاوی دڕندەی ئادەمزاد بیان پارێزێ، دەنا بەو نیازە نەبوو، تۆوی ترس بە دەروونیانا بوەشێنێ‌و ئازاریان پێ‌بگەیێنێ..خۆ بۆ گیرفان گەرم کردنەوەش نەبوو..! ـ سمایل ـ پێ بە پێی ڕەوتی کۆچ و باری لە ناوەختی خەڵکەکە بە هێوری هەنگاوی ئەنا...ساتەوەختێکی سەیر خرکە بەردێك لەژێر سمی جوانوە شێ‌دا دەرچوو، ڕووەو خوار سەری خۆی هەڵگرت و پەردەی بێ دەنگی خەڵکەکەی دڕان.. «ئەو» بەدەم نیگای تێروانینی خل بوونەوەی خرکە بەردەکەوە ئاورێکی بەلای گوندەکەیانا دایەوەو کە بە پێوانەی هێلی ئاسۆیی هێند لێی دوو نەکەوتبوونەوە، بەڵام بە هێلی ستوونی نیوەی هێڵە ئاسۆیی یەکە لێی بەرز بیوونەوە!.
چوزەرەی عەشقێکی ئەرخەوانی چەخماخەی یادێکی پیرۆزی بەبیردا تێپەڕان:
ـ لە بەرە بەیانی تەمەنی ساوایمەوە شەیدای بووم.
دیمەنی تابلۆی ئەو ڕۆژانەی لەتەك ـ گۆنا ـ دا پێکەوە بەرخیان

ئەلـەوەران؛ هەرگیـز لە مێشکیـا نە ئەسڕایەوە، ڕازە خۆشەکەی دەروونی لە پاڵ گەورەبوونی ئەمەنیا؛ مەزن و و مەزنتر ئەبوو:
« ژیانم بۆیە ئەوێ «گۆنا»ی تیا ببینم».
ئەوسا لەبەرخۆیەوە ئەدوا:
- تۆبڵێی شتێ هەبێ لە عەشقی «گۆنا»گەورەتر؟
هەر خۆی وەڵامی خۆی ئەدایەوە:
- نەخێر.. بروا ناکەم!!.
کات ئێوارەیەو زەردەپەڕ تارایەکی خەنەیی بەسەر چیاکەدا داوە. زەردەپەڕ لای - سمایل - پیرۆزەو دیمەنی «گۆنای»بیرئەخانەوە ... سات، شوێن، ڕووداو بەتیژیو خێرایی بەرگی ئاڵ و واڵا ئەگۆڕێ!.
- سمایل - هەر لەتەك خەڵکەکەدا ڕووەو هەورزا مل ئەنێ. نایەوێ بەبست لە « گۆنا »دوور کەوێتەوە.. «گۆنا»کیژۆڵەیەکی تازە هەڵـچـووە، خونـچـەی تەمـەنی بیسـت بەهـارە.. شووشـەیی‌یـەکی ناوقـەد باریکـە، دوو چاوی گەشی ڕەشی قەرانیی.. لووتـێـکـی کوڵ و دەمێکی خونچـەیی جوان، قژە خەنەیی‌کەی لەتەوقی سەری‌یەوە بە شان و ملیا تا کەمەری شۆڕ بوٚتەوە، لەژێر کەوا تەنکەکەیەوە پشتێنێکی چیتی گوڵ گوڵی مور بە یەك قەد لە کەمەری ئاڵاندوە. سرکەیی‌یەك بە گەردنیا هاتۆتە خوارێ. لـەگـەڵ لەرانـەوەی‌مەمکی.. چمکی سرکەیی‌کە بێ باکانە ماچی سنگ و بەرۆکی ئەکات.
ئای لەو دیمەنە تەلیسماوی‌یە کە تەمی خەم وئازاری دەروونی کون کون کراوی - سمـایـل - ئەرەوێنێتـەوە. خەڵکـەکـە هەر ڕ ووەو هەوراز ڕەو ئەکـەن؛ کوڵ و باریـان.. کوڵـوانـەو توێشـوویـەکی سووك‌وهەرزانـە!؟ - سمایل - جارێك بە چەند هەنگـاو پێشیـان ئەکـەوت و دەمێـك لە دواوە و تاوێـك لە تەك «گۆنا» دایە.
پەڵـە هەورێکی چڵکن وەك مێـردەزمـە بەسـەریـانەوەیە، بارانی ترس ئەبـارێنێو لە گەرویـەکی تاڵـەوە بە چاوبـرکێ هەڕەشـەی خۆی ئەکات.
تاك و تەرا نەبێ، ئاوایی‌یەکەیان جێ هێشتووەو هەر بۆ هەوراز مل ئەنێن و بە تووڵە ڕێگاکەدا سەر ئەکەون بەری لای چەپی چەمێکی قوڵ و بێشەیەکی چڕەو بەناخی زەویدا داچووە.. لای ڕاستی قەدپاڵی ئەو چیایەیە کە پیایا هەڵئەگەڕێن.. گەڵاو لق و پۆپی دار بەڕووەکـانی لای قەدپـاڵـەکە ساباتێکی تێکچراوی بە درێـژای تولـە ڕێگـاکـە هەڵداوەو دیمەنی جووتە باڵی کۆترێکی ئەنوان کە لەبنیا بەچکەکانی حەشار دابێ.

لە هەندێ شوێنی تولە ڕێگاکە ڕەگ و ڕیشەی چەند ساڵەی دار بەڕووەکـان ئەبینـرا کە پلووسکی بەفـراوی چیـاکـە لە بەهـارا بووەدری کردبوو.
- سمـایـل - لەگـەڵ خەڵکی ئاواییـدا بە هێـوری ملی ئەنا.لەپڕ سەرێـکـی هەڵبـڕی خۆیو «گـۆنـا»ی لە ناوقـەدی هەورازە کوورەکـە دا بینی. ئـاورێکی بۆ دواوە دایـەوە.. گونـدەکـەی خۆیـانی لە تەختی یەکی نزمـا بینی.. وەرچـەرخـا گونـدەکەی ئەوبەری دۆڵەکە سەرنجی بەلای خۆیدا ڕاکێشا.. ئەو گوندە ملوانکـەیـەکی مرواری یەو بە گەردنی چیـاکـەی بەرامبـەریـا هەڵواسراوە.. دڵی بۆ حاڵ و باریان سووتا.
خەڵکـەکـە تا بە چیـاکـەدا سەرئەکەوتن دنیایەکی کپ و بێ‌وەی باوەشی ئارامی پیـا ئەکـردن. ناوچـەم و بێشـەکـەش تافـەتـافی پلووسکی ئاوی دەم سینـەی کون کون کراوی چیـاکـە پرچی زیوینی تاڵگەیەکی خوڕی ئەنوان - سمایل - هەنگاوەکانی خاو ئەبـووەوە، خۆشی نەی ئەزانی ئەمـەیـان لەپـای چی. نـا ئەوە دووریـانی سنگی بێ‌گـرتن. هەڵـوێستـەیەك لە بەردەمیانا قوت بووەوە... چەپکێ تیشکی زەردەخەنەی«گۆنا»ناخی سمایلی تەنی .. «ئـەو»گـەشکـەیەك گرتی. ئەوبێنێکی بەتام تەمەنی ڕابوردوی ژیانەوە.. گوڕی بە داهاتی‌دا.. لەبەرخۆیەوە:
- ساتەکەی نەهاتە!
خوڕ تەبەقەیەکی بازنگەیی ئاڵتوونی‌یە . . بی باکەو بەهێوری ورد ورد لەوبـەری کەلـەوە خوی . . . . . . خوێنین ئەکـا..
زەردە پەرەکەی لە گەردن و لوتکەی ئەمبەر ئە .
لەم لاشـەوە ڕەوتی نەرمی جوانـووەشێ ئاوازی مۆسیقـایـەکی غەمگینی بە گوێدا ئەچرپان و بارانی سۆزی . . . . - سمایلدا
- بە خوڕ ئەباران:
- لەم بە سزمانا نە جیا نابمەوە...

کەمێك بێ دەنگ بوو:
- چی لەم دایکە پیرەو سێ خوشکەم بکەم؟.
لە بەر خۆیەوە کەمێك دەنگی بڵند کردەوە:
- ئەی گۆنا؟.. ئای «گۆنا»گیان!.
- گۆناو دایك و باوکیشی هەر لە پەنایەکی نزیك خۆمانەوە ئەبن!.
- نایکەم بە ساڵان.. ئەم بەهارە دەست نیشان و گواستنەوەی دەم یەك ئەخەم.
مەلی شادی - سمـایـل - لە شەقـەی باڵی‌داو، بێ ئاگـاو بە

دەنگێکی نزمەوە ڕووی لەدایك و نازداری خوشکە گەورەی کرد:

- گوندی ناوچەمان فرسەخە ڕێگایەك دوورە، زوو پێی ئەگەین.

ئەمیش لە نێوانیانا چەقی بوو، کۆمەڵێ بیروڕا گێژنەی ئەدا..!

هۆشی شەکەت وبیری ماندو کردوە.

تا لەم ساتەدا ڕووداوەکان بەچاوی ئاسایی ئەبینرا، لەناکاو لای شانی ڕاستی‌یەوە خرکە بەردێك هارەی کرد. گوێی بیرە مەنگەکەی سمایلی شڵەقان، سەری بەرز کردەوە، تیشکی چرای چاوەکانی ئاراستە کرد.. هەڵوێستەیەکی وریای پێ‌کرد، ناخی هەژا: «قەت هێندە خۆم ترسنۆك نەبینیوە».

موچرکێك لە تەپڵەسەریەی‌وە هات و لە کەڵە مشتی پێی‌یەوە فرکەی کرد.

..چی‌تری ببینێ؟...لە نێوان تاشەبەر دێکی لا پاڵی بەرزایی‌یەکی هەزار بە هەزارەوە، هێلانەیەك لەپەڕو پووش و گەڵا لە لایەن دوو کۆتری سپی‌نەخشین و دەنووك کورتی سوورەوە دروست کرابوو، ئەو شوێنە بێ باڵ نەی ئەگەیشتێ، مەگەر فرتەی ڕێوی‌و دەمی ڕەشی گورگەبۆر نەبێ!.. بەچکە گورگێکی بەدی کرد، لەسەرشان و بە چنگەکرێ ڕوو لە هێلانەکە ئەکا.. گورگە کەمێکی مابوو دووبارە بخزێ‌و بکەوێتە خوارێ و هەپروون بە هەپروون بێ.

بەر لەوەی گورگە ئامبازی هێلانەبێ دوو کۆترەکە بەجووت باڵیان بەیەکدا داو فرکەیان بۆکرد.. فرین.. بەرز فرین دوور کەوتنەوە، بەڵام لەچاو ون نەبوون سمایل چاوی لێیان بوو بەسەر تاوێرێکی کەلەکەی بەرامبەریانەوە نیشتنەوە، چاوەڕێ‌چارە نوو ی بەچکەو لانەکەیان ئەکرد.

گورگە لەرە خە ڕکردەوە گوری دایەخۆی، چنگ و نینۆکی دەستی چەپی‌گەیـ ـدنێ، شاڵاوی بۆ دوو بەچکەی لەش گۆشتنی بێ پەڕو باڵی کۆترەکان برد، لانەکەیانی تێك و پێکدا، یەکێ لە بەچکەکانی لە چنگ کەوتە خوارێ‌و شڵپە شڵپ بەر تاشەبەردەکان کەوت، دووەمیانی بە پەل و دەم جنی.. دیمەنی تراژیدای دەم و چنگی خوێناوی گورگە تێکەڵ بە سەمای پەڕو پوشی هێلانە تێکدراوەکە ئەبوو.

- سمایل - هەروا تاس ئەیبردەوە، بە کەساسی پەوە سەرێکی‌بادا، نیگای ئەو دیمەنەی تێکەڵ بە کۆستی خەڵکەکە کرد تاوێرێکی بۆ بنارەکەی بەردەمی دایەوە، سەیرێکی گوندەکەی ئەوبەر چەم و بێشەکە کرد.. سەرە خولێ گێژەنگی‌دا، خەریك بوو بە چۆکدا بێ، هەناسەیەکی سارد سێیەکانی گوشی، سەری بڵند کردەوە و لانەی کۆترە سپی‌یەکانی بە سەرکردەوە. هێشتا پوش و پەڕو گەڵای هێلانەکە لە ئاسمانا سەمایان ئەکردو بە هێوری دەنك دەنك نم بارانی کردن.. «ئەو»تاس بەریدا، هۆشی هاتەوە لای خۆی دیسان بیری کردەوە.. دیمەنەکانی ڕابوردو بەیەکا ئەچوون. شەپۆلی خەڵکی ئاوایی لەو دووریانەدا بەسەر یەکا مۆڵیان خوارد بوو..

نیگای عەشقێکی پیرۆز داهاتی هەر دوو خێزانی «گۆنا»و «خۆیان»ی یاد خستەوە، بیری لە هەر دوو جەمسەری دووریانەکە ئالا، یەکیان ڕووی لە دۆڵ و بێشەکە ئەکردو ڕاست و ڕەوان ملی بۆ ناوجەرگەی گوندی حاجی‌یاوا ئەنا. ئەو گوندەی - سمایل - بڕیاری دابوو، قۆناغی یەکەمی حەوانەوەیان بێ ڕیانی دوایان ڕێك بەلا پاڵی هەورازە کورەکەدا سەرئەکەوت.

- سمایل - لە ناخا سڵەمی‌یەوە، خەمەکانی ڕابوردو دەروونی هەڵتەکان، هەناسەیەکی گراوی پڕ بە ناخی سی‌یەکانی هەڵمژی. دیمەنی گورگە دەم ڕەشە، تەرە بوونی کۆترە سپی‌یەکان، تێکچوونی لانەکەیان؛ هەراسانیان بە ئارام و حەوانەوەی هەڵگرتبوو. تا ئەوە کرمی ترس و ڕاڕایی لە دەروونیا نەهێشت.. دوابڕیاری دا دوای چارەنووسی کۆترەکان کەوێت ڕووی لە دایك و نازداری خۆشکی و «گۆنا»کرد:

- ئێوە بەرەو گوندی حاجی‌یاوا برۆن.. سبەی لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا لاتانم.

خەڵکی ئاوایی تاك و تەرا نەبێ شوێنیان کەوتن دایکی وخوشکەکانی سمایل لە قوڵایی ناخا وەك مەنجەنیق ئەکوڵان..

دایکی سمایل لەژێر لێوەوە وتی:

- خوا دەست بە باڵتەوە بگرێ.

«گۆنا»ش تیشکی نیگای تێکەڵ بە شەرمێکی ناسك کرد، زەردە خەنەیەکی بۆ هەڵدا.. - سمایل - گەشکە گرتی لە خۆشیانا پێی زەوی نە ئەگرت.. هەر بەو ئێوارە درە نگە وەختە بە هەورازە کورەکەدا هەڵزنا.. تەمی ترسێکی خۆڵە مێشی ئەرەوانەوە.. هەر تاوە تا تاوێ ئاوڕێکی بەلای «گۆنا»دا ئەدایەوە.. بەچاو تێگەیاندەوە:

- سبەینێ‌یەکی زوو لەگەڵ دەرکەوتنی گزنگی خۆر بەدیدارتان شاد ئەبمەوە.

■ چیرۆك ■

# تەیرێ مرنێ

مێژو: ١٣/١٠/١٩٨٧ .

دەم ژمێر: هەشت کێم پێنج .

جهـ : خاندنگەهەکا بەغدا

مختار فائق

هندی بێژی رۆژەکا خۆش و گەش بۆ.. هندی بێژی سپێدە هیەکا دل ڤەکەربو.. هەمی کاروبارێت ژیانێ دسروشتی بون لپایتەختا عیراقی.. بەغدا رەنگین.. هەر کەسەك یێ مژویلە و دڤێت زوی بگەهیتە سەر کارێ خۆ.. ل سپێدەهیا رۆژا ١٣/١٠/١٩٨٧ قوتابی و زاروان خۆ پەیت کربون داکو زوی بگەهنە خاندنگەها خۆ.. هندەك ژی ژوان گەهشتبون و ل مەیدانکا خاندنگەهێ بخۆ یاریك دکرن لڤانا زەنگلا دەرسێ بون.. دڤیان زوی زەنگلا دەرسێ لێبدەت داکو زوی بچنە دژورڤەو فێربن.. بەلێ.. فێری ئەلف بێتکا بین.. فێری زانینێ بین.. فێری سروودا بین.. داکو سروورا بوەلاتی بێژن.. سروودا بیابا صدامی بێژن.. بڤیانێ بێژن..

لێ مخابن.. تەیرێ مرنێ یێ بلەزتر بۆ.. زەنگلا کەرب و کینا ئیرانی بلەزتربو.. لسەعەت هەشت کێم پێنج دەقیقە تەیرێ مرنێ هات.. بلەز هات... لجهەکێ دگەرا دا بارێ خۆ یێ داگرتی بکەرب وکینا دل رەشێت ئیرانێ ڤالاکەتە سەر.. لێ ئەڤ بارە.. چ بار بۆ..؟! بارەکێ ڤالا ژ زەررەتەکا خوشتیڤی و دلسوژیێ و ئەڤینیێ..

ساروخا ئیرانی هات ئێکسەر بۆ قوتابخانا (بلاط الشهداء) فێرگەها زاروان.. وارگەهێ علم وزانینێ کینا خۆ دارێت.. بەلێ دارێتە سەر کێ..؟!

سەر هژمارەکا کولیلکێت بەهەشتێ.. سەر هندە بشکوژێت شۆرەشێ یێتکو ژخوشتڤیێ و دلسوژیێ ودلپاکیێ پێڤەتر چیدی نزانن.. کتێبێت وان پەرتاندن.. جانتێت وان تەرابەرا کرن و دخوینێدا گەڤزاندن.. مێزەو کورسیێت و... بێ خودان مان.

خوینا وان زاروان لسەر دیوارێت خاندنگەهێ هاتە نەخشاندن و قەت ناهێتە ژبیرکرن.. ئالایێ عیراقی لحەوشا خاندنگەهێ هەر بەرزو بلند ما.. ودێ هەر مینیت..

بەلێ تەیرێ مرنێ.. تەیرێ کەرب و کینێ نامینیت و دێ هەر هێتە سەرژێ کرن بێ (بسم الله)..

خوینا وان بشکوژان ژی هەر هۆ ناچیت و ئاڤاهیێ خاندنگەها (بلاط الشهداء) سەرژنوی هاتە درست کرن لدوی بریارا سەمیانێ هەمی هێتیم و ژاران.. هەمی بشکوژ و زاروان.. صدام حسین خودێ بهێلیت.

■ چیرۆك ■

# خۆرکەوتن

محمد فریق حسن

## بیرەوەری ئەم چیرۆکە لە فۆلکلۆرەوە وەرگیراوە

ئەگەر بەنیازی شار لە ماڵەکانی گڵەزەردە داگەڕای. بەلای باخـە هەنـاریکی گەورەدا ڕەت دەبی کە ڕیـك لە گەرووی دەربـەنـدەکـەدا ڕوواوە. . ئیتر دەبێ دەستە ڕاست بگری. . ڕێگەکە بواری سەڵتەزەلام یان تاکەسوار دەدات و لەوەدەچێ بە نوێڵ و پیك لەو چیا پەردینە تاشرابێ. . ئەم ڕێگا تەشویتاشە، کە خۆیان پلان - ی پێدەڵێن، تا ڕێبوار نەداتەدەست بنارو لە سەراوردەوە نەیکات بە ماڵەکانی ئالیاوادا لە چیاکە جیانابێتەوەو پلەپلە‌یدا دێتەخوارەوە. . بەدەستە چەپیشا، دوای ئەوەی باخە هەنـارەکـە کۆتـایی دێ، دەبێتـە خەرەنـدێکی سامنـاك. . ئەم دەربەندە پەردەی ... ووی بووکی گڵەزەردە لاداوە. . بەهارو هاوین سینەی ... وەك بەیاخەکانی سەر شێخ حەسەن و دایەخاسی. .

بەهـاران دەبێتـە هەزار کانیـان و لەبن هەر تاوێـرێکـەوە پلوسکێ ئاو لەوچیا بەردینە هەڵدەقوڵێ و ڕووەو باوەشی دەربەند سـەری خۆیـان هەڵـدەگـرن و پەلـەیانە هەرچی زووتر بگەنە دیداری تانجەرۆ. .

گڵەزەردە، بەتارای سپی بەفرێوە. . بەباخی هەنارێوە. . بە گوێژی گڤنەسەرو کۆرپە دەوەنەکانێوە، تازە بووکێکە، لە دوورەوە دووگمەی سینەی بۆ دەست و پەنجەی بزێوی کوڕی سلێمانی ترازاندووە.

هەر لەماڵەکان داگەڕای ئیتر تەق تەقە. . بەردی لووس و سواوو زەقە. . بەفر چاڵ وچۆڵی نێوانیانی بنکەشی کردووە.

جوامێر، کەوتۆتە پێش ماینەکوێت و شل شل جڵەوی گرتووە. جاران لە هەردوو بەری دەربـەنـدەکـەوە گوێی لە دەنگـدانەوەی ناڵەکانێوە دەبوو، کەچی ئەمڕۆ کەمتر هەستی پێدەکات.

ئەگـەرچی سەرکـەوتن بە پلانی گڵەزەردەدا ڕێبوار پڕووکێنە. . بەڵام دابەزین زۆر ناخایێنێ. ئەوەندە هەیە دەبێ ئاگاداری بەرپێی خۆی بێ نەبـادا بترازێ. . ڕۆژگاری وەها مەترسی‌ی خلیسکان و هەڵـدێـرانیش لە وڵاخ دەکـرێ. . لەو شوێنـەدا کە بۆ یەکـەم پلە شۆڕدەبێتەوەو سەربانی بە باگردێن و دووکەڵی ماڵەکانی ئالیاوات لێ ئاشکرا دەبێ، ئەگەر ئاورێك بدەیتەوە، پایەی ئەستوور ئەستووری وەك مەرمەڕ هەڵچوو دەبینی‌و دەم ودەسـت موچوڕکێکی سارد بەلەشتا تێـدەپـەڕێ!. . ئەم پایـانە کێلە سەهۆڵن، هیچ کارخانەیەك قاڵبی وەهـای بۆدەرنـایـە. . وەك پەیکـەری سـەربـە قوتـابخـانە نوێکانی هەڵکـۆڵـین، شێوەی جیا جیایان لێنەخشاوە!. ئەمانە لە ئاوەڕۆی ئاوایی دروست دەبن، کاتێ بۆ دەربەندو خەرەندەکە شۆڕدەبێتەوە. . بە شەوبـای چلە دەیـەستێ‌و دەنیشێتـە سەریـەك. . سەرەتا شیشە سەهـۆڵی باریکن وەك چلوورەی گوێـسـوانـان. . تازسـتـان بچێتـە پێشـەوە، ئاویان زیاتر دەچێتە سەرو ئەستوورتر دەبن. . کەزستان پیربوو، هێزو هەرەکەتی لێبڕا. . زەویش گەرمی‌ی تێگەڕا، ئەوجا

لەســەرو بنەوە تاشە سەهۆڵی زەبەلاح لەزەوی جودادەبنەوەو دەترازێن. . رووەو خەرەند هەرەس دێنن، تل دەخۆن و پارچەیان لێدەبێتەوە. . کە دەگەنە ئاستی ئاڵیاوا بەتەواوی وردوخاش و پەراش پەراش دەبن. . وەك دانەی تەرزەیان لێدێ! . ئەو ڕۆژەی سەهۆڵەکە دەشکێ لە گڵەزەردە یەکەم ڕۆژی بەهارە.

جوامێر، گەیشتە دواپلەی گڵەزەردە. . لێرەدا ڕێگاکە کەمێك پان دەبێو وردە وردە لەگەڵ زەوی تەخت دەبێ. . لغاوی هە ڵدایە سەر قەڵپووزی زینەکەو پێی لەسەر ئاوزەنگی دانا. .

لە ناوەڕاستی پاییزەوە تا دەگاتە بەهار. . گەلێ جاران تەمێکی چڕ لە بناری شارەزوورەوە بە بالآی دامازەڵەو گڵەزەردەدا هەڵدەزنێ ئەم تەمەچڕە لە ناوقەدی چیاوە تالوتکە دادەپۆشێ. . ڕێدەکەوی بۆ چەند ڕۆژێك بەری ڕوانین لەو گوندانە بگرێ ئەمجا بڕەوێتەوە. خۆ ئەگەر ڕۆژێکی ڕوون بوو ئەوا سلێمانی لەبەردەمی گڵەزەردەدا ڕاکشاوە. .

هەموو بەیانی‌یەك تەمێك، شینی کاڵ، تێکەڵ بە دووکەڵ، تەنك وەك برنجۆك لەسەر سلێمانی کەپرۆکە دەبەستێ. . ئەم تەمە شینە مەگەر لە شوێنە ڕوانگەو بەرزەکانەوە ئەگینا خەڵکی سلێمانی خۆشیان هەستی پێناکەن! . . ئەم تەمە شین باوە تا خۆری چێشتەنگاوی بەرنەکەوێ پەرت نابێ. . ڕەنگە ئاهو هەناسەی خەڵکی بێو نەگاتە تەختی پەروەردگار، بۆیە بۆ سبەینێ بەیانی هەمدیس بەرزدەبێتەوە. .

لە ئاڵیاوا ڕەت بوو. . ئاڵیاوا وەك ژێرماڵەی گڵەزەردە بێ، کزکز لەژێر باڵیا دەواری هەڵداوە. . خەرەندی گڵەزەردەو کۆڕپە دەوەنەکانی کە هەرگیز نابن بەدار ئاڵیاوایان لە ئامێز گرتووە.

لە ئاڵیاواوە ڕاست ڕووەو تانجەرۆ شۆڕبۆوە. ئەم زەوی‌یە نێرگزەجاڕەو بەهاران بە هەزاران چاو بەقەدو بالآی دارمازەڵەو شەپۆلانی تانجەرۆدا دەڕوانێ.

«ناچمەوە بۆ ڕێی داراغا. . تانجەرۆ زۆریش هاتبێ هێشتا لە ماینە کوێت ناترسم. . قەدبڕ نزیکترە. .» ئەمە ی لەبەر خۆیەوە وت. . لغاوی ماڵی بەلاملی ماینەکوێت داو دەستی شل کرد. . یەکدوو پاژنەیشی لە تەنگەی‌دا. . ماینە کوێت لە خواستی خاوەنەکەی گەیشت. . هەڵیدایە غارو بەسمەکانی زەوی‌ی چاڵ دەکرد. . هەستی‌کرد بەفرەکەی پادەشت وەك هی قەدپاڵی دارمازەڵە نی‌یە. . لەبنەوە ڕوو لە توانەوەیە. . ئەگەرچی لە گڵەزەردە سروەی با نایەت، بەڵام تاکو لە سلێمانی نزیك بێتەوە زیاتر هەست بەکزەی باکە دەکەی. بەتایبەت کاتێ دەیدات لەگوێو لووت و دەستی جڵەوەکە. .

جوامێر، لە لێواری تانجەرۆ نزیك بۆوە. بەفری لێوار مابۆوە توێژاڵێکی تەنك. . چاکی کەواکەی کۆکردەوەو کردی بەژێر پشتوێنەکەیدا. . دەرپێ سپی‌یەکەی تا کڵاوەی ئەژنۆ هەڵکرد. .

خۆی لەسەر زینەکە قیت کردەوەو لاقەکانی هەڵنان. . . دەنگی لە ماینە کوێت کرد. . ماینە کوێت چەند جارێ دەستەکانی خستەناو ئاوەکەوەو گەڕایەوە. . پرمەپرمێکی لێوە دەهات و سەری ڕادەوەشاند. . تانجەرۆی لێل بەخوڕەو شەپۆلەکانیوە وەك مرۆڤێکی ڕووگرژ دەردەکەوت. .

کەمتر سوار لەو جێ‌یەوە لەتانجەرۆ بدات. . بەڵام جوامێر یەکەم جارە شێخ بیکاتە قاسیدی خۆی. . بۆیە نەیکرد لە ئاستی داراغاوە، لە بوارەوە بپەڕێتەوە. . ویستی قەدبڕ بگاتە شار.

ئاوە ساردو لێڵەکە دەیدا لەدەستی ماینەکوێت و پاشەوپاش دەگەڕایەوە. . لمۆزی هەڵدەبڕی‌و کلکی دەکردەوە بەناو گەڵیا. . ڕووی لە ئاسمان دەکردو دەیپڕماند. . جوامێر پاژنەی لە تەنگەی توندکردو دەنگی لێکرد. . ڕووی بۆ تانجەرۆ وەرگێڕایەوە.

لە ئاوەکەدا، هەستی بەتورتی ماسولکەکانی تەنگەو مل و کەفەڵێ دەکرد. . دوای‌چەند هەنگاوێك ڕاهات. . ماین هەرکە ئاو ژێرشکی تەڕکرد ئیتر بەلایەوە دەبێتە کارێکی ئاسایی‌و سامی دەشکێ. . ملی‌کردبوو بەرم. . پەلی دەکوتا. . لووتی دەکرایەوە لەگەڵ شڵپ و هوڕو شەپۆلانی ئاوەکەشدا هێشتا هەرگوێت لە پرمەو هەناسە بڕکێی دەبوو. . کلکیشی وەك مار بەسەر ئاوەکەوە مەلەی دەکرد. . شڵپ و هوڕی ماینەکوێت لە تانجەرۆدا ڕەزم و ترپەی تایبەتی خۆی هەبوو. . پرژەی ئاو دەگەڕایەوەو ڕووی جوامێری ئاوپرژێن دەکرد. سەری بۆ ئاسۆ بەرزکردەوە. چەن پەڵەهەورێکی وێڵ هێشتا بە ئاسمانەوە بوون. بەڵام دوای تاوێکی دی کەس نازانێ ڕەشەبا بۆ کوێ‌یان دەفڕێنێ‌و چۆنیان دەپێچێتەوە. . کە سەرنجی لە ڕۆژئاوا دا. لەبەرخۆیەوە وتی: «هەر ئەحمەد بەگ لە شار بێ ئیتر کاری من زوو مەیسەر دەبێ. . هێشتا خۆر بەرزە. . ڕەنگە شێو بەرمەوە گڵەزەردە. . بەڵکو شیعری نوێشی هەبێ. . شیعرەکانی ئەحمەد بەگ دەکرێتەوە. .»

لە تاوی غاردا وای بەدڵدا هات فەقیانە ... بیتە چەپی کە دەستی جڵەوەکەیە توندبکات و هی‌دەستە ڕاستی ... بەربداتەوە. . لەگەڵ تاوی غاردا ماینە کوێت وەك کامێرایەکی سینەما بێ لەسەرخۆ شاری سلێمانی‌ی دەهێنایە پێشەوە. . دووکەڵی زۆپا لە ماڵەکانی قەرەتۆغانەوە سەری دەکرد، کڵافەی دووکەڵ هەر لە لوولەی زۆپا دەترازا با ـ کە ڕووەو تانجەرۆ دەیفڕاند. . دوای چەند گوریسێك پەرش و بڵاودەبۆوە. .

وڵاخی بەرزە هەواو فیز بەسوار دەدات. . وەك ئەو بوغرایی‌یەی هەڵگرتنی چەك و لە خۆدانی ڕەزنە فیشەك دەیدات بەمرۆڤی جەنگاوەر. . هەندێ جاران خەیالآتی لەو جۆرە بەسوار دەبەخشێ کەمەی بۆ مەستی دێنێ. . سوار، بەتایبەت لەتاوی غاردا هەست

بەگەورەیی و جۆرە بایی‌بوونێك دەكات كە پێشتر لە كەللەی نەداوە. .
جوامێر یەكسەلەف رووەو سلێمانی دەیكوتا. .

لە هێكـرا كۆمـەڵێ چادری خاكی وەك قارچـك لەبـەردەمیا هەڵتـۆقـین. . سڵەمی‌یـەوە. . بەڵام مایـنەكـوێت یەكبین ملی دەناو لەوەدەچوو ئەودەقەی گرتوویەتی تاخۆی بە شاردا نەكات نەیگۆڕێ. ڕێگاكەیش ڕێك بەبەردەم سەربازگەكەدا ڕەت دەبوو. .

دوو سەربـاز بەڕاكـردن هاتنـە چەقی ڕێگـەو ڕاست و چەپیان لێ‌گرت و ڕووی تفەنگیان تێكرد! . جڵەوی مایـنەكوێتی بۆلای خۆی هێنـاو لەبـەردەمیـانا وەك مێخ چەقی. . سەبارزەكان تێیان گەیاند كەدەبێ دابەزێ. . بەرەوڕوو بوونەوەی ئەم سەربازگەیە وەك كارێكی كوتوپڕ جوامێری تووشی نیگەرانی كردو لە دنیایەكەوە گواستیەوە بۆ دنیایەكی دیكە. .

سەربازێكیان بە جوولەی تفەنگە نێزەدارەكەی كە بەقەدەر خۆی درێـژبـوو خێـوەی بۆ دەروازەی خێـوە تگـاكە كردو ئەوی دیكەیان جڵەوی مایـنەكـەی لێگـرت و بەلایـەكی دیكـەدا بردی. بەدەم سڵەمینـەوەو شاخ كردنـەوە حیلەیەكی كردو بەناچاری دوای كابرای سەرباز كەوت.

* * *

- پشكنیـان! . . هیچی وەهـای پێنـەبـوو جێی گومـان بێ. . !
سەربـازەكـە هەر ئەمەندەی وت كاتێ كردی بەژووری ئەفسـەرداو دوای سڵاوێـك شوێنـەكـەی جێهێشت. . كابـرای ئەفسـەر ڕاست بۆوە. . خوودەیەكی خاكی. . كۆمەڵێ نیشانەی سەوزو سوور سەرسینگی نەخشـانـدبـوو. . قایشی بە بریق وباق لەسەر كەمەرو سینگ و شانەكانی بە شێوەیەكی تەرازوو لەنگەریان گرتبوو. . موو زەرد. . سوورو سپی، ڕەنگ منـاڵ. . چاوە شینـەكانی وەك هی پشیلەی ناو تاریكەشەو دەبریسكانەوە. . ڕەنگی لە كچە بەگزادەیەك دەچوو تاكو پیاو. . پا[illegible]تەكەی لەسەر مێزەكەی بەردەمی هەڵگرت و بۆ جوامێری درێژكرد[illegible]
- فەرموو جگەرەی ئینگلیزی. . !

جوامـێر، بێئەوەی هیچ بڵێ، دوو سێ جار دەستی بە سینگی خۆی‌داداو كابـرای ئەفسـەریش لێی ڕامـابـوو. . وەك بیـەوێ لە ڕەنگ و ڕوخسـاری‌یەوە شتێك بخوێنێتەوە. . لەسەر كورسی‌یەكەی دانیشت و جگـەرەیـەكی ئاگـردا. . جوامـێر فەقیـانەكەی بەستەوە، كەواكـەی جووت كرد. . پشتـوێنـەكـەی تونـدكـردەوەو دەستی بە سەلتـەكـەیدا هێنا. . هەرچۆنێك بوو خۆی بۆ پرس و چاووڕاوی كابرای ئەفسەر كۆكردەوە. . ئەفسـەرەكە مژێ دووكەڵی بەباداو پرسی:
- ناو؟
- جوامێری حەمە صالح.
- تەمەن؟
- بیست و چوار.
- لە كوێوە؟
- لە گڵەزەردەوە.
- بۆ كوێ؟
- سلێمانی.
- كاروپیشەت؟
- دارفرۆش.
- یان ئاغا؟!
- گڵەزەردە ئاغای نی‌یە!
- ئەی مایـنەكەت؟
- لەكۆنەوە وڵاخی بەرزە ڕادەگرین.
- یان هی شێخە؟!
- نەء هی خۆمە.
- ژنت هێناوە؟
- بەڵێ.
- چەند مناڵت هەیە؟
- هیچ.
- هەرچـەنـدە جێگـەی نیشـەكـدان و قایش و قووروش بەكـەواو سەڵتەكەتەوە دیارنی‌یە. . بەڵام بە چەتەی شێخت تێدەگەم؟!
- نەء، دار برم.
- ئادەی ناولەپت؟
- ئەوە ناولەپم فەرموو.
- ڕاستە داربڕی. . كورد كەمتر درۆدەكەن!
- وایە.
- كەواتە ڕاستیم پێبڵێ. . تەنیا ڕاستی ڕزگارت دەكات؟.
- ڕاستیم پێوتی.
- بۆ وابەپەلە بۆشار؟
- شەكرو چاو تفاقمان هاتۆتە كزی. . دەچم كەل وپەل بكرم.
- دەزانم گشتی چەتەكانی خولە خواردیان؟!
- نانا. .؟ شێخ مەحموود. . شێخ مەحموودی شێخ سەعید!
- ئاوا. .؟ خۆشت دەوێ، وانی‌یە؟!
- لای خەڵكی زاتێكی گەورەیە!
- ئێمـەی ئینگلیـز، مافی خۆشـەویـستی‌و ڕێـزگـرتن لەكەس زەوت ناكەین. . بیرم كەوتەوە. . تۆ خوێندەواری؟
- بەڵێ.

لەسـەرو سیمـای ڕامایەوە، دوای قەدەرێ بێدەنگی لەپڕ دەستی بەپرس كردەوە:

- کێ دەڵێ کاتبی شێخ نیت؟!
- نەخێر.. پێشتر سەیری دەستت کردم!
- بەڵام گومانت لێدەکەم!
- لە چ ڕوویەکەوە؟
- کەسێ ڕێزی شێخ مەحموود بگرێ، ئەوا ئامادەیشە چی پێوت بەقسەی بکات. بۆ نموونە ئەگەر داوای لێکردی تفەنگی بۆ هەڵگری ئەوا بەدەنگێوە دەچی؟!
- بەڵام من تفەنگم هەڵنەگرتووە.
- بۆ؟
- چونکە پێویستی بەمن نییەو تفەنگچی زۆری لەگەڵە.
- ئاوا..؟ کەوابــوو ئەگــەر پێـویـستی پێت بوو ئەوا چەکی بۆ هەڵدەگری. تەقەیش لە بەریتانیای کەورە دەکەی!. ئەوەش بزانە ئالای بەریتانیا بەسەر سێچارەکی گۆی زەوییەوە دەشەکێتەوە. بەم زووانە لەسەر لوتکەکانی سەگرمەیش هەڵدەکرێ.
- ڕێم بدە بڕۆم.. من بابایەکی ڕێبوارو ڕەوتەنیم.
- دەزانم زۆرت پەلەیە! بەپێی هەواڵی گەیشتوو شێخ لەناوچەی قەرەداغە.. کێ دەڵێ قاسیدی ئەونیت..؟ چی ڕاسپاردووی پێم بڵێ.. ڕزگاری لەڕاستگۆییدایە.
- هیچم نییە بیڵێم..

کابرای ئەفسەر پێڵەقەیەکی لە زەوی دا.. جغارەکەی لە تەپڵەکی سەرمێزەکەدا ساردکردەوە. پەنجەی بۆ دریژ کرد، وەختەبوو بچێ بەچاویـا. چاوەکـانیشی زەق کرابوونەوە، نیشانەی تووڕەبوونێکی بێئەندازەیان پێوە دیاربوو.. تا چەن هەناسەیەك لەو دەقەدا وەستاو ئەمجا نەڕاندی:
- تۆ درۆزنی!
-جوامێر بە بێزارییەوە سەری داخست.. لێوی خۆی کرۆشت.. ئەمجا بەکزییەوە وتی:- بەڵام چیتان لێپرسیم وەڵامم دانەوە.

ئەفسەرەکە لەگوماندا بوو. دەستێکی بەزەنگی سەر مێزەکەدا دا. پاسـەوانێك خۆی بە ژووردا کردو سڵاوێکی سەربازی داکوتا.. کابرای ئەفسەر بە گوێیدا چپاندو جوامێری بەرەوڕوو کردەوە..

* * *

- بۆ کوێم دەبەی؟!
- ...
- ئازادم دەکەن؟!
- ....

بەگـومـانـەوە چاوی دەگـێڕا.. «بەڵام بۆناو کەمپەکەم دەبات.» ئەمەی لەبەر خۆیەوە گوت و بەناچاری پێشی کەوت.
- کورد ئازان.. ئەوە دەتـرسی شێرەکـوڕ؟! ئێستـا خۆت لەبەردەم تاقیکردنەوەیەکی نوێدا دەبینی!
- تاقیکردنەوەی چۆن؟
- پەلـەت نەبێ.. کاری بەپـەلـە پەشیمانی بەدوای خۆیدا دێنێ.. ئاهەهـ.. ئێرە باشە!

جوامـێر سەرنجی دەدا چوار کەنـاری تاقیبکـاتـەوە.. سەیری هەڵس وکەوتی سەربازەکەی دەکردو لەبەرخۆیەوە دەدوا: «تۆ بڵێی تیرەبارانم کەن؟!. جاچیم کردووە هەتا تیرەبارانم کەن؟! خۆ هیچی خراپیشم نەوت! بەڵام ئینگلیزن هەموو شتێکیان لێ دەوەشێتەوە!.. نازانم!» لەم کاتەدا کە جوامێر سێو دووی دڵی خۆی دەکرد، واشە چۆن جووجەڵـە دەفـرێنێ، کابرای سەرباز ئاوها پری بە کڵاوو مشکیـیـەکـەیـدا کرد. لەسـەری دامـاڵی و یەك دوو هەنگـاو لێی دوورکەوتەوە!. بە دەنگێکی گڕەوە پێی وت:
- ئامادەبە سەڵتەکەت داکەنە!

جوامێر دەستی بۆ سەرە ڕووت و قووتەکەی بردو لەگەڵیا هەستی بە بێکەسی کرد.
- بۆچی دایکەنم؟

تفەنگەکەی لەسەردڵی نزیك کردەوەو تێیخوڕی:
- پرسیـار قەدەغـەیـە.. ئەمانە فەرمانن.. من جێبەجێ کردنیانم لەسەرە.. پشتوێن.. زۆر چاکە.. کەواکەشت!.. تەنیا دەرپێو کەوشەکانت لەبەردا دەهێڵمەوە.
- من بێتاوانم.. نەختێ غیرەتت بێ، چاوت لێنییە بەفر لەسەر زەوی کەوتـووەو ڕەشـەبـا دەلـوورێنێ؟!.. ئای ئەوە کەلەبچەشم دەکەی؟!.. خۆ ویژدانی نییە!..
- بێدەنـگە.. بۆڵـە بۆڵ مەکە.. من سەربازم.. لە پێشا ئەرکی سەرشان ئەمجا مەسەلەی ویژدان دێتە پێشـەوە!.
- کاکە گیان سڵاوی خوات لێبێ!
- سڵاوی خوا لەتۆیش بێ.
- ڕحمەت لەباوکت.. دەمەوێ تێم گەیێنی  لێم دەوێ و نیازی چیتان پێم هەیە؟
- ماوتە. دەبێ کەلەبچەت بکەم و بەم زنجیرەش ببەستمەوە!

* * *

«بڕوانە.. پاڵتۆیەکی ئەستوور.. دەسکێش.. کڵێتەشی لەسەر ناوە. لەگـەڵ ئەوەشـدا کرژبـووەو دانەچوقێیەتی!.» جوامێر، ئەم قسـانـەی لەبـەرخـۆیەوە دەکردو مەبەستی لەو سەربازە بوو کە لە بەرامبەرییەوە خۆی خزاندبووە قووخێکی لەوحەوە، کە تایبەت بۆ ئێشکگرتن و پاسەوانی دروست کرابوو.

تا چاو برکات ئاسمان هەوری پێوە نەبوو.. گفەی (با) نەبێ کە لەگـوێـژەوە هەڵدەکـرد دەنگێکی دیکـە نەدەهات.. ئەوەندە نەبێ

جاروبار تەنەکەو تەختەی دەدا بەسەریەکاو تەق وهوری لێ هەڵدەساندن

سەرنجی خۆی دا.. سینگێکی تووکرج. کوڵــەی سینگی لە چاڵیداو مەمکەکانی ئاشکرا.. ناوقەدی باریك و بە قووڵاچوو.. پەراسووەکانی زەق. سەرشانەکانی خڕو توند. ماسولکەکانی بەوشی باڵی ئەستوورو دامەزراوو تورت.. باسکی توندو تۆڵ و مەچەکی ئەستوور.. پەنجەکانی خڕو ناولەپی زبرو تۆکمە.. ئەمە هەڵکەوتنی لەشی هەموو داربڕێکە.. لەکاتی تەورو تەوراس هەڵسووڕاندن و باربارکردنا خۆشەدەبێ‌و دەرسکێ.

لەکارێکی بەرەوخوار، ئاوداماں، دەرپێیەکی خامی دەیلەو بۆر تاکو گوزینگ و رەنەڵەی قاچی داپۆشیوە. گۆرەویی بەن دەستچنی کچە دەسرەنگینێکی شار.. بە سەلیقەی خۆی بە نەخشی رەنگاورەنگ رازاندوویەتیوە.. پێکانی لەناو کەوشدا، ئەویش دەسکاری سلێمانی.

دانەویەوە. دەرەلینگەکانی نەختێ بۆ خوارتر داخستن، بایەهەڵدان و کردنی بە گۆرەوییەکان دا.. قیت بۆوە. بەنەخوێنەکەی ترازاندو توندتری کرد.. رانەکانی نووساندن بەیەکەوە.. بەڵام پشت و سینگی شپرزەی کردبوو.. سەرنجی بۆ دوور رەوانەکرد، هەرچەندە خۆر ئاوابوو بەڵام بەری گڵەزەردە بەباشی دەبینرا.. چیاکە خاڵ خاڵ بوو.. بە لای رۆژهەڵاتیشدا وەرچەرخا.. گوێزە دوگردی سپی بەسەرخۆیدا دابوو. جێ نەجێ هەندێ لاپاڵ پارن بیوون... دەشت و گردۆڵکەکانی دەورو بەریشی وەکو لۆکەیان لەسەر هەلاجی کرابێ.. کۆمەڵێ چادر بەدەوریا هەڵیانداوە.. چەند هەنگاوێکیش لە سەراوردی خۆیەوە پاسەوانەکە بە تفەنگێکەوە یەك بەقەد باڵای خۆی لەشوێنی تایبەتی پاسەوانی راوەستاوە.. وەکو هەر لەوێدا لە دایك بووبێ. لە دەلاقەکانیوە بە هەموو لایەکدا دەروانێ‌و بەردەمیشی ئاوەڵایە..

جوامێر تووکی... سینگی راست دەبوونەوە. پێستی بیووە تنجکەی وردو رەنگی ... هەڵگەرابوو.. لەوەدەچوو تاپۆکەی بێتەوە یەك و جێی ئێسك و پروسکی تیانەبێتەوە.. لەوەدایە لووت و گوێی سڕ بین و هەست بەبوونیان نەکات.. سەری پەنجەکانیشی وەك خوێنیان نەگاتێ وەهابوو.. پەنجەکانی دەنووقاندن و دەیکردنەوە.. بەچەپ هی راست و بەراست هی چەپی دەگوشی.. نەیدەزانی چۆن بەرەورووی ئەم شەوە کفن پۆشە ببێتەوە.؟! دەستێکی بەتەوقی سەرو روویدا هێنا.. رەگەکانی ملی لەوەدایە رەق بین.. هەڵدەلەرزی‌و دانەچوقەی بوو.. لەبەر خۆیەوە وتی:

«سەرما، یان لەپێوە یان لەسەرەوە کاری خۆی دەکات!.. پێکانم بەلایان لێ نییە. بەڵام سەرم لەوەدایە بتەزێ.» پێچێکی تەواوی کردەوەو بەرەورووی پاسەوانەکە بۆوە گوێی لە دەنگی بەفرەکە بوو کاتێ لەژێر کەوشەکانیدا دەپەستراییەوە.. بەزمانێك تێکەڵ لە بێزاری‌و لالاندنەوە پرسی:

- پێم بڵێ.. بۆ وام لێ دەکەن؟. نیازی چیتان بە من هەیە.؟
- دانی پێدا بنێ کەتفەنگچی شێخی.. یان ئێلچی ئەوی؟!
- ئەی ئەگەر دانم پێدا نەنا؟.. یان ئەگەر هیچ کامیان نەبووم؟
- بەڵام ئینگلیز بەهەڵەدا ناچێ. ئەگەر دانیشت پێدا نەنا ئەوا تابەیانی ئێرە جێت دەبێ.. تاخۆر هەڵدێ!
- تا خۆر هەڵدێ؟ جاخۆ سەعاتێکی دیکە نابات رەق دەبمەوە.!
- جار بە جەهەنەم!. جا رەق بوونەوەی تۆ، چ زیانێك بە بەریتانیای گەورە دەگەیێنێ؟
- بەڵام وەها مامەڵە لەگەڵ مرۆڤ دا ناکرێ!
- بۆ؟.. خوانەخواستە زڵلەیەکیان لێداوی؟ قسەیەکی کاڵیان پێوتووی؟.. مەسەلەکەیش تەنیا پەیوەندیی بەخۆتەوە هەیە، تەنیا خۆت.
- چۆن تەنیا پەیوەندیی بە خۆمەوە هەیە؟!.. من واخەریکە رەق دەبمەوە. سەرماکە کاری لە مێشکم کردووە ناهێڵێ بەباشی بیربکەمەوە!
- ئاسانە.. چیت لەژێر سەردایە بیدرکێنە.. وەك جەنابی ئەفسەر فەرمووی - راستگۆیی رێگای رزگارییە.
- ئەی ئەگەر هیچم لەژێر سەردا نەبوو؟
- ئەوا سبەینێ ئازادی..
- بەڵام ناگاتە سبەینێ رەق دەبمەوە.. نابینی بەفر دەشت و دەری داپۆشیوە؟.. نابیستی رەشەبا بەسەریا هەڵیکردووە؟. ئەگەر ئاوها بەرووتی بمێنمەوە یەك سەعاتی دیکە نابات کەسیرە دەکەوم و دەبم بە پەلاس! رەق دەبم!! بۆ تێم ناگەی؟!
- بەڵام ئینگلیز سیاسەت مەدارەو بەهەڵە کەس رەق ناکاتەوە.. ئینگلیز هەڵەشە نییە.. باکی لەرەشەباو بەفر نییە.
- دەباشە جل وبەرگەکەم بدەوە باخۆم پۆشتەکەمەوە.. تۆ سەیری خۆت کردووە چەندت لەبەردایە؟!
- لەسەری مەرێ، یان رەق بوونەوە یاخود دان پیانان.

* * *

پاسەوانی دووەم هێشتا چاوی بە خەوەوە بوو، کە گەیشتە شوێنی ئێشك گرتن.. چەند جارێك تفەنگەکەی لە شانییەوە گوێزایەوە بۆ ئاستی لووتی‌و دیسانەوە بۆ سەرشان.. چەند هەنگاوێ بە رۆیشتنی سەربازی بە بەردەم شوێنەکەدا هاتوچوو.. ئەم مەشقەی لەبەر ئەوەبوو تاکو بە تەواوی وریابێتەوە.. لەپڕ رووی بۆلای جوامێر وەرچەرخاندو وشك وەستا.

- ئێوارەت باش.. ئەمشەو میوانێکی ئازیزمان هەیە!.
- ئابەخوا چاك ڕێزی میوان دەگرن!
- کەس هێندەی ئێمە ڕێزی میوانی لانییە!!
- جا چیماوە لەگەڵم بکەن؟. ڕێزگرتن هەروەها دەبێ!.
- تۆ هەڵەی برادەر!.. مەبەستم لە ئێمە میللەتی قوبروسە.. دورگەی ڤینۆس.. کە گەرمامەوە، بە خاووخێزانەوە سەرمان لێبدە. جا ئەوسا بەخشندەیی و میوان پەروەری خەڵکی قوبروستان بۆ ئاشکرا دەبێ.. وەرە ماڵی برا بچووکت.. لە خزمەتام.
- بەڵام ئەمشەو ڕەق دەبمەوە.. فەرموو ئێستا بەخشندەیی خۆت بنوێنە.. ئەو پاڵتۆیەی خۆتم بدەرێ.. یاخو بەتانییەك، هەر سیپالێك دەتوانی بۆمی پەیداکە.
- کێشەکە لێرەدایە کە لێك ناگەین!. تۆ ئێستا میوانی من نیت.. تۆ میوانی بەریتانیای گەورەی.. بەڵام لەسەر خاکی خۆت!
- زانییان بەریتانیای گەورە چەند ڕێزی میوانی لایە!.. بەڵام تەنیا تۆ شك دەبەم لێرە.. ئەوەتا بەدیار چاوتەوە ڕەق دەبمەوە!
- نانا.. تۆ کوڕی ناو بەفری.. تۆ کوێستانیت!
- ئەوە تانەم لێدەدەی؟.. قەیناکا بەردی خۆت بوەشێنە.. ئەوەی باڵادەست بێدەنگی دلێرە!

«تۆ کوڕی ناو بەفری.. تۆ کوێستانیت.» ئەم قسانەی لەبیری خۆیدا هێناو برد.. هاتەوە هۆش خۆی.. «ڕاستەکات من کوڕی ناو بەفرم.. سەرنجی گڵەزەردە بدە.. شێخ حەسەن و دایەخاسێ کەیلی بەفرن.. بروانە بەوزان.. کڵاوگورگە.. تابەهار بەفریان ناچێتەوە.. کەچی منیش لەرزم لێهاتووە.. باڵندەی ناو بەفر لەهەمەموو باڵندەیەك توندو تۆڵترن.. ڕاستەکات منیش مرۆڤی ناوبەفرم کە زۆر لەهی بیابان گورج و گۆڵترە.. ئەمانە گەرەکیانە بەپشتوێنەکەی خۆم هەڵمواسن.. هەرچۆنێ بێت پێویست بە کرووزانەوە ناکات..»

بیری گڵەزەردەی کەوتەوە.. ڕووی تێکرد.. لێی وردبوەوە. وردبوونەوەیەك تێکەڵ بە خەیاڵ.. لەکەلەشێنەوە بۆ دارەبەنە گەورەکەی پشت ئاوایی.. تاشە بەردە زەبەللاحەکەی کە لەوەتی بیری کردۆتەوە بەتەمایە هائێستا هاتاوێکی دی بەسەر دێدا هەرەس بێنێ، کەچی نوکە دەرزییەك لەجێی خۆی نەجووڵاوە.. داربەرووەکانی سەر شێخ حەسەن کە تائێستاش بەروو لەژێر گەڵا وەریوەکانیاندا کەوتووە.. ڕۆیشتنی سەر گەڵای وەریوی داربەروو.. لق وپۆپی قرچۆکی دارەکان.. کە لەهەرکەسێ دەپرسی نازانێ تەمەنیان چەندە. بازبازێنی سمۆرە لەم لقەوە بۆ ئەولق.. مزگەوت و کۆڵەکە بە تەپڵەکەکانی.. کۆکەرەشە.. قورئانە ڕەشەکە.. ڕێگای پێچاو پێچی کانی.. لەبەر خۆیەوە کەوتە مرتاندن:

«لەوە دەچێ ئەمشەو گڵەزەردە لەشار نزیك بووبێتەوە.. ئەو لوکسەی لای خوارووی ماڵی خۆمانە.. ئێستا ئاگری دار بەڕوو نێلەنێل دەسووتێ.. وای بۆدەچم - نەخشین - بە ئاگایێ و چاوەروانم بێ.. چاوێکی لای پلانە ها ئێستا ها تاوێکی دی سەرکەومەوە.. پلان پەیژەیەکی ئەفسووناوییە بنی لە ئالیاواو سەری ئەوەتا لە گڵەزەردە.. جارجارە لقەداریکیش دەکات بە زۆپاکەدا.. ئێستا وەك دەنووکی کەو سووربۆتەوە.. لێرەوە هەستی پێدەکەم.. لێفە دووکەسییەکەی واڵاکردۆتەوە.. سەرینێکی گەورەی پەڕیش. ڕەنگە شانی دادابێتە سەرو لە خەیاڵەوە چووبێ.. دەزانم هێشتا شێوی نەکردووە گوێی لە حەپەی سەگێ.. یان هەردەنگێ بێ هێمنی شەو بشڵەقێنێ، ئەو ڕادەپەڕێ و دەرگاکە دەقلیشێنێتەوە، بەمنی دەزانێ.. لەوێ ورنگە نایەت و ڕەشەبا بری ئەوێ ناکات.. وا نیوەشەوەو ئەو بەهیوایە پێکەوە شێو بکەین.. ئەی ئەو ڕووناکییەی لای سەراورد؟ ئەوەیان ئاگری شێخی گەورەیە!. دیارە هێشتا بێدارە.. دوێنێ کە لەگەڵ دەستەیەك سواردا لەکۆکەرەشەوە خۆیان کرد بە ئاواییدا، ئەوی لەدێدا بوو بەرەو پیریان چوو.. (شێخ عەورەزا) پەلاماری دا دەستی ماچ کات، کەچی شێخ دەستی کێشایەوەو پێی وت:
- نەء ڕەزا.. دەبێ من دەستی تۆماچ کەم.. چونکە تۆ کاسبی بەودەستانە دەکەی. دەستەکانی تۆ پیرۆزن!.
هەست بە گەرمی دەکەم کاتێ لەنزیك شێخەوە بم.. کە دەچمە خزمەتی وادەزانم هەزاران براو ئامۆزام لەدەورن.. یەکییەکی ئەوان هەندێ شەو تابەیانی لوکسیان دەگرێ.. ئەو ڕووناکییە ناکوژێتەوە.. واخەریکە سینگ و باڵ و ڕووم تینی گەرمییان دەگاتێ..»

جوامێر، دەستی بە ڕۆیشتن کرد. تا ئەوەندەی زنجیرەکەی بربکات ڕووەو گڵەزەردە دەچوو.. زرەی زنجیر تێکەڵ بە گفەی ڕەشەبا دەبوو.. لە چوونا سینگ و ڕووی گەرم دەبوەوە. لەگەڕانەوەشدا پشتی گەرم ڕادەهات.. و[illegible]بیری ڕەق بوونەوە لە کەللەی باریکرد.. زیاتر دەجووڵا، دەچووە چیچکان، هەڵدەسایەوە، نۆرەی بەلاقەکانی دەکرد.. دەستەکانی لێك دەخشاندن. تاوێ بەری دەستی، تاوێ پشتی دەستیو خەیاڵ دەیبردەوە ئاوایی:

«ئێستا کۆڕی شێخ گەرمە. کوروکاڵ و دەم سپیی ئەو دەڤەرە لەدەوری کۆبوونەتەوە.. ڕەنگە باسی بەرەوڕوو بوونەوەی نوێترین ڕووداویان بۆ بکات.. قۆرییێ چا لەناو کەڵەپشکۆی سووردا دەکوڵێ.. هەڵدەچێ و سەرقاپ بەکوڵەوە دەگرێ.. هەڵی کتری سەردەکات و ژوورەکە گەرم ڕاهاتووە.. تەك دەدەنە دواوەو پشت بە

دیوارەوە دەدەن.. ئەلقەی دەوری زۆپاکە گەورەتر دەبێ.. کەلێنێ دەخەنە دەرگاکە.. زۆپاکەیش خەفە دەکەن.. ئەوجا ڕیزێ چا تێ‌دەکەن و دەست بە قسەوباس دەکەنەوە.. دووکەڵی زۆپایش بە بەرزایی پیرە بەوزەکانی چەمی بەوزان بە ئلسماندا دەچێ.. تۆ بڵێی شێخ چاوەڕوانم بێ؟.. ئەو زۆر پەرۆش بوو ئەمشەو وەڵامی جەنابی حەمدی - ی پێ‌بگات.»

* * *

شەوگار درەنگی کرد. ئەم هیچ چاوی لە گۆڕینی پاسەوانەکانەوە نەبوو. لە چوونـدا هەردوو تروسکاییەکە بەرەوڕووی دەبوونەوە. تروسکایی خواروو، هی نەخشین.. نەخشینی تازەبووك.. گری خۆشەویستیی خاوێن.. دڵسۆزیو بەتەنگەوە هاتنی ژیانی هاوسەری.. لای سەراورد ئاگرێکی مەزنتر.. لەوانەیە کوانووی سەردەوەبووی چی بێ‌لانەوبانەی وڵاتی بەفرو بەرروو هەیە، هەموویی گەرم بکاتەوە.. ببێتە تاوڵێکی گەورەی کوێستانیو سوارەی ڕۆژهەڵات لە سایەیدا کۆببنەوە.. گەڕی شایی، دنیای ڕازاوەی دەبینی.. کە زەینی دەدایە لای کەوانە.. بەچاوی خەیاڵ، دەیهێنایە پێش.. ئاگرێکی هەڵایساوی بە تێلە نێی دەبینی.. ئەم لەودیوو نەخشین لەودیوەوە.. زمانەی گڕیش بەقەدەر باڵایان هەڵدەکشا.. لەنێوان زمانەی گڕەوە چاویان لێك نەدەترووکان و ئارەزووی یەکیان دەکرد. وەك عەزرەتی ڕووی یەکیان دەبینی ئاڵ، وێنەی ئەو مانگەی هەندێ جاران لەودیو گوێزەوە، لەژێر پەردەی تەنکی هەورەوە سەرهەڵدێنێ.. هەرچەندیان دەکۆشا دەستیان نەدەگەیشتە یەك و ئومێد براویش نەدەبوون.. لەنێوان ئەو دوو ئاگرەدا گفەی ڕەشەبای سلێمانی کاتێ بەسەر بەفردا هەڵدەکات نەیدەتوانی پشتی لە زەوی بدات. کە ڕووەو گلەزەردە دەچوو هەردوو دەستی بۆ درێژ دەکردو پەنجەکانی شاش ڕادەگرتن، وەك کەسێکی سەرمابردە لەو لەچلەی زستاندا بەدیار ئاگرێکەوە هەڵتروشکابێ‌و بیەوێ زۆرترین تینی گەرمیی لێ‌وەرگرێ.. جوامێر لە گەڕانەوەداو لەپڕ وەك جامێ بەفراویان بەناوشان... ردبێ، موچوڕکێکی سارد بە پشتیا هات و کرژبوو. لەجێی خۆی ڕوەستاو لە رزی لێ‌هات.. دوای قەدەرێك، هەرچەنێك بوو ئاوڕی لە گلەزەردە دایەوە.. ئاگری لای کەوانە کوربووەوە!. «ناهەقی ناگرم، شەوگار درەنگە.» ئەوەندەی وت. نەکانی‌داو کەوتەوە جوولە هەنگاوەکانی تێکەڵ و پێکەڵ دەبوون.. هەرچۆنێ بوو تازنجیرەکە بربکات ڕۆیی‌و بەدەم لەترەوە ڕووی لە گلەزەردە کردەوە. «ئەوە چیتە جوامێر؟! نابینی هێشتا ئاگری شێخ دەگـرێ..» ئەمەی وت و هێزی دایە بەرخۆی.. دەستی بۆ ئاگرەکەی لای سەراورد درێژ کردەوە..

لوورەی گورگێك، تێکەڵ بە گفەی ڕەشەباکە دەبێ.. شەوگار دەچێتە پێشەوەو حەچ و لوور زیاد دەبێ.. گەلەگورگەو برسێتی باڵی پێوە ناون بۆ مڵ وموش، پەلاماردانی ئاغەڵێك، ڕێبوارێکی شەوبەکێو تەنیابال.. بەدوایا حەپەی سەگێك، وەڵامی لوورە لوورەکە دەداتەوە.. بەدەم هامشۆکردنەوە گوێی لەترپەی هەنگاوەکانی خۆی دەبێ. لەژێر پێی‌دا دەنگی‌بەفر کاتێ دەپەستێتەوە ڕەقتر دێتە گوێی.. بووە بە شەختە سەهۆڵ.. لەگەڵ ترپەی، هەنگاودا سێ‌ودووی دڵی خۆی دەکرد:

«ڕەشەباکە ورنگە نادات.. هەتابێ‌و ساردتری دەکات.. پێویستە تاخۆر کەوتن لەگەڕان و جم وجووڵ نەکەوم دەنا وەك تەختە سەهۆڵەکانی ژێر پێم ڕەق دەبم و گیانم لێ‌دەبڕێ.. بە کۆرە کۆڕی مایەکوێتا دیارە بەیان نزیك بۆتەوە.. کاتی ئالیکی هاتووە.. ئێوارەش زۆری کۆڕان بەڵام ئالیکیان نەدایە.. ئەگەر ڕۆژم لێ‌بۆوە دەچمە خزمەت ئەحمەد بەگە.. ڕاسپاردەکەی شێخی پێ دەگەێنم. باشە ئەوە دنیایە، ئەگەر بە شکستی ئەم خێوەتگایەم بەجێ هێشت؟. نانا.. مردن هەرچۆنێك بێ سروشتی‌یە، بەڵام هەرەس هێنان لە ئەزەلەوە بەباڵای مرۆڤ نەبڕاوە.. ئەمەیان شەرمەزاریی لەدوایە!. وریابە جوامێر.. دیسانەوە گوێم لە لوورەی گەلە گورگەکەیە.. دیارە هیچیان دەست نەکەو تووە. نە ئاژەڵ نە ڕێبواری هەڵتەو شەوبەکێو.. ئەگەر دەستیان بکەوتایە وەها نەیاندەلووران.. ئەوەتا سەگوەڕ وەڵامیان دەداتەوە.. بەڵام من لەو گورگانە برسیترم.. گوێم لە قوڕەی سکمە.. برسێتی‌یە کە بە یەکجاری کۆڵەی کوتاوم و زەیفی لێ‌سەندووم. هەرئەوەم خواردووە کە نیوەڕۆ نەخشین داوێتی پێم.. چەنـد ئارەزووی ئەو خواردنانـە دەکەم کە هەڵیان لێ بەرزدەبێتەوە.. ئەگەر بە شکستی ئێرەم بەجێ هێشت چۆن ڕووم بێ بەرەوڕووی شێخ ببمەوە؟.. هەرکە لەژێر برۆپرو باهەڵدراوەکانیوە سەرنجی دامێ ئیتر لەجێی خۆمەوە دەبمە دڵۆپێ ئاوو دەچم بەناخی زەویـدا.. ئەی چۆن ڕووم بێ جارێکی دی بچمـەوە خزمەت حەمدی؟.. ئەی بە نەخشین بڵێم چی؟.. هیچ لەوە ناخۆشتر نی‌یە بۆ پیاو، لە بەردەم خێزانەکەیدا وەك بوودەڵەیەك خۆی ببینێتەوە!!.. تانـەی ئەو دەبێتە کارێکی ڕۆژانە!.. ئەی خەڵکی دێ؟.. دەبێ تامـاوم چاو بەرەوژێر بم.. نا هەرگیز کاری وەها ڕوونادات!.. شەوگار هیچی وەهای نەماوە.. کە گەڕامەوە دێ، ئەم بەسەرهاتە بۆ

شێـخ و بۆ خەڵکی ئاوایی دەگێڕمـەوە.. بۆ نەخشـین.. بۆ ئەو کۆرپەیەش کەوا بەرێوەو بەنیازین ئەم بەهارە چاوی هەڵبێنێ..»

* * *

ڕوونـاکـیـیـەکـەی لای سەراوردی گڵەزەردە وردە وردە کاڵ دەبـۆوە.. لە بەرامبەریشەوە، لەئاستی گۆیژەو بەدیوی شارباژێردا ئاسـۆ دەکـرایـەوە.. هەستی کرد وا تاریك و ڕوونـە.. ئەمەیش مزگێنیی خۆرکەوتنە!.

جوامـێر، لچ و لیـوی لەوەدابـوو لەگۆ بکەون.. ئاو بە چاوو لووتیـدا دەهـاتنـە خوار.. پەنجـەکـانی قەسڕیـوون.. بۆی نە دەنووشتانەوە.. کەوتەوە جووڵە.. لەگەڵ ئەو حاڵەشدا خەیاڵ بۆ دنیایەکی دیکەی دەبرد.. لەو دنیایەدا، بەسەر پشتی ماینەکوێتەوە بوو.. لەگەڵ سەدان سواری وەك خۆیدا ئاگریان لە قەڵەمبازیان دەدا بەرەو خێوەتگایەکی دی.. دەنگی تەپڵی سواری.. تاوێ لەو جیهانە شینەدا مایەوە، پاشان لەگەڵ خۆیدا کەوتە گفت وگۆ:

«دەبوایە من بەکاکی ئەفسەر بڵێم: لەپشت حەوت دەریاوە بۆچی هاتـووی بۆ ئێرە؟!. دەفەرمووو چۆن هاتووی ئاوایش بگەڕێرەوە، هیـچ پێـویستیـان بەتـۆ نیـیـە.. کەچی ئەو داوای ناوو تەمەن و ناونیشانم لێدەکات!. منی مالخۆ بوومەتە دەسبەسەری بیانی!»

هورووژمی ڕەشەبای سارد شاڵاوی هێنا.. گیانی دەرزی ئاژن کرد.. هێنایەوە بۆ سەربازگەکە.. لەپاسەوانی ناو کووخەکەی پرسی:

ـ ئەرێ کاکی سـەرباز چەندی ماوە خۆر بکەوێ؟

ـ خۆر هەڵنایە!

ـ خۆر هەڵنـایـە؟!.. خۆ ئەمـەیان نەبەدەست کاکی ئەفسەرەو نە بەدەست بەریتانیای گەورە.

ـ نەء.. خۆر هەڵنایە.. ڕەقیش دەبیتەوە!.

ـ ئەو ئاگرەش تروسکایی نەمێنێ، هێشتا هەر ڕەق نابمەوە.. چونکە دەزانم دوای ئەو خۆر هەڵدێ.

ـ کام ئاگرە؟!.. کوا ئاگر کراوەتەوە؟

ـ تۆ هەستت پێنەکردووە. بەڵام ئەگەر لەچاوی منەوە سەیرت دەکرد ئەوسا دەتزانی!

ـ ئاخر ئاگر کردنەوە قەدەغەیە!. ئەفسـەر پێبزانێ منیش بەند دەکات!

ـ خۆ تۆ ئاگرت نەکردۆتەوە!.. ئەوەندە هەیە ئێمە لە دوو جیهانی جیاوازدا دەژین و لێك ناگەین!

جوامێر، کەوتەوە دەست لێك خشاندن و هاتوچۆ.. دوای تاوێ سەری هەڵبڕی‌و بەدەنگی بەرز وتی:

ـ سـەرنجی گۆیژە بدە.. ئەوا خۆرکەوت!

هەر بەڕاستی وەهابوو.. خۆر تاجی زێرینی لەسەر چیای گۆیژە نا.. کابـرای پاسـەوان وەك پێشـتر هەڵهـاتنی خۆری نەدیبێ، بە سەرسووڕمانەوە بۆ تەوقە سەری گۆیژەی ڕوانی.. گزنگ بەرەو ڕوویان بۆوە. سەربازەکە ڕووی لێ وەرگێڕاو بە بێزارییەوە وتی:

ـ بەداخەوە!

ـ بۆ بەداخەوە؟!.. پێت ناخۆشە خۆر هەڵبێ؟!

ـ سەرم لەتۆ سووڕماوە!.. حەوت ڕۆحت هەیە!

بەرەوڕووی هات کلیـلی لەگـیرفـانی دەرهێنـا، کەلـەبچـەی پێکـردەوە.. پاشـەوپـاش گیرایـەوە.. جل وبـەرگـەکانی کە لەناو مشکییەکەیدا شەتەك درابوون هەڵیدایە پێشی.. ئەمیش وردە وردە کردینە بەر.

پاسەوانەکە لێی کەوتە ترسەوە چەپ و ڕاستی لێگرت، ڕووی تفەنگەکەی تێکردو پێی وت:

ـ تۆ ئێستا ئازادی.. وڵاخەکەشت ئامادەیە!

جوامـێر، بە شێنەیی.. وەك کەسێ ئارەزووی دیداری ئاشنایەکی بکات پێی وت:

ـ حەزم دەکرد کاکی ئەفسەر ببینم!

پاسەوان هێندەی دیکە ترسی لێنیشت.. وەك پشیلەیەك خۆی بۆ شاڵاو بردن ئامادە بکات، کرژ بوو.. پەنجەیشی لەبەر کاردا بوو.. بەشپرزەییەوە پرسی:

ـ کاکی ئەفسەر ئێستا نوستووە.. بۆ چیتە؟!

بەڵام جوامێر، بەهێمنی وەڵامی دایەوە:

ـ نوستووە؟.. باشە کە خەبەری بۆوە با لە زمانی منەوە بە بەریتانیای گەورە ڕابگـەیێنێ. بلێ جوامێر دەیگوت: هەتا ئەو ئاگرە بەچیاوە بمێنێ من ڕەق نابمەوە.

حوزەیران/ ١٩٨٧

# مۆدێل

ئاسو أحمد حمه صالح

مەجوولێ . . با زولفە ئاڵوزەکەت هەروا بە سەر سیمات دا پەخش بێت، باری دانیشتنەکەت مەگۆڕە . . با مۆدێلەکە نەشێوێت. نزیکەی سێ سەعاتە بەسەر ئەم کورسی‌یە ڕەق و تەقەوە ڕوواوم و پەپوولەی سەرنجەکانم لە نێوان سیمای لێڵی تۆو پەڕە کاغەزەکەی سەر ڕانم دا لە باڵەفرەدان، نزیکەی سێ سەعاتە پەپوولەی سەرنجەکانم بێ سرەوت باڵ لێك دەدەن . . کەچی شەکەت نابن . . لە مژینی شیلەی گوڵی گۆناو لێوت تێر نابن. بە تلێکی شەو ڕاشکاوەو وەك گلۆپە زەردە کزەکەی ژوور سەرت داگیرساوم و لەگەڵ جگەرەی نێوان لێوەکانم دا دەسووتێم؛ دەزانیت لەو ساتەوەی قەڵەمەکەم گرتۆتە دەست و بەرانبەرت دانیشتووم یەك پاکەت جگەرەم کێشاوە؟ زۆرە؟ ڕاستە . . بەڵام نازانم . . بڕوا بکە خۆشم نازانم چۆن لەم ماوە کەمەدا یەك پاکەت جگەرە بکێشم . . ئاگاشم لێ نەبووە . . تەنیا ئێستا هەستم بەمە کرد . . گوێ مەدەیە . . پەکم لە جگەرە ناکەوێت . . جار جار هێندە کار دەکەم کە بتوانم جگەرە بکرم

هەر جگەرەم هەبێت هیچی دیکەم ناوێت، وا وێنەکەش لە تەواوبوون دایەو ئیدی هێندە پێویستم پێ‌ی نابێت وا وێنەکەت تەواو دەبێت . . خۆزگە سەیرت دەکردو ڕای خۆت پێ دەووتم، ڕەنگە هیچ لە هونەرو وێنەکێشانیش نەزانیت . . بەڵام چ قەیدی‌یە . . خۆ خەم و لێڵی‌و ماتی‌ی چاوەکانت هەر دەناسیەوە . . ڕەنگە تەنیا لە تارمایی‌یەکەت بچێت . . چ بکەم؟ نیوە شەوەو گلۆپە زەردە کزەکەی ژوور سەرت بە ڕەشایی‌یەکەی دەورت ناوێرێت و تەنیا کەمێکی لێ‌ڕەواندۆتەوە . . چاویشم وەك چاوی پشیلە بریسکەدارو تیژ تین و لە دووری‌ی (دە) مەترەوەو لە شەوێکی وادا دەتوانم هەر تارمایی‌یەکەت ببینم حەزم دەکرد لە بەردەمت دا تروشکە بکەم و بە قوولی لە زولفە ئاڵۆزو سیما زەردو چاوە ماتەکانت ڕامێنم . . حەزم دەکرد یەکەیەکە بژۆڵەکانت بژمێرم، بەڵام حەزەکانمان زۆرن و هیچیان شێن نابن، ئەوەتا دوو زرتە زەلامی چاوزەق بوونەتە یاساوڵ و (دە) مەتر دووری‌یان خستۆتە نێوانمانەوەو بە پیسی‌و تیز پێ کردنەوە بۆمان دەڕوانن، وەك پاسی گەوهەرێکی بەنرخ بکەن و لە دزو جەردەی بپارێزن . . بە پانتایی ڕاڕەوەکە چاوەکانیان زەق کردووەتەوەو یەکە یەکەی جوولەو هەناسەمان دەژمێرن، جەستەی ئەستوورو



تێکسمراویان بوونەتە شووراو ڕێ لە نزیك بوونەوەو یەکگرتنمان دەگرن. ئاخ.. خۆزگە وەك ڕووداوی تەلیسماویی چیرۆکە ئەفسانەیییەکان بروسکەیەکی سیحری لە کەللەسەری دەدان و جەستەی زەبەللاحی دەسووتاندن و لە چاو تروکانێکدا دەیکردنە هەڵم.. ئیدی ئەوسا بە ئازادی لە بەردەمت دا بە چۆڵ دا دەهاتم و ڕێنەم دەکێشایت، خۆ من ناشتناسم.. هەفتەیەکە لەم ..حۆشخانەیەم و کەچی ئەمشەو.. ئەمە یەکەمجارە دەتبینم.. ئەمە یەکەمجارە دەتبینم و کەچی هێزێکی سیحراوی لە خۆم گەورەتر بەرەو لای تۆم کێش دەکات، تەنیا تارمایی بسکە ئالۆزو چاوە ماتەکانت دەبینم کەچی پابەندیان بووم و سەراپای جەستەم بووەتە چاو.. بەسەر جەستەی تاریکتەوە ڕووان و لێی ناترووکێن، ئەمە یەکەمجارە دەتبینم و لەم دوورەوە.. لە نێو کپیو خامۆشیی ئەمشەوەدا.. بێ ئەوەی بهێڵم پێ بزانیت.. بە بێ دەنگی نوێژ بۆ بالای گرمۆڵەبووت دەکەم، مەجووڵێ.. هەروا بە کپی دانیشە.. باری هەڵ کورمانەکەت مەگۆڕە.. تێکی مەدە.. با مۆدێلەکە نەشێوێت، دەمەوێت ئەم وێنەیەی تۆ بکەمە شای تابلۆکانم.. دەزانم.. ڕەنگە ئەمیش وەك گشت تابلۆکانی ترم لە ژووره تەنگ و داروخاوەکەم دا چەند سانتیمێك تۆزو خۆڵی سالانێکی درێژی لەسەر بنیشێت.. بەلام خەمت نەبێ.. ڕۆژێك هەردێت ڕەشەبایەکی توورە تۆزو خۆڵی سەریان بتەکێنێت و تابلۆکانم لە پێشانگایەك دا پێلووەکانیان بۆ ڕووناکی والا بکەن، ئەوسا دەزانیت چی دەکەم؟ ئەم وێنەیەی تۆ لەسەروو گشت تابلۆکانمەوە هەڵ دەواسم. چاوە ماتەکانت چەپکێك خەم و ئازاری مەزنیان تیا دەچریسکێتەوە.. دەبنە بروسکەو داری زروهەوری نەزۆك دەسووتێنن، ئەوسا دەبینیت چۆن زارەترەك دەبن و دەتۆقن.. هەموو ئەوانەی تا ئێستا تابلۆکانمیان کردۆتە پێخۆری تۆزو خۆڵ و تاریکیو بەری خوریان لێ گرتوون.. ئەوسا هەموویان دەتۆقن.. زندەقیان دەچێت.. بیانووە ڕەشەکانیان بلقی ئاو ئاسا پووچ دەبنەوە، ئەوسا جیهانە وەنەوشەیییەکەی نێو تابلۆکانم پەردەی لەسەر لادەدرێت و خۆی پیشانی خەڵك دەدات.. ئا.. ئەو جیهانەی هەردەم خەونم پێوە بینیوە خەڵك پێی ئاشنا دەبن، ئەو جیهانە ڕەنگاو ڕەنگەی هەمووی گوڵ و کانیو ئەستێرەو گۆرانیو پەپوولەو منالەو ڕق و خەم و ئازارو تۆڵەو یاساوڵ و پڵنگ و تفەنگ و مار پەیی پێنابەن. ئای لەو ساتەی تابلۆکانم خۆ ڕووت دەکەنەوەو پرشنگ و ورشەی جیهانی خەونەکانم چاوی خەڵك ڕۆشن دەکاتەوە.. دەبینیت چی ڕوودەدا.. هەڵبەت تۆش لەوێ دەبیت.. وانییە؟ دەترسم نەتبینمەوەو وێنەکەت لە هۆڵی پێشانگاکەدا بە سیما نامۆکان دا هەڵ بڕوانیت و بۆت بگەڕێت.. کەچی تۆ لە جیهانێکی تر بیت، دەترسم تۆش سبەینێ لە جەنجاڵیو ئاپۆرەی شەقام و کۆگاو ئۆتومبیلە زۆرەکان دا ون ببیت، دەشێت.. ژیانی مرۆڤ واگۆنی شەمەندەفەرێکە.. لە هەر وێستگەیەك کە دەوەستێ.. ڕێبوارێك.. نامۆیەك خۆی تێ دەپەستێ.. لەگەڵی دەدوێت.. دەگری.. پێ دەکەنێت.. هاوار دەکا.. هۆگری دەبێو خۆشی دەوێ.. لە ناکاو.. لە وێستگەیەکی دواتر دادەبەزێو جێی دەهێڵێ.. بۆ تەنیاییو ئامۆیی سامناکی شەوان بە جێی دەهێڵێت.. دەیداتە دەست شەپۆلی شێتی ئازارو دەیکاتە نێچیری نەهەنگی هەردەم برسیی خەم.ڕەنگە تۆش هاودەمێکی تری ئەم ژیانە بێ ڕەنگەی من بیت.. بۆ تەنیا شەوێك بمژێنیت و ئەم تەنیاییە قورسەم کەمێك سووك بکەیت.. چرۆی هیوایەك.. حەزێك.. خەونێکم بگەشێنیەوەو لەگەڵ کازیوەدا بیوەرێنیت و بەجێم بێڵیت.. گێژاوی ئەم زەمەنە سەختە هەڵت لووشێت و ئیدی نەتبینمەوە، ئاخ! خۆ ناشتوانم ئەم دیوارە هەڵبەستراوەی نێوانمان بڕووخێنم و بێمە لات.. لە ناوو نیشانت بپرسم و بتناسم.. لێرەش دێوەزمەی یاسا چۆکی لەسەر سنگمان داداوەو لێ ناگەڕێ کەمێك بحەوێینەوە، بەلام نا.. ئەمشەو نانووم.. لەم قاووشە لێڵەدا ئیشکی مۆدێل و تارمایییەکەت دەگرم.. ئەمشەو نانووم.. دەبێت سبەینێ لەبەر تیشکی زێوینی خۆردا سیما لێڵەکەت بە ڕوونی ببینم و لەم دوورەوە.. بەر لەوەی بڕۆیت.. وێنەکەی خۆت نیشان بدەم، دەبێت سبەینێ بزانیت کێ ئەمشەو ئیشکی تارمایی بالاو چاوە ماتەکانتی گرتووە.. ئیدی دوای ئەوە بشڕۆیت قەیناکا، من فێری بەرگەگرتنی کۆچی ئازیزان بووم.. خەمی منت نەبێت، گرنگ ئەوەیە وێنەکە تەواو بکەم، ئەوەتا هێندەی نەماوە.. وا تەواو دەبێت. بەلام خۆزگە ئەو گلۆپە زەردەی ژوور سەرت ڕووناکیی زێتر بایە.. ئەوسا بە ڕوونی سیماتم دەبینی، مانیی چاوەکانت قووڵتر خۆی دەنواند، ڕەنگە چەند دڵۆپە ئەسرینێکیشیان تێدا قەتیس بێت.. دەزانیت ماناو قووڵییەکی زۆرتر بە تابلۆکە دەبەخشێت؟ من خۆم نامەوێت فرمێسکت بۆ دروست بکەم.. بەلام دڵنیام ئێستا بە کپی دەگریت وفرمێسك لە چاوانتەوە ڕێچکەی بەستووە تۆش وەك دایکت و باپیرەت و داپیرە گەورەکانت.. لەو ساتەوەی بۆ یەکەم جار چاوت هەڵ هێناوە فێرکراویت لە کووچە تاریکەکان داو لەژێر لێفەدا بە بێ دەنگی لانکەی خەم و ئازارو حەزو خۆزگە وەریوەکانت ڕاژەنیت و بە دیاریانەوە بگریت، هەموو ساتێك سەد جار بەبێ دەنگ بمریت و ورتە نەکەیت، فێرکراویت گەردەلوولی ژان و ئازاری بەسوێ بە ناخت دا ڕۆبچێت و هەموو گەردیلەیەکی گیانت کرمێ بکات.. پەردەی ئاسکی ڕۆحت بدڕێنێت و کەچی لەبەردەم گەورەکان دا بخەنیتەوەو پێبکەنیت، فێرکراویت خەم و کارەسات و مەینەتییەکانی

تەمەنت لە قوولایی‌یەکانی ناخت دا بشاریتەوەو سەرنگونیان بکەیت. . ئاسەواریشیان لە سیمات دا بسریتەوە، ئیستا دەبینم. . لەم دووری‌یەوە. . لە توێی ئەم تاریکی‌یە کاڵەوە دەروونی جەنجاڵت دەبینم. . هێندە خەم و ژان و خۆزگەو حەسرەتت لە ناخت دا حەشار داوە. . جەستەت بووەتە کۆمەڵێك خانەو شانەی نهێنی پاریزو ژیانمان بووەتە زنجیرەیەکی بێ کۆتایی چرپەو فرمێسك و هەنسك و خورپەو دڵەراوکێو حەسرەت ر ئاخ و ناڵەو هاواری بێ‌دەنگ و سنگە خشکێو بە نەرمی لە سەر بوێکی پێ رۆیشتن. بێگومان تۆش ژانیك. . کارەساتیك. . خەمێکی گەورە لەودیو چاوە ماتەکانتەوە پەنهانە. . هەڵبەت لە خورا نی‌یە. . داخو چ مەینەتی‌یەك توی هێناوەتە ئیرە. . نەخۆشخانەی نەخۆشی‌یەکانی مێشك و دەروون! بێگومان کەس لە خۆرا نایەتە ئیرە. کارەسات و مەینەتی زۆرن کە مرۆڤ نەك بەرەو نەخۆشخانەی نەخۆشی‌یەکانی مێشك و دەروون بەڵکە بەرەو مەرگیش دەبەن، هەڵبەت تۆش کارەساتێکی ناخت دەرزی ئاژن دەکات. داخو چی بێت؟! رەنگە کەس و کارت گەرەکیان بێت بە زۆر بە کەسێکت بەشوو بدەن و تۆش هەموو بوونی خوت لە خۆشەویستی‌ی کەسێکی‌دیدا بینیەوە، دوورنی‌یە. . کارەساتی وازۆرن. یان رەنگە گری کوێرەو سەرکوت کردنی منالیت ئیستا تاوی سەندبێت و تەونی جاڵجوڵەکە ئاسا بە هەموو خانەکانی لەشت دا بڵاوبووبێتەوەو بیرو هۆشتی لە ژێر رکێفی خۆی نابێت. زۆربەی خەم و ژان و ئازارمان هەر لە منالی‌یەوە لە ناخمان دا چووزەرەیان کردووە. . منالیمان پەرەیەکی ناسکەو ئاسەواری دەیان چەقۆی جوێن و تێ‌هەڵ دان و شکاندن و فەلاقەکردنی پێوەیە ، رەنگە تۆش بینینی دیمەنێکی دزێو یان ترسناك لە منالیت دا. . لە دەروونت دا بووبێتە گری‌کوێرە. . رەنگە هەرەسهێنان و گیانەلاو لە خوێن دا شەلاڵ بوون و پەلەقاژەی مەرگی خۆشەویستێکت بینیبێت. . بابت. . دایکت. . برات. . خوشکت یان هەر کەسێکی دیکە. . بۆ نا ؟ لەم حالەتەدا هەموو شتێك دەگونجێت. . تۆش لە روخساری تارو باڵای گرموڵەبووت دا خانووی گڵین و کولێتی هەژاران رەنگ دەداتەوە. سیمات بە سیمای ئافرەتی نێو کۆشك و خانووە باڵا بەرزەکان ناچێت. دیارە هەر لەو ساتەوەی بۆ یەکەم جار پێڵووە ناسکەکانت لێك بوونەتەوە. . دیمەنی دیواری بۆرو دارەڕای بنمیچی خانوویەکی گڵ و چەند سیمایەکی چڵکن و ماندوو لەسەر گلێنەکانت هەڵ کەندراون. ئای لە منالی‌ی بێ‌رەنگی نێو کولێت و خانووە گلەکان! دەست کورتی‌و نەبوونی خونچەی گشت حەزو خۆرگەو ئارەزووە ساواکان دەوەرێنێت. . گشت تواناو هیواو بیرۆکە رەنگاو رەنگەکان دەمرێنێت. ئەنجامی ئاسایی‌ی وەرینی حەزو خۆزگەو مەرگی هیواو بیرۆکەش چەپکێك گری‌و گۆڵی شاراوەیە لە ناخ و

دەروون دا ئەوەتا تۆش ئەمشەو. . لە قاووشە لێلەکەی ئافرەتانی ئەم نەخۆشخانەیەدا هەڵکورماویت و تەرمی حەزو هیوا مردووەکانت دەلاوێنیت. . لەم دوورەوە گوێم لە نەغمەی ناسکی گۆرانی‌یە خەمناکەکەی دڵتەو ناڵەو هاوارە بێ دەنگەکانی ناخت دەبیستم، ورشەو پرشنگی هەموو ئازارەکانت دەبینم. . خۆمن ناشتناسم. . ئەمە یەکەم جارە دەتبینم. . کەچی ئەمشەو پابەندت بووم و هەموو بوونمت داگیرکردووە، وا لەم تاریکی‌یەدا لەگەڵ گڵۆپە زەردە کزەکەی ژوور سەرم داگیرساوم وێنەت دەکێشم، گەرەکمە لە توێی تارمایی سیمات و ماتی‌ی چاوەکانتەوە گری ژان و ئازارەکانت شیتەڵ بکەم. . چ بکەم؟ حەزم دەکرد لێت نزیك بم و لەگەڵت بدوێم. . خوت باسی خەم و مەینەتی‌یەکانتم بۆ بکەیت، بەلام نا. . نا. . خەمە گەورەکان کە دەبنە وشە قووڵی‌و گەورەیی‌یەکەیان ون دەکەن، نا. . گەر لێشت نزیك بام نەم دەهێشت هیچ بلێیت و باسی هیچم بۆ بکەیت. . هێندە بەس بوو لە نزیکەوە لە روخسارت رابمێنم و لە هەموو شتێك تێبگەم. . بەڵام ئەوەتا (١٠) مەتری بە درك و ئاگر تەنراو لێکمان دادەبرێت، بۆیە ناچارم بە کۆمەڵێك (رەنگە) و (لەوانەیە) هەوڵی رەنگ رشتنی خەم و مەینەتی‌یەکانی ژیانت بدەم. . بەڵکو لە ئەنجامی هەموو (رەنگە) و (لەوانەیە) کان دا سەرە دەزووی ئازارەکانت بگرمە دەست . . دەبێت لە خەم و ژان و خەونەکانت بگەم بۆ ئەوەی وێنەکەت زیندووترو قووڵتر بێت. من دەمەوێت ئەم وێنەیەت بکەمە شای تابلۆکانم. . جا ئەوسا بە تەواوی شێت دەبن. . ئەوانەی تا ئیستا تابلۆکانمیان کردوتە پێخۆری تۆزو خۆڵ و رەشایی. . شێت دەبن. . دەبۆڵێنن. . .

(ـ ئەمە چی‌یە؟ وێنەی کچە قەرەج و کولێت و خانووی گڵی بێ رەونەقی گەرەکە تەنگەکان نەبڕایەوە؟ چت داوە لەم شتە قۆڕانە؟ تۆ بۆ هەردەم لایەنە تاریکەکانی ژیان دەنەخشێنیت و پێکەنین و سەماو لایەنە گەشەکانی فەرامۆش دەکەیت؟)

ئەوان گێل و بێ‌زەوقن. . نەفامن. . لە ماتی‌و ماندوویی چاوەکانی تۆ ناگەن، دەیانەوێت پروپاگەندە بۆ پرۆژە زلەکانیان بکەم و رووخان و داتەپینی دەیان کولێت و هێلانە بشارمەوە، دەیانەوێت بزەی زەردو ساختە لە سەر لێوی بەباری توی ئاساو بخوڵقێنم ئاخر چۆن دەبێت. . لێوی وشك و تینوی تۆ چۆن دەتوانێت هەروا بە سانایی بتریفێتەوەو قاقا لێدات؟

ئۆوو ! دیسان فەلی لانەوازی خەیاڵم بەرەو دوور دەفرێت، وا کاتیش تێ دەپەرێت و تا ئیستا نەمتوانیوە وەك دەمەوێت گری‌ی دەروونت شیتەڵ بکەم. هۆو سۆنگەی ئازارو دەردو کەسەرو شێتی زۆرن و بۆ ئەوەی پەی بە کانی‌ی بە خوری ئازارەکانت بیەم دەبێت هێشتا گەلێك «رەنگە» ز «لەوانەیە»ی دیکە ریز بکەم. رەنگە کۆچی

ناوەختی خۆشەویستێك ئەو دەلاقە گەورەیەی کردبێتە ڕۆحی ناسکت، خۆشەویستێك بەدرێژایی تەمەنێکی پڕئەوین مەزاری پشووی گیانت و ئاسۆی ڕوونی چاوانت بووبێت، کەچی لە ناکاو ڕۆژێك کۆچێکی بێدەنگ بەرەو هەوارێکی نادیار هەڵی گرتبێت و بە ناخی تاریکی نەبوون دا شۆڕی کردبێتەوە، ئەوسا باخچە ڕەنگینەکەی دڵی تۆش خاپوور بووبێت و دنیای دەورت ڕەنگی ڕەشی گرتبێت، ژیانت گشت مانایەکی لە دەست دابێت و خەم و نائومێدیو بێزاری لە دڵتەوە ئاڵابێت. ئا.. پێ دەچێت وا بێت.. چی لە ئازاری مەرگی ئازیز بە سوێترە؟ چی لە ئازاری دڵشکان و هەرەسهێنانی کۆشکی خۆشەویستی گەورەترە؟ ئازار.. ئازار.. بە درێژایی چوار وەرزی ساڵ ئازار وەك بارانی بە خوڕی بەهار بەسەرمان دا دەبارێت. دەزانیت؟ من وام نیازە گەر ژنم هێناو منالم پێ برا.. ناوی «ئازار»ی لێ بنێم.. ناوێکی چۆنە؟ ڕەنگە لۆمەی ڕەشبینییەکەم بکەن. بەلام نا.. من ڕەشبین نیم.. تەنیا ئەوەندەیە نامەوێت بە ناوێکی شادی ئامێز خۆ فریو بدەم، من گەرەکمە منالەکەم هەر لە یەکەم ڕۆژی بوونییەوە ئازار بناسیو بە گژیدا بچێت.. نامەوێت ناوێکی گەشبینی لێ بنێم و دوایی کە گەورە بوو جرتم بۆ بکێشێت و بە گێلیو نەفامیم پێ بکەنێت. ئەی تۆ.. منالەکەت ناو دەنێیت چی؟ ئا.. بە ڕاست.. دەبێت هێشتا هەر کچ بیت یان شووت کردبێت؟ خۆ من هیچت لە بارەوە نازانم، ڕەنگە مێردت هەبێت و ئەو هۆی هاتنە ئێرەی تۆ بێت.. دوور نییە.. ڕەنگە وەك زۆربەی پیاوان بە مارەییەکەت تۆی کڕیبێت و بە موڵکی خۆیت بزانێت، بە ئارەزووی خۆی کەنگێ ویستی بە قامچی جەستەت شەقار شەقار بکات.. بتڕەتێنێ.. سوارت بێ.. بتفرۆشێو ژێرپێت بنێ. ڕەنگە مێردەکەت نەزۆك بێت و هەموو ڕۆژێك بە و بیانووەی گوایە منالت نابێت چوار مێخەت بکێشێتەوەو ناتەواوی خۆی بشارێتەوە، ئای کە لەم ساتانەدا قێز لە نێرینەیی خۆم دەکەمەوە، خۆم وەك درندەیەکی دزێو دێتە بەرچاو کە بۆ دابین کردنی هەوەسە شێتەکانی خۆی ئازاری فرندەو گیانەوەری بێوەی دەدات و دەیانکوژێت.. پێ لە هەموو شتێك دەنێت و قاقا لێ دەدات. هێی ئافرەتە تارماییەکە.. کێ بە سوێی ئازارەکانت دەزانێ؟ خەم و زام و ژانت هێندە زۆرن مەگەر تەنیا لە چاوانت دا جێیان بێتەوە، ئەوەتا ئێستا لە چاوەکانتا چریسکەیان دەبینم، ئیدی دەتوانم لە قووڵیو ماتیی چاوەکانت تێبگەم و بێترس وێنەیان بکێشم، گەرچی ناشتناسم و ئەمە یەکەم جارە دەتبینم بەلام دەزانم مەینەتییەکانت لەکام کانییەوە سەرچاوەیان هەڵگرتووە، ئێستا دەتوانم ماتیو خەم و ژانەکانت لە چاوەکانت دا بتوێنمەوەو وێنەکەت زیندووترو قووڵتر بێت، هێندەشی نەماوە.. هەمووی چەند ساتێکی ترەو تابلۆکە تەواو دەبێت، بەلام داخۆ سووسەت کردبێت کە لە تۆیی ئەم تاریکییەوە وێنەی تارمایی باڵای گرمۆڵە بووت دەکێشم؟ ڕەنگە تۆش سێ سەعات زێتر بێت لەگەل گڵۆپە زەردە کزەکانی ژووور سەری من دا داگیرسابێت و بیرم لێبکەیتەوە.. بە شوێن کانیی ئازارەکانم* دا وێل بێت و کۆمەڵێك «ڕەنگە» و «لەوانەیە»ت ڕیز کردبێت، داخۆ سەرە دەزووی ڕازەکانمت دەست کەوتبێت؟ ڕەنگە هەموو شتێکت زانیبێت.. نا.. بڕوا ناکەم.. ڕەنگە وا بزانیت منیش وەك تۆ بە زۆر هێنراومەتە ئێرە، ئەگەر وابزانیت ئەوا هەڵەیت، ڕەنگە سەرا سیمەو ئەبڵەق بیت گەر پێت بڵێم من بە زۆر نەهاتوومەتە ئێرە بەڵکە بە تەواوی ویست و ئارەزووی خۆم هاتووم.. سەیرە؟! بڕوا ناکەیت؟! بەلام ئەمە ڕاستییەکەیە، هاتووم لێرە بحەوێمەوە، لەدڵ ڕەشیو خۆپە ڕستیی دەوروبەر دوور بکەومەوەو لە چوارچێوەی ئەم نەخۆشخانەیەدا کەمێك هەوای خاوێنی دوور لە درۆو دووڕوویی هەڵمژم. بڕوام پێ بکە.. من فشە ناکەم و فەلسەفە لێنادەم، واتیمەگە من هونەرمەندم و دەمەوێت هەست ناسکیی خۆمت بۆ بسەلمێنم*.. نا.. هەرگیز بەلام گەر بەسەرهاتی پڕ لە ناسۆرم بزانیت، ئەوا بە ئاسانی لە خەم و ژان و خەونەکانم تێدەگەیت، گەر تەنیا کەمێك گوێم بۆ ڕادێریت ئەوا هەموو شتێکم لە بارەوە دەزانیت. چ بکەم؟ ئەمشەو تاریکییە کاڵەکەی قاوشی ژنان و قاوشی پیاوانی ئەم نەخۆشخانەیە پێکی ناساندین و کردینیە ئێشکگری خەم و ئازاری یەکتر دەزانم کات درەنگە.. بەلام چەند ساتێك گوێم بۆ ڕادێرە.. هەموو شتێکت پێ دەڵێم.. من بابی خۆم نەدیوە.. ئەمە لە منالیم دا زۆری ئازار دەدام و تاکە خەم و سەراقی گەورەی ژیانم بوو.. هەموو ڕۆژێك منالانی گەڕەکم دەبینی لەگەڵ بابیان دا گەمە دەکەن و دەتریقێنەوە.. منیش دەمویست وەك ئەوان بکەم.. دەگەڕام.. بە هەموو کون و کەلەبەری ماڵەکەمان دا چاوم دەگێڕا.. بەلام بێ هوودە، دەیانووت سەفەری کردووە.. شەوگارو ڕۆژگارێکی دوورو درێژ چاوەڕێ بووم بەڵکە بێتەوە.. بەلام هەرگیز چاوم پێ نەکەوت.. تا ئەو کاتەی سمێڵم بۆرو دەنگم گڕ بوو.. ڕۆژێك لە دایکم بیست:

[ - ڕۆڵە گیان.. هێشتا تۆ نەهاتبوویتە دنیاوە کە بابت مرد.. کوشتیان، ئاوا منیشیان هەتیو بارو سەرگەردان کرد. لەو ساوەش بە بێ ترس دەسوورێنەوەو سمێڵ بادەدەن، تا ئێستا کەس نەبوو تۆڵەی بسێنێت بەلام ئۆخەی کە وەجاخم ڕوونەو شکور بوویت بە پیاو.. تۆڵەی بابت دەسێنیت و ناهێڵیت خوێنی بە هەدەر بڕوات. ]

بەر لەوەی لە دایك ببم بابم کوژراوە.. دەزانیت بۆ؟ (٢٥) ساڵ لەمەوبەر ڕانەمەری کابرایەك چووەتە مەزراکەی بابمەوە.. ئەم نووڕەو شێتگیر بووە.. کابرا داوای لێبووردنی کردووە، ئەم

جوێن بارانی کردووە. . کابرا هەر بێدەنگ بووە، ئەم دەستی داوەتە یەخەی . . بەڵام کابرا هەر هێمن بووەو داوای لێکردووە نەفرەت لە شەیتان بکات وبیبڕێتەوە چونکە مەسەلەکە هێندە ناهێنێت. . بەڵام بابم گوێی پێ نەداوە. . دەستی داوەتە پاچ و پەلاماری کابرای داوە. . ئیتر ئەو زووتر هاتوتە دەست و خەنجەرێکی لە سنگی بابم دا چەقاندووە. بابم ئاوا کوژراوەو هەر لە یەکەم ساتی بوونمەوە چارەنووسی منیش دیاری کراوە، لە یەکەم ڕۆژی ژیانمەوە کەس و کار بەدەورم دا دەهاتن و نازیان دەکێشام. . بە چرکە تەمەنیان حساب دەکردم. . پەلەیان بوو زوو هەراش بیم و ئەرکە مەزنەکەی سەرشانم بەجێ بێنم. بەڵام کە گەورە بووم. . بەرەکەت دا . . دوژمنەکەی بابم بۆ خۆی مردو ئەو کارە ڕەشەی لە ئەستۆم وەلاخست . . کەچی هێشتا هەموو ڕۆژێك ئەم قەوانەم هەر بەگوێدا دەدرا. .

[ - کوڕم ئەمشەو لە خەونم دابابی ڕەحمەتیتم بینی. . زۆر نارەحەت و تووڕەو بێزار بوو. . دەیووت من هیوام بە تاقە کوڕەکەم بووە هەقم بسێنێت و کەچی وا گەورە بووەو بووەتە پیاو. . هێشتاش دوژمنەکانم بە ساغ و سەلامەتی دەسووڕێنەوە.

+ دایەگیان. . ئەو کەسەی بابمی کوشت بە سزای خۆی گەیشت. . خوا تۆڵەی بابمی لێسەندو ئێستا لە توێی گۆڕدایە. .

- جا چ قەیدی‌یە. . ئەو نا براکەی . . کوڕەکەی. . ئەوان خوێنی یەکێك لە ئێمەیان ڕشتووە. . دەبێت ئێمەش خوێنی یەکێك لەوان بڕێژین.

+ ئاخر بۆ؟! بابم کاتی خۆی هەڵەی کردو لە سەر مەسەلەیەکی هیچ و بێ بایەخ خۆی بە کوشت دا. . کوژەرەکەشی مردو تەواو. . ئیتر بۆچی بە خۆڕایی کەسی بێ گوناهی تری تیا بچێت؟

- ئەم قسە قۆڕانە چین. . هەی ترسنۆکی نێرەمووك؟ دەتەوێ لە ناو خەڵك دا سەرمان شۆڕ بکەیت و بمانکەیتە پەندی زەمانە؟ من (٢٥) ساڵە چاوەڕێی ئەو ڕۆژەم گەورە بییت و تۆڵەی بابت بسێنێت. . کەچی تۆش ئەمە کردارو گفتارتە، گوێ بگرە . . خوێن بە خوێن دەشۆرێتەوە گەر نەبیتە پیاوو تۆڵەی بابت نەسێنیت. . ئەوا کوڕم نیت و شیری ئەم مەمکانەمت لێ حەرام بێت. . ]

ئەوان وا بیر دەکەنەوە. . جیهانە وەنەوشەیی‌یەکەی نێو تابلۆکانم نابینن. نازانن من ڕەنگی جیهانێك دەڕێژم تێیدا خۆشەویستی گەورەو فەرمانڕەوایە، نازانن من چ پەیامێکم لە دڵم دا هەڵ گرتووە، گەرەکیانە مرۆڤێکی بێگوناه بکوژم. . نازانن من خەون و هیوا سەوزەکانی خۆم چەند خۆش دەوێت دەیانەوێت خەون و هیوای گوڵ ڕەنگی مرۆڤێکی بێوەی بوەرێنم. زۆریشم هەوڵ دا ڕەشایی‌یەکەی دڵ و دەروونیان بڕەوێنمەوەو تۆڵەو تاوانیان لە بیر دەرکەم. . بەڵام بێ هوودە. هەر کە دڵنیاش بوون خەونە ڕەشە

کۆنەکەیان بەدی ناهێنم. . تف و جوێن و بەردبارانیان کردم. . حاشایان لێ کردم و ترسنۆکیان کردە ناوو ناسناوم. کە نزیکترین کەسەکانم بیانەوێت بمکەنە داردەستی خۆیان و خەونە ڕەش و دزێوەکانیان بۆ وەدی بێنم. . هەر کە بۆشم نەکردن. . پێ لە هەموو شتێك بنێن و تووڕەم دەن و دەرم کەن. . چیم پێ دەکرێت جگە لەوەی دوور بکەومەوەو جیهانە گوڵ ڕەنگەکەی ناخم لە گەندبوون بپارێزم؟ من پێم خۆشە نەخۆش ترسنۆك. . نێرەمووك . . هەموو شتێکی خراپ بم بەڵام پیاو کوژ نەبم لێم تێ دەگەیت ؟ ئەوان نازانن ئەو قامکانەی قەڵەم و فڵچە دەگرن و وێنەی نۆو مناڵ گوڵ و کانیو خۆشەویستی دەکێشن. . ناتوانن خۆیان لە خوێنی مرۆڤێکی بێوەی وەردەن، ئەوان لەمە ناگەن. . خۆیان نوقمی تاریکیو ڕەشایی‌یەکی خەست کردووە، بەڵام کەیفی خۆیانە. . حاشام لێ بکەن یان نەکەن دەربەست نایێم، من پێم خۆشە بە کۆڵانان بکەوم و لە کەلاوەکان دا بنووم. . ڕووت و برسی بم و سەرما دەمارو ماسولکەکانی لەشم سڕبکات نەك کارێکی وا ڕەش ئەنجام بدەم. خۆ هەر ئەوانیش نەبوون. . لەو ڕۆژەوەی ئەو کارە ڕەشەم ڕەت کردەوە. . زۆربەی هاوڕێکانیشم پشتیان تێ کردم و بەجێیان هێشتم. . ترسان. . ترسان نەبادا بەر دەرکەیان پێ بگرم و داوای داڵدەو پەناگەیان لێ بکەم، وایان دەزانی منیش وەك خۆیانم. . نەیان زانی من نا توانم مشەخۆر بم و لەسەر ورگی خەڵك بژیم. . نەیان زانی گەر هەموو دەرکی ماڵەکانیشیانم بۆ والا بکەن و لەسەر پێخەفی زێڕین بمنوێنن. . ئەوجا پێ نانێمە ئەو دیو دەرکەی ماڵی کەسیان و ئەستۆی هیچ کەس بە مەینەتی‌یەکانی خۆم قورس ناکەم، بەجێیان هێشتم و هەموو وەك گەردەلوول هەڵی لووشیبن. . وون بوون.کە کەس و کارو دۆستانم ئاوا لە یادی خۆیانم بسڕنەوەو بە نەبووم دابنێن. . چیم پێ دەکرێت. . هێندە نەبێت تەنیایی‌یەکەم بلاوێنمەوەو ئاوێزانی ڕۆحی کلۆڵم بیم؟ من خۆزی بە ساوایەك دەخوازم کە سەری لە باوەشی گەرمی دایکیدا نوقم دەکات و گوێ لە ترپەی لێدانی دڵی دەگرێت. . بەڵام چ بکەم. . چیم دەسەڵاتە؟ تۆ بۆ چەند ساتێك خۆت لە جێی من دابنێ . . کەس و کارو دەوروبەر بیانەوێت خەونە ڕەشەکانیان بۆ بەدی بهێنیت. . کە نەشت کرد خۆیانت لێ بێبەری بکەن. . فڕێ بدرێیتە پەراوێزەوەو کەسێك نەبێت بزەیەکی خۆشەویستیت بە ڕوودا کەرەم بکات. . داخۆ بزانە ئەوسا لە من زیتر قێزو نەفرەتیان بە سەردا نابارێنیت و قووڵتر بە ناخی زامداری خۆت دا شۆڕ نابیەوە؟ ئووو!! بمبوورە. . من خۆشم نازانم بۆ ئەم بەسەرهاتە تاڵ و بێ پێزانەت بۆ دەگێڕمەوە، بەڵام چ بکەم؟ ئەمشەو ئەم تاریکی‌یە کاڵە بە یەکی ناساندین و کردینیە ئێشکگری خەم و زامەکانی یەکتر . ڕەنگە ئێستا لەو دیو ئەم (دە)مەترەی نێوانمانەوە بۆم

بگـریت.. دڵخـۆشیم بدەیتـەوەو کورپـەی ئازارەکـانم بلاوێنیتـەوە، نەفرەت و تووڕەییت بەسـەر ئەو کەسـانـەدا ببـارێنیت کە وەك پشیلە سپلە بوون و چرنـووکیـان لێ گیـر کردم و زامـداریـان کردم، رەنگە داوام لێ بکـەیت لە یادی خۆمیـان بسـڕمـەوەو گوێـیـان پێ نەدەم.. چاکە.. من دەتوانم لە یادی خۆمیان بسڕمەوە.. بەڵام خۆ من باسی هەموو شتێکم بۆ نەکردوویت، زامەکانی ئەوان هێور دەبنەوەو سارێژ دەبن.. تارماییان لە یادو هۆشم وون دەبن.. بەڵام ئەی «خەندە»؟ خۆ من باسی «خـەنـدە»م بۆ نەکـردوویت.. چۆن لە یادم بچێتـەوە؟ دەزانیت « خەندە» کێیە؟ بمبوورە.. نامەویت بەم باسانە وەڕست بکـەم.. بەڵام رێکـەوت ئەمشـەو بە یەکی گەیـانـدین بۆ ئەوەی خەمـەکـانی یەکـدی بە سەر بکـەینەوەو بۆ یەکتر بگرین و بسووتێین و بمرین. «خەندە» زاسی گەورەی گەیانمە.. کە دەردەکەوت.. خۆرم لێ هەڵ دەهات.. کە قامکە ناسکەکانی لە قژو ردێن و تووکی زبری سـەر سنـگـم وەردەدا.. خەم و ئازارەکـانـم دەرەوینـەوەو هێـور دەبـوومـەوە.. خۆم لەبیـر دەچـووەوەو پەپـولـە پاییـزە ئاسا بە دەم سروەبـایـەکی فێنکـەوە سەمـام دەکرد، کە سەری پڕ پەژارەو کەسەرم دەنـایـە سەر سینـەی گەرمی.. دەتـووت منـاڵێکی دە ساڵانـەی چەتوونم و لە باخچەی رەنگاو رەنگی ماڵی خوا پێداوێك دا.. بێ ترس.. سـەما دەکەم و لەسەر فەرشی چیمەنەکە رادەکشێم و بۆن و بەرامەی گوڵی هەمەجۆر سییەکانم پڕ دەکەن. خۆشم نازانم چۆن بوو.. بێ ئەوەی بە خۆ بزانم بۆ ماوەی دوو ساڵی تەواو.. واتە ماوەی حەوت سەدو سی شەوو رۆژ.. بووە بەشێکی گەورەی خۆم و رەنـگە وتـابلۆکـانم، کۆتـرێکی نەخشین بوو بە ئاسمانی تابلۆکانم دا باڵـی لێـك دەداو دەفـری.. لە سـەر لق و پۆپـی درەختـەکـان هەڵ دەنیشت و چرۆی خەم و ئازارەکانمی دەلاواندەوە.. فلچەکەی دەستمی ماچ دەکردو دەیووت:

[ ـ خۆزگە من لە جێی ئەم فلچەیە بوومایە.

+ بۆ؟

ـ چونکـە هەردەم لە نێـوان پەنجـەکـانت دایەو وێنەی بیرۆکەو حەزو خەمەکانت دەکێشێت.

+ ئاخـر ئەوسـا هێنـدە وێنـەی ژان و ئازارەکـانم دەکێشیت.. بێـزار دەبیت و بەجێم دێڵیت.

ـ هەرگیـز.. هەرگیـز بێـزار نابـم.. مەگـەر تۆ فڕێم بدەیت و فلچەیەکی نوێ بکریت.

+ ئەی ئەگەر رۆژێك بەجێت هێشتم؟!

ـ ئەوسا یەخەی ئیزرائیل بگرە.. چونکە مەگەر تەنیا ئەو بتوانێت لە تۆم جیا بکاتەوە.]

زۆر جار بەو قسانە هەوری ترسی دەرەواندمەوەو رووباری دڵنیایی دەرژاندە گیانمەوە.. بەڵام ئاکام! ئەوەتا بێ ئەوەی ئیزرائیل توخنی بکەوێت.. خۆی بە کەیفی خۆی بە جێی هێشتم.. بە زیندوویی لە گۆڕی نام و هەمـوو تروسکـەیـەکی لە ژیـانم دا کوژانـدەوە.. بە جێی هێشتم و کردمیـە نێچیـری دێـوەزمـەی تەنیاییەکی بێ ئامان، فلچـەو رەنـگ و خەونـەکـانمی گۆڕیـەوە بە کۆشك و مەرسیدس و ژوورێکی نووستنی پەمەیی رەنگ، ئێستاش گوڵێکی باغەی بێ گیانە لە گوڵدانێکی مردوودا.. مێزی خواردنەوەو ژووری نووستنی یەکێك لە کۆشکە سەوزەکانی شار دەرازێنێتەوە.خۆ من زۆرم لێ نەکرد.. بە ویـستی خۆی پێی نایـە هەوار دڵمـەوەو نازی خۆزگـەو خەون و خەمـەکـانمی کێشـا.. بۆم داگیـرسـاو ژوورە تاریکـەکـەمی رۆشن کردەوە.. کەچـی دوایـیش بەجـێی هێـشتم.. کوشتمی.. خۆشی کوشت.. کۆترە نەخشینەکەی نێو تابلۆکانیشم مرد.. ئیدی لەوساوە کەس گۆرانی بۆ خەمەکانم ناڵێت، تەنیام.. تەنیاترین کەسی سەر ئەم ئەستێرە بێ ورشەیەم، کێ وەك من تەنیایە.. منی پەراگەندە.. بێ ماڵ و داڵـدە.. بێ کەس و کار.. بێ دۆسـت و هاوڕێ.. بێ ئافرەت و خۆشەویسـت.. کێم هەیە جگە لە رۆحە زامدارو دڵە لە سەد لاوە شکـاوەکـەم نەبێت؟ تەنیـا فلچـەو رەنـگ و دڵـە شێتەکەم و دەواری شری قەرەجـەکـان هاودەمی تەنیـاییو ئێشکگـری فرمێسکـە نهێنییـەکـانمن. بمبـوورە.. ئەمشـەو بەم گریـان و ناڵـەو سووتانەم کاسـم کردیـت.. بەڵام بەدبـەخـتـیی خۆتـە ئەمشـەو تووشی من بوویت، ئیدی بێزارت ناکەم.. وا وێنەکەشت تەواو بوو.. خۆزگە دەتـبـیـنیو رای خۆت پێ دەووتم.. لە تۆ دەچێت؟ چ بکـەم؟ هەر هێنـدەم لە دەست دێت.. تەنیـا تارمـاییـیـەکـەتم لێ دیـارە، سر نەبوویت؟ باری دانیشتنەکەت بگۆڕە.. ترست نەبێت.. مۆدێلە کە ناشێوێت، وێنەکە تەواو بوو.. منیش نانووم.. ئەمشەو نانووم.. ئێشکی وێنەو تارماییو گڵۆپە زەردەکەی ژوور سەرت دەگرم، دەبێت سبـەینێ لەگـەڵ کازێـوە ببینم و لە چاوە ماتـەکـانت رابمێنم، رەنگە تۆش نەنوویت و بتەوێ سبەینێ بە رووناکی ببینیت.. بۆ نا؟ رەنگە بەر لە کازێوەش بڕۆیت و بەجێم بێڵێت.. دڵنیا بە وێنەکەت دەکەمە شای تابلۆکـانم. بەڵام خۆزگـە سبـەینێ بەر لەوەی بڕۆیت بۆ تەنیـا ساتێك لە سیما روون و چاوە بێدارەکانت رادەمام تۆش دەڕۆیت.. ئافرەتـە تارمـاییـیـەکـە.. تۆش دەڕۆیت و وەك هەموو ئەو کەسانەی لەمـەوبـەر نازی خەمـەکـانیـان کێشـاوم بەجێم دێڵێت.. بۆ گریان و شەوو تەنیـاییو سووتـان و مەرگ بەجێم دێڵێت، خۆ من ناویشت نازانم و ناتناسم.. ئەمە یەکەم جارە دەتبینم بەڵام لەوە دڵنیام.. پێ بزانیت یان نەزانیت.. ئەمشـەو پەردەی ئەستـووری تەنیـاییەکەمت دڕاند.. بوویتە بەشێك لە بوونم و لاپەڕەیەکی ترت لە داستانی ئەم تەمەنە رەشەم نووسییەوە.

■ چیرۆك ■

# بالولکا شەکرێ

حسن سلیڤانی

نەینەوا ۲۵/۱۱/۱۹۸۵

بێهنەك خوەش ما بێ دەنگ و دقولاچ و دیواریت شکەڤتا تاری وبهن تەنگ فوکری. هەتا ترس و تاریێ خوە کرنە ئێك وقەستا وێ کرن و راهێلانێ.. ئێك سەر «حەلوکا» چار سالی خوە ئاڤێت ددانگا دەیکا خوەدە وسەرێ خوە یێ قژاڤژ وبەردای هشك بسینگێ وێ ڤەنا:-

- ئە.. ئەز برسیمە ئودا... من بالولکا شەکرێ دڤێت..

بابێ وێ یێ ب رەخڤە لێ حەیتاند:-

- دێ هژبە کچێ، مانوکە دەمێ هندێیە؟ حەلوێی بەردا گرێی ودەستێت خوە بچاڤێت خوە ڤەنان و سەرێ خوە ژ سینگێ دەیکا خوە ڤەکر و ب هێڤی بەرێ خوە دایێ.. ب روندکا دگوتی «ئەز برسیمە ئودا»

بێ ئاگر جەرگ و هناڤێت دەیکاوێ دهاتن سوتن ل بەر روندکێت برسێ و ژاری یا زارویا وێ یاناز دارکری..

- حەلوکێ. دای گوری بێ، بەس بگری و دلێ من نەسوژە. ئەڤە ئەزێ چم، بوتە بالولکەکا شەکرێ چێکم و ئینم، ئوج دقەومت بلا بقەومت.. مێرێ وێ کیسکێ توتنێ ژبەر شویتکا خوەرا ئینا دەرێ ئو ماد پێ خوە یێ راستێ سەقەت فوکری. سێ سال دوێ گاڤێد کوشتن:-

- ئیسف هەمە کوتان کە ونە هێلە کەس نێزیك بت چێترە نەشولا تەیە.. خوە ژێ دویر بکە.. بەلایە

- ئەز دزانم بەلایە ونەیاریەکە لێ بێهنا من قەت ناهێت دەمێ ئەز ڤێ گولـلا نە پەقی هوسا چکلاندی ل بەر دەرێ مالێ دبینم... ئەز دێ ل هەر.....

- ئیسف... ئیسف..

- هاها عالیا.. تەچیە؟؟

- چاڤێ تەل کچکێبت ئەڤە ئەزێ چم..!!

دزانی ژێ ئاخڤتنا وی بێ وجە، کەس وەك وی سەر رەقییا وی ناسناکت، لێ دسەر هندێرا گوتێ:

- دینا خودێ نەچە.. نەچە.. ماتە هاژ ڤیرەڤیرا فروکێت سەی بابا نینە.. نێ ل ڤێرێ گوهێت مە کەرکرن..

- ماتو من ناسناکێ ئیسف؟ ئاخڤتنێت خوە دئاڤێدا نەبەردە...

- ماتو ل مرنا.... ئەعوذ و بیلاهـ....

پیرە ژنە کا سەرسپی و ئالەك قورمچی نێزیکن وێ گوتێ:-

- روینە خارێ و نە چە، کچا تە هەر ژ برسا نامرت... ئەوی پیرەمێرێ تسبیێت رەش ددەستا ژێ گوتێ:-

- عالیا... ناڤێ خودێ بینەونە بە بەلاکر... هەما تو دەرکەتێ، فروکە دێ جهێ مە بینن و دێ ئاڤین شکەڤتێ... عالیایێ هەردو چاڤێت حەلوکێ ماچیکرن وبەرێ خوەدا پیرە مێرێ و ب ئەزمانەکی رەق لێ زڤراند:-

- نە ترسە سوفی عەلی نە ترسە، تو نامری.. هندی ئەم خودانێت خوە وهەوە بین هەر دێ حالێ مە هوسا بت.. مانە بەسە ژینا سەرشوری یێ سوفی یوو؟؟

عالیا هێژ ژ بچویکاتی زیرەك و ب زەفەر بی. . . دگەل بابێ خوە دچوو نێچیرا پەز کویڤییا. . . گە لەك جارا هێژ تیروژکێت رۆژێ ژخەو، دچوو چیایێ بێخێریو دار د برین وگرێددان و ددا پشتا خوەو قەستا مالێ دکر. . ژنکێت گوندی ژێ دمان حێبەتیو مەندەهوش ئو سەهما وێ‌کەتبو دلێ هەمییا.

کەفیکا سەرێ خوە باش شداند. . . لەوەندیێت خوە گرێدان. . دانگێت کراسێ خوە ل ناڤ تەنگێ پێچان، ئو بغار ژ دەرێ شکەفتێ دەرکەڤت و قەستا گوندی کر ئێك تەرق نە دزانی ئەو بەرو بەرزیڤیت دریکا وێدا چنە وچ نینن چ خەم ژ ستریا نە دخوار«مال سەر دارێ دونیایێ من کی دی هەیە ژبلی تە مەرگ گوری‌یا من حەلوکێ»؟؟. .

مینا خیارا بهارێ ل سەر رویێ گول وگیای، خویهدانێ لەشێ وێ ونافچاڤێت وێ شل کربون. . جار جارا دا بدەستێ خوە هندەکێ ژێ زوهاکت وگەلەك جاران ژی ب لڤکا کە ڤنکا خوە. . هێژ ژ دویرڤە دیت، دویکێل وتەمە دینان یێت ب سەر گوندی ڤە دچن. . . بێ حەمد، ژ نیڤا دلی راهێلا ئاخینکەکێ «وەیلا ل منێ ئەزێ. . . مالێت مە ژێ سوتن. . نەوێروکا بو مە زیرەکن، ئەمێت دەست ڤالا وبێ چەك. . . هەیلا خودێ هوین کوشتین. .»

پێت خوە سڤك تر کرن. . چاڤێت خوەژ گوندی نەڤەکرن هەتا گەهشتێ. . . خانیێت گوندی، سەرو بن یێت بوین ئێك. . قویتێ وان بێ دسژت. . تەرش و کەوال یێت دخوینا خوەرا دگەڤزن. . قابکێت دوشکا وساچمێت توپا تژی کولانێت گوندینە. . ب دلێ مریو، هناڤێت کوزریو، ب چڤێت گری هێدی هێدی قەستا خانێ خوە کر. . ئودا قویتی یاهاتی خواری بسەر ئێکدا. . کاریتە ئەوزرە کاریتە یێت بوین چار پێنج کەر. .

باگوردانێ سەربانی، ل نیڤا حەوشێ قەت قەتە. . کەنتورا وێ یا بویکانی بێ، موشەکێ یا دعەردیرا بریە خوارێ. . . هێژ وەسا ب کول و کەسەر یا دخانێ خوە بێ وێرانکری دفوکرت، ژ دویر دەنگێ فروکا دلێ وێ قوتا. . . ب پێت بێ رح بەزی بو ئالێ کەهنیا ژنکا ل ملێ راستێ یێ گوندی، خوە ئاڤێت بەر کەڤرەك مەزن. . دوو فروکە دیتن بنزمی دگەل ئێك دفرین. . دەنگەکێ بێ قام تیژ ژێ دهاتن. . . هەر ل دورێت گوندی دولان وزڤرین، پاشێ بارێ مرنێ کاڤلێت گوندی رەشاندن وبکەیف خوە بلند کرن عەسمانی وەك دوو هالویێت تێر خواری وقەستا بنگەها خوە کرن. . عالیا زڤری ڤە گوندی، ل شوینا جهێ موشەکێ چالەکا چار پێنج گەز فرەه دیت. . یا ژێهاتی هەمە هەر دو دەستێت خوە بەری عەسماناڤە کرن وبدەنگەکێ بلند قیرکر«خودێ، بو خاترا قورئانا تە یا پیروز ئەو خێرێ ل سەر دونیایێ نەبین هندی هەنە. . ب چ هەق ئەم هێلاین بێ کولك وخانی؟؟ یاخودێ تو هەقێ مە فەقیرو ژارا ژ وان زالا بستینی. . .

یاخودێ. . یاخودێ. . . «حەلوکا منێ دایێ، دا بو تە بالولکەك شەکرێ چێکم»ل قوتیکا شەکرێ گەرا، ل ناڤ ئامانێت بێ رێز بەلاڤ کری دیت. . . سفرە کا نانی نان و دورك کرن «نوکە بچویك هەمی برسینە وەك تە حەلوکێ، بلا ئەو ژی بخێرا تە بخون. . ئەڤ نانە تێرا هەمیا هەیە. . !!»

زەرکا ماستی بچەنکلێ خوە ڤەکر وب دلێ شکەستیڤە رێیا شکەفتێ گرت«شکر ژ خودێرا چو زیان نەگەهشتە مروڤا. . . هەر وەکی بابێ من دبێژت: مالێ دونیایێ قرێژا دەستایە. . عەسل ساخیا مروڤایە. .»

رێکا چارێکەك سەعەتێ نەمابو دا بگەهت شکەفتێ سێ فروکێت دی ل دوڵ و نهالا دەنگ ڤەدان وعەسمان شلقاندن، عالیایێ کر غار دا بگەهت نهالێو خوە ڤەشێرت، لێ ئێکسەرئێك بدویڤ کەت، وخوە نزم کرێ ود توخیبێت ئورتەکا پێنچ سەد گەزیدە ددولا هنداڤ سەرێ وێ. . هەر جار دا بەرەکێ راکت وتێ وەرکت بێ فەیدە. . . پشتی تێر یاری پێکرین وعێجز بوی، دەڤێ دوشکێ لێ ڤەکر و مێرانیا خوە لێ دیار کر. . . لەشێ وی پرت پرت کر. . .

ئو قەستا ئالێ ئیرانێ کرو هەرددوکێت دی ژی رێیا وێ گرتن. . .

قوتکیا شەکرێ ل عەردی رشتیبو، خوینا سور دگەل تێکەل ببوو سفرەکا نانی وەك خو گرێدای مابوو. .

ژ دویرڤە دەنگەك دهات ونێزیك دبو:

ـ عالیا. . عالیا رەوشا ئومەر پیرا. . . تە چ مال ل من و خوە خرابکر. . ئێدی چەوا دێ هەدارا حەلوکێ ئێت. . . عالیا. . . عالیا. . .

ژ دەنگێ قیریێت ژنکا، حەلوکا نڤیستی ژخەو رابو، گوتە هەڤالا خوە چنویێ:ـ

ـ نوکە دەیکا من دێ ئێت ئو دێ بالولکەك شەکرێ بومن ئینت. . . ئەزێ کەم دو قەت، قەتەك بو من، ئو یێ دی بو تە بلانێ؟؟. . .

■ | چیرۆك ■

# هەڵوێست

● فوزية عزالدين ●

هەمیشــە جوی‌ـــای نیکچــوو، سەردانەهێنــراو، کوزەرە ریش و شەپــرزەبــوو. خوی وا پیشــان دەدا کە ئاگــای لە وردودرشتی نێــوان رۆژهــەڵات و رۆژئــاوایــە. مەگــەر خواش حەزی بکردایە یەك، دوو کتیبــوکــەی نهێنی بەربــاخەڵیشی پی‌نەبوایە. کە باسیش بهاتایەتە سەر باسی خواروەوی رۆژهــەڵاتی ئاسیــاو، برسی‌یــەکــانی ئەفــەریقــاو، ئەمــەریکــای لاتین ئیتــر نورەی کەسی نەدەدا. باســەکــەش بگــورایە هەڵدەستاو دەرویشت بویە توش هەرگیز قسەت پی نەدەبری.

کە چاوت پی‌کــەوت، سەرت سورمــا، باوەرت نەکــرد مروڤ بە پینج ســاڵ ئەوەندە بگوری، بەرەو پیربوونیش بوایە هەرنەیســە، بەڵام پاش پینج ســاڵ دە ساڵ گەنج ببیتەوە ئەوەت زور لەلا سەیربوو، نە ئەچوو بەئەقلتا.

هەقت بوو، ئیــوە چوار ساڵ لە کولیجی ئەنــدازیــاری‌دا پیکــەوە بوون. تو ئەوت هەر بەودەســتــە جلە چرچ و لوچــەوە دەبــینی کەوا دەقی پیوە گرتبوو، دەتوت پیوەی لە دایك بووەو، رۆژبەرۆژ لەگەڵیا گەورە بووە. توخوت لە دلی خوت دا دەتوت «رەنگە پیانەوە بنوی دەنا هەر دایکەنی‌و لەبەری بکاتەوە شتیکی لی‌دەگوری» هاوریکانی دیکــەشتــان بو بەزم دەیــان وت (وەلی دیوانەی سەردەمە... دەیەوی بەو بەرگەوە حەشربکریت) کەچی تو پیت ناخوش دەبوو.

سەر سورمــانــەکــەت زوری نەخــایــانــدو، بەحــوکمی ئەوەی کە ئافرەتی، زوو لە گرنگی جل وبەرگ و دەس بەخودا هینان گەیشتی، کەچی هەر دوو د لوروی «خــویــەتی خوی نی‌یــە؟!» تا دووربــوو دەتتــوانی تەمــاشــای بکــەی. بەڵام دوور، کە نزیك تریش بووەوە بە دزەنیگا نەبوایە نەدەبوو تەماشای بکەی، دزەنیگاش دوودلی ساغ ناکاتەوە

حەزت دەکــرد چاو ببــریتــە چاوی‌و، پر بەدل سەرنجی بدەیت «بەڵام کوا کەی ئەمە بو ئافرەتیکی لای خومان بە بی‌گیچەڵ بەسەر دەچی». ویستت خوت بە دایکتەوە بخلافینیت بوت نەلوا، دەنگی پیــی لەپیش خویــەوە دەهــات و وەك دەهــوڵ لە میشــکت دەنگی دەدایــەوە، هەتــا دەهــاتیش بەرزتــرو بــەرزتــر دەبــووەوە، سەرئەنجام قیروسیات لی‌کردو بە خوتت وت «گەورە کچ بەمەش هیچی لی‌نایە» ئنجــا وردە وردە چاوت هەڵبــری، سەرەتــا هەر پیــلاوەکــانیت لیــوە دیــاربــوون ئنجــا سەروتــرو سەروتر تا چاوت لەگەڵ چاویا یەکانگیر بوون، بزەیــەکی دا بەرووتــا، بەمــەش هەر دلت ئاوی نەخواردەوە. ناهــەقت ناگــرم، ئاوا تەمــاشــای هەر پیــاویــك ـ ناسیــاوو نەنــاس ـ بکەیت. ئەگەر هیچی دیکەشی لەدەست نەیەت ئەوا بزەیەکی ئاوات هەر ئاراستە دەکات «پیاوان هەمیشە بزەیەکی حازر بەدەستی ئاوایان پییەو، لە وەخت و ناوەختا دەیدەن بەرووی هەموو ئافرەتیك دا، بو هەمووشیــان هەریەك شتە، هەر ئەوەیە کە دەیزانین و دەیناسینەوە».

تا تو ئەم کیشــانــەو پیــوانــەیــەت کرد، ئەو بەتەواوی لە ریگەکەی خوی لای‌دابوو، دەستی بو چاك و چونی‌یەکی گەرم وگور خستبووە کار.

بو تو ئەوە قســەی ناوی، ئەو بو هەمــوو دوســت و برادەریــکــی دیکــەش هەروا بوو، ئاوا بەگــەرمــەوە پیشــوازی لی‌دەکردن بەتایبەتی هاوری‌و هەڤــالانی قوتــابخــانــە، خواخــوای بوو یەکیکیــان ئیشیکی پی‌بــکــەویــت یا کاریــکــی پی‌بــســپیــریت. ئەو سەرکــەوتنی خوی دەســەلمــانــدو خەڵکیش بەچــاوی ریــزەوە تەمــاشــای ئەو سیفــەتەیان دەکردو، بەلە خوبوردووییان بو لە قەڵەم دەدا.

ئەو بیــەرزایــە تائیــستــا سەد جاران خوی پی‌نیشــان دابــویەوە ئیستا خوت بەپیی خوت هاتبیتیە بەر لووتی ئەوە ئیتر هەڵیکە بو ئەو هەر مەپرسە.

سەرەتا کە گوتت (گواستراومەتەوە ئیرە) ئەوەندەی نەما شاگەشکە بیت. لە دەمیــك دا سەد کەرەت بە خیــرهــاتنی دەکــردیت. قسەکەی وەك هەڵــو لەدەم قوســتیــتــەوە. دوایــیش کە هەلــی قســەکــردنت دەست کەوتەوەو، وتت (هاتوین بەڵکو هەڵیبوەشینینەوە)، تەواو خاو بووەوەو، وەك یەکیك بە پەناگونی‌دا بدریت ئاوا گیژوویژ بوو، هەر ئەوەندە هاتە زمان بلی (ئنجاچی تیدایە وای دانی ماڵی خوت لیرەیە. ئیمە لە ئاستی تودا خاوەن ماڵ نین).

ئەم قســەیــە بوتــە کلیشــە، خەڵکی بەبی کیشــانــەو پیــوانە بەیەکی

دەفرۆشن و دەكرن، بەلام سەرنجی توی راكێشاو، بەخوت وت «تو بلێی ژن و مالی هەبێ یا هەر خۆی‌و، دایكە بیوەژنەكەیەتی؟!».

شەرم و شكوی كچێك هەرگیز رێگەی نادات لە شوێنی وادا لە كورێك بپرسێت (ئەری ژنت هێناوە یا نە؟!).

بۆیــە لەجیاتی ئەو پرسیــارە سەرنجێكی خێــرای دەستی چەپی‌و، دواییش دەستی راستیت دا بەلام هەر دلت دانەكەوت. ئێستا بوەتە باو، هەنــدێ پیــاو كە لە مالی چوونــە دەری ئەنگــوستیلەكــەیان دادەكەنن و لە گیرفــانی دەنین، لەبەر ئەوە بەخوتت وت «كێ دەلێ ئەمیش وای نەكردووە؟!... تو بلێی ئەمیش وای لێ‌هاتبێت؟!».

ئەویش دوای ئەوەی لە قســەكــانی بووەوە، یەكســەر لەخــوی پرسی‌بــوو «ئــەری بلێی شووی كردبێ؟!» بەلام ئەو پێویستی بەوە نەبــوو لەخــوت بپــرسێت، لێــك كردنــەوەی ژن وكــچ بو پیــاو زور ئاســانــە‌و، وەك لێــك كردنــەوەی كوروپیــاو زەحمــەت نی‌یــە. ئەنگوستیلەشت لە پەنجەدا نی‌یەو دایكیشت لەتەكدایە ژن ئەنگوستیلە ناخەنە گیرفان و، مێردداریش دایك ناخاتە لاتەكی خوی.

بێ‌دەنگی‌یەكــەتــان پتــر لە پێــویستی پێ‌چــوو، تو زووتر هاتیتەوە سەرخوو، گورج پرسیت (ئەی تو. تو ئێستا لە كوێیت؟). ئەویش وریابووەوەو، وتی (من دەمێكە لێرەم).

رۆشنایی‌یەك كەوتە دلتەوە لە دلێ خوت دا وتت «لــەمــە چاكتر نابێت، كەواتــە دەیــان ناسێ‌و دەتــوانێ یارمەتیم بدا» ئەویش ئەوساتە وای بەخوی دەوت «سەیرە... جاری واش دەبێ ـ خوشەویستی ـ رێی یارمەتی بگرێ... یارمەتی چی!. ئەمە پاروو لە دەم خودەركردنە!...».

بەدەم راچەلەكانەوە كتوپر پرسی (ئێ. ئێستا چیتان كرد... چی دەكەن؟!). تو وەلامت دایەوە (لە بەیانی‌یەوە هاتووین. بەرێوەبەری گشتی لێرە نی‌یە، دەلێن لەوانەیە تا دوای نیوەروش نەیەتەوە، دەلێن هەر ئەویش دەتوانێ فەرمانەكە هەلبوەشێنێتەوە، كەسی دیكە ناتوانێ دەستی لێ‌بدات.... ئەرێ بەراست تو دوسنایەتیت لەگەل دا نی‌یە؟)

لە وەلام دا وتی (ئا.ئا.. وایە، راست دەكەن... لەگەل هەندێ بیانی‌دا چوونەتە سەیری پروژەیەكی توی.... دەشێ تا یەك و دووی پاش نیوەروش نەیەنــەوە..
نانی نیــوەرو دەخــون ئەوجــا مەگــەر بێنــەوە). بەلام بە دەستی ئەنقــەست وەلامی پرسیــارەكــەتی پشت گوێ خست و، لەبری ئەوە سەیــرێكی ـ دەم ژمێــرەكــەی ـ دەستی كردو، وتی (هێشتــا سێ سەعات پتری ماوە. ئێوە چون ئەوەندە وەختە لێرە بە پێوە رادەوەستن... هەر بەسەر ناچێ لێتان. بو نایەن بچینەوە مالی خومــان؟!) سەرنجێكی دایكتی داو ئنجا وتی (هــەر بەتــەنهــا دایكــمــی لی‌یــە. منیش بینــایــەكی نوێ هەیــە دەبێ بچم وەریبگــرم... ئێــوە دەبــەمــەوە دوایی سەعــات یەك دیمــەوە شوێنتان و پێكەوە دەگەرێینەوە ئێرە... ئوتومبیلتان پێ‌یە؟).

دایكت پێی خوش نەبــوو بەلام شەكــەتی‌یــەكــەی لە وزەدا نەمــابــوو. توش هەروا، جگــە لەوەش حەزێكی ئافــرەتانە پالی پێوەدەنای برۆیت و لە نزیكترەوە ئەحوالی بزانێت. هەر بەچاو لەگــەل دایكتــا رێككــەوتن برون بو ئەوەی تەریقی‌یــەكــەشت بشاریتەوە بەلای گالتەجاری‌دا شكانتەوەو بەپێكەنینەوە وتت (جا ئوتومبیلمان هەیە تاپێمان بێ یانە؟).

ئەویش بەبێ هەوایی‌یــەكی دەسكــردەوە وتی (ئــەوە گرفتێكی گەورە نی‌یە.. دەفەرموون.. فەرموون.. خوم دەتان بەمەوە) دایكــت سەیــرێكی توی كرد. توش سەرنجێكی دایكت داو كەوتنــە رێ. ئەویش بەفــەرمــوو، فەرمــوو پێشتــان كەوت لە دەرگاكەی دەرەوەدا نەبێ وەستا تا ئێوە دەرچوون.

هەتا گەیشتنە ئوتومبیلەكەی، تو بیرت لەوە دەكردەوە، تو و دایكت لەدواوە، دانیشن یا یەكێكتــان بچنــە پێشــەوە. بەخوتت وت (خــو تاكسی نی‌یــە هەردووكمــان بچینــە دواوە. ناش بێ دایكــم بچێتــە پێشــەوە ئەو من دەنــاسێت. ئەی من بە چ هەقێكــەوە بچمــە پێشــەوەو شان بدەم بە شانی‌یــەوە؟!. هەق بێ‌و نەبێ چار نی‌یــە. وەك ئوتــومبیلم نی‌یــە خو دەبێ ئوســولم هەبێ‌ئەوئەوكــاتــە دەرگــای دواوەی بو دایكت كردبــووەوەو، خەریكی كردنــەوەی دەرگــای پێشــەوە بوو بو توش. هەتــا مال ورتەی لەگەلا نەكردن. لە مالیش هەر ئەوەندەیەی وت (تو.. ئەگــەر فەرمــانــەكەت پێ‌یە بمدەرێ خوم دەیدەم بە بەرێوەبەری گشتی. ئێمەش لەگەل میوانەكان دا بانگ كراوین بو نیوەروژ. نیــازم نەبــوو برۆم، بەلام كە وای لێهــات بچم لەوێ ببینم باشترە... ئەم كارانە وردەكاری پشت كالوسی دەوێ.) توش فەرمانەكەت دایە دەست. بردی‌و، رۆیشت.

دایكی كەوتــە مشــوور خواردنی شتێــك بو نیــوەروژە. توو، دایكــیشــت، بەتــایبــەتیش تو خوت، وەك یەكێــك لە خەو راچەلەكابێت بەچوار لای خوت دا چاوت دەگێرا، نەت دەزانی تەمــاشــای چی بكــەیت. بینای رێك وپێك و، دیكوری جوانی دەرگــاو، پەنــجــەرە. ژووری میــوان. ژووری نووســتــن. چێشتخــانــە. بار. تاخمی كریستــال و، تابلوو، گولــدانی

دەس هەلچن. فەرش و پەردەی لەگـەل یەك گونجـاو وتـاخمی موبیلەی بیـانی هەروا سەرت سورمـا. ئەوەنـدەت تاوتو کرد تەواو بیـزار بووی. حەزت دەکـرد کتیبیـك، گوڤـاریـك، رۆژنـامـەیەکت دەسکەوی خوتی پیوە خەریك بکەیت، چاوت بو کتیبخانە گیرا. نەبوو. هەوالت پرسی. دایکی وتی (کتیب و متیبی نی‌یـە). تاس بردیی‌یـەوە «ئـەم وکتیبی نەبی... سەیرە» داوای رادیوت کرد. دایکی وتی (دەمیکە تیکچووە. ئەوە تەسجیل. ئەوە ڤدیـو ئەگـەر حەزیـان لی‌دەکەی؟) لە دلی خوت دا وتت «بەم چیشتەنگاوە تەسجیل و ڤدیوی چی؟... باشە ئەی ئەم کابرایە بو بوەتە بەردی بن گوم. نە رادیو. نەکتیب. نە گوڤارو رۆژنامە؟!».

ئەو ئەو رۆیشتنـە رۆیشت گەرانـەوەی نەبـوو. دەستی بەرو دواتـانی بری. تا ئیـوارەیـەکی درەنـگ نەدەنگی هەبـوو نەرەنگ. بەمـەزەنـەی خوی هەلی‌گـەرانەوەی مالتان نەما ئەوجا هاتەوە. کە هاتیشـەوە لە کومـەلیـك پاکـانە پتر هیچی پی نەبوو. لە دواییش دا رووی دەمی لی‌کـردیت و. وتی (بـەیـانی کارەکـەت یەك لایی دەبیتەوە. ئەم شەویش پیکەوە بەسەر دەبەین مال مالی خوتانە. تا نانـی ئیـوارە خوراو. شامتـان کرد یەك دوو جار دایـکی تەنهـا کردەوەو. لەگەل ئەویش دا وتوویژیکی بوو. ئیوە حوتان تی‌نەگەیاند.

دوای نان خواردنیش ئەوخوی دزیـەوەو، چووە ژوورەکـەی خوی. دایکیشی پاش سویـدو، سوینـدکـاری شتنی تامـان و دەفـرەکـانی بوتو بەجی هیشت و، خوی پوو لە هاوشانی دایکت دانیشت. هەرچیـەیان دەهـات. تی‌نـەدەگەیشتی چی دەلین. کە لی‌بـوویتـەوە هاتیـەوە کنیـان ئەوان قسـەکـەیان بریەوە. ئەویش هاتەوەو، لە ریزەکەی تووە دانیشت. هەموو بەبی دەنگی تەماشای یەکترتان دەکرد. هەر هەمووشتان لە دلی خوتان دا بوسەردباسیك دەگـەران کوتـایی بەو بی‌دەنگی و تەمـاشـای یەك کردنـە بی‌واتـاو، بی‌مـەبـەستـە بینی. تو بەشینـەیی چاویکی دیکـەت بە مالـەکـەدا گیـرایـەوە. لە دلی خوت دا وتت «ئـەبی چەنـدی تی‌چـووبی؟!» بیـرت بو دەسکـەوتی مانگـانـەی خاوەنـەکـەی چوو. دەسکەوتی ئیـوەمـانـان هەر مووچـەکە نی‌یە. موخەسەسات و، ئوڤەرتایم و، خەلاتـانـەو، شتی دیکـەشە مووچەکەیت دەزانی. دەرچوویەك سالـن و ئەو دوای توش دامـەزراوە. ئەوە مووچـەکـە بالـەوی بوەستی. دەمینیتەوە ئەو دوایی. دەلین لەهەموو شوینیك وەك یەك نی‌یـە، بەدەس بەریـوەبـەرە، بەریـوەبـەریش تا بەریـوەبـەریش جیـاوازی هەیـە. پرسیاری ئەمانەت لی‌کرد، بەلام ئەم بەگەرمەوە وەلامی نەدایتـەوە، بگـرە هەر وەلامیشی نەدایتـەوەو، لەبـری ئەوە رای خوی لەسـەر دەربـری (ئـەوانـە هەمـووی بخـەیتـە سەریەك ئەوەنـدەی دەسکەوتی مانگانەی تەرەفروشیکی نەخویندەوار نابی. هەر باشیشە بەشی خەرجی رۆژانەی ناومالیش دەکا.)

سـەرت سوورمـا، بەخیـرایی چاویکی دیکـەت بەنـاو مالەکەدا گیرایەوەو، لە دلی خوت دا وتت «پیاو باشترە، دەتوانی ئیوارانیش بوخـوی لەلای بەلینـدەریـك کاربکـات لەوانـەیـە لە مووچەکەی پتـر یشـی دەسـکـەویـت.» ئنجـا پرسیت (ئـەی دوای دەوام کارنـاکـەیت؟) وتی (ئیـوارانیش هەر کاربکەم؟! چی‌بوو؟!) هەر پەشیمـانی کردیتـەوە، بو ئەوەی پیتـەوە دیـار نەبی بە بی‌هـەستی چاویکی دیکـەت بە ناو مالـەکەدا خشاندەوەو، بەخوت وت «ئەی ئیتـر ئەم نازو، نیعمـەتـە لەکـوی؟!». ئەوجـا قسـەکـەیت لە دل دەرچوو، بی‌دەنگ لیی‌دانیشتیتەوە.

ئەویش چوو ئەلبومیکی هینا، یەکسەر تی‌گەیشتی بو قسەکانتی لە کورتی دەبـری‌یەوە. دەیویست یادگارەکانی رۆژانی قوتابی‌یەتی زینـدوو بکاتەوە. یەك دوو پەرەی هەلدایەوە ئەوجا پەنجەی خستە سەر وینـەیـەك و وتی (گـەشتـە زانستی‌یـەکـەی دوکـان) قوتابیانی بەشـەکـەتـانی گشت تیـدابـوو. تودانیشتبـوویت و ئەویش بە دیـارتـەوە وەستـابـوو. تەمـاشـایەکی یەکتریتان کردو سەرنجیکی دیکـەی وینەکەتان دایەوە بزەیەك نیشتە سەر لیوتان. ئنجا پەنجەی خستە سەر کوروکچیك و، سەری بەتەواوی هینایە پیشەوەو، وتی (ئـەری پەیـوەنـدی نیوان ئەمانە بەچی گەیشت؟) وتت (نازانم.. لەکاتی دامەزراندن دا نەبی نەمیانم ـ پەنجەت خستە سەر کچەکە ـ دیوە ئیتر ئاگام لیان براوە). کەچی ئەو خوی هەلیدایەو وتی (دوو منـالیشیـان هەیە). پەرەیەکی دیکەشی هەلدایەوە. بەلام دایکت. کە تا ئەوکاتـە نقی لە خوی چنی‌بـوو، لەوساتـەدا بەبـاویشکیکی دوورودریـژو دەسکـرد سـەرنجی هەمووتانی بردە سەرخوی. ئەو وای‌زانی ئەوە هەلەو بو ئەم رەخساوە. گورج ئەلبـومـەکـەی دانـاو، راستـەپی هەستایە سەرپی‌و، وتی (دایکـە بەخـوا لەوە ئەچی ـ پوورم ـ خەوی بی. مانـدووە. جیگەکەی پیشان دەی باشە) هەر بەوگورجی‌یەش دانیشتەوەو، دەستی‌کـردەوە بە هەلـدانەوەی پەرەکان و سەرنج راکیشانی تو. دایکی‌و دایکت رۆیشتن دایکی گەرایـەوەو، دایکت بەجیمـا.

خەوت نەدەهـــات، بەڵام دوودڵ بووی نەت دەزانـــی بڕۆی یا دابنیشی. لەم وەرە وردەیا بووی، دایکت گازی کردی. کە تۆ داتـكـێـشـــا ڕۆیـشتی ئەو دەستێکی لەبـــەر ماو یەکێکی لەدوا، هەستایە سەرپێ و، هەتا لە دەرگاکەیشی ئاوا بووی هەر لەدواوە تەماشای کردیت.

دایکت تەماشایەکی وای جێگەکەی کردیت کە ئیتر پێویستی بەوە نەمێنێت بە دەمیش پێت بڵێ (بچوو لە شوێنەکەی خۆت ڕاکشێ) هەستت کرد بێدەنگی‌یـــەکـــەی لە خۆڕایی نی‌یـــەو، شتێکی پێیـــە. ئەوەبـوو ئاخـری‌یـەکـەی پاش بێدەنگی‌یـەکی کورت، بەڵام گران و قورس ئاوا درکـــانـــدی (هـــەق نەبـــوو بارگـرانی بخـەینـە سەر ئەم ماڵـە)و، ئیتـر لەکـورتی بڕییەوەو، لەســـەری نەڕۆیشت. زانیت چاوەڕێی قسـەیەکـە لەوەلام دا، وتت (ڕاست دەکەی، بەڵام باوەڕ ناکەم خۆیان لەبەریان گران بێت، ئەگـەر پێیـان خۆش نەبوایـە ئاوا بەگـەرمـەوە خزمـەتیان نەئەکردین.) بێدەنگ بوونەوە، ئنجا ئەو وتی (خزمەتەکەیان بێمەلامەت نەبوو) وتت (چۆن؟!). وتی (داوای تۆ دەکەن!) پرسیت (کێ وتی؟!). وتی (دایکی): زانیت دایکت لەبەری گران بووە. خۆشت سەرسام بووبوی، بەڵام وات بەباش زانی جارێ دڵی ئەو بدەیتەوە بۆیە وتت (ئنجا چی تێدایە، ناڵێن کچ پردە هەمـوو کەسێـك بۆی هەیە بەسـەریـا تێ‌پـەڕێت.. خۆ بەزۆر گلمـان نادەنـەوە). وتی (نـەء... بەڵام وا دروست بوو بێن و، لە ماڵی خۆمان دا ئەو قسەیە بکەن...)

ئەو شەوە تا دەمـــەو بەیـــان ئەنـوزتـان نەکـرد. ئەو تاوتـوی دەکـردو، تۆش هەر دەنگێشـاو، دەتپێوا. هەرچەندت دەکردو، دەکۆشـایت دەرێ نەدەهێنا. دەتوت (ئەگەر گشت مووچەکانی داوەتە ئۆتۆمبێل ئەی خانووەکەیە ئەو ناوماڵەکەی لەکوێ هێنا. ئەی بەچی ژیاوە؟!)، بۆت ساغ نەکرایەوە. سەرئەنجام گەیشتیتە ئەو بڕوایەی کە ئەمە تاسەر نابێت. ئنجا کە سەرینەکەت نایە ژێر سەر یەکسەر خەو زایی‌یە چاوەکانت.

بەیـانی زوو دایکـەکـەی دەرگـای پێگـرتن. دەیزانی شەوێ دایکت قـسـەت بۆ دەکا. چاوەڕوانی وەلامەکەی بوو. ئەویش تەراشی کردبوو، خۆی گۆڕیبوو.

دوای بەرچـــایی. تۆ هەمـــوو شت و مەکـــەکـــانی خۆتـــانت پێچـایـەوەو، هیچت بەجێ نەهێشت. کە داوای فەرمـانـەکەت کرد، ئەو دایکی بەتەواوی تینیان بۆهات و کەوتنە تەماشاکردنی یەك و سەرنج دانی ئێوە. ئیتر خۆی پێ‌ڕانەگیراو، وتی (تۆ هەر جانتاکەی دەستت بێنە.. کێ دەڵێ کارەکەت ئەمرۆش تەواو دەبێ؟).

دایکیشی هەڵیدایە وتی (کچم تۆ بۆ وا پەلەی هەنوەشانەوەی فەرمانەکەتە؟.. کێ دەڵێ ڕێوی نەهاتووە بەپیرتەوە... کەس نازانێ خێـر بە چی‌یـــەوەیـــە. پەلـەپـەلی چیتـە ڕۆڵـە؟) بەدەم قسـەکـردنیشـەوە خێـر خێرا سەرنجی دایکتی دەداو، بەتەما بوو ئەویش شتێك بڵێ، کە هیچی نەوت. ئنجا خۆی ناچار ڕووی دەمی لێکـــردو، پرسی (نـازانم بۆ مەسـەلـەکـە چیتـان کرد؟! ئەگەر... ئاخر دوایی بە پارەکاریش گواستنەوەی وامان چنگ ناکەوێت...).

ئێـــوە هەر دووکتـــان چاوتـــان داخستبـــوو. دایکیشت هەر ئەوەندەی وت (هیچ... جارێ لێی گەڕێین چاترە.) کە وتی (بـۆ؟!). ئنجـا دایکت مەسـەلـەکـەی لەکـۆڵ خۆی کردەوەو، وتەماشایەکی تۆی کردو وتی (ئەوە خۆیەتی خۆ منالْ نی‌یە.. بەخـۆی بڵێ بۆ.) دایکت ناهـەقی نەبـوو، نەیئـەزانی تۆ خوت دەڵێی. تۆ نەشەوو، نەبەیانی، هیچت بەو نەوت وقسەی دڵی خۆت بۆ نەکرد.

دایکی لە هەڵێکی وا دەگـــەڕا، ڕووی بکـــرێتـەوە. گورج ڕووی دەمی تێکردیت و وتی (کچم ئەئێمە لەتۆ هەڵكێشراوتر دەخوازین ئەتۆش لەئێمە باشتر شوودەکەی. خۆت کوڕەکە لە ئێمەش چاکتر دەناسی‌و پێکەوە بوون... ئێ خوانەیێرێ ئەوە ماڵ.. ئەوە خانوو.. ئەوە ئۆتۆمبێل.. لە هیچی کەم نی‌یە.. ژن نەبێ... بەخـوا هەقی بەســـەر هیچیشـــەوە نی‌یـــەوە، لە هیـــچیش دا نی‌یـــە.. لە ماڵـــەوە بۆ دایـــەرەو، لە دایـــەرەوە بۆماڵ... ئیتر بۆ ؟!)

تۆ تا ئێستا چاوەڕێی هەلێکی وابووی، بۆ وەلامێك دەگەڕای کوڕەکـە تێبگـەیێنی‌و دڵی پیـرەژنـەکـانیش نەشکێنی لێـرەدا بۆت هەڵکـەوت.. وتت (بـەخـوا هەر لەبـەر ئەوانـەی گوتت، دەنـا عەیبی دیکەی نی‌یە کوڕەکەت).

پیرەژنەکان قسەکەتیان بەنووکتە زانی، بەڵام ئەو لە فیکەی خۆی گەیشـت، سەری داخست و گیـانی نیشتـەسـەر ئارەقێکی خەست و، لیـنـج. دەستی برد جانتـــاکـــەتی هەڵگـــرت و وتی (فەرموون.. بابڕۆین.)

# خــــەوزڕان

- حسام حکیم -

شەوگار دەکشاو سات لە دوای سات شتەکان پتر لە ژێر باڵی تاریکییدا ون دەبوون. وەکو دەریایەکی بێسنووررووردە وردە هەمــوو شتـیـکـی تیـــادا نوقـم دەبــوو. . . لە کاروانی خەو بەجێمابوو. هەر لایەکی سڕ دەبوو وەردەگەڕایە سەر لایەکەی تری و پەنــای دەبــردە بەر هەمــوو ڕێگـایـەك بۆ ئەوەی خەوی لێبکــەوێ. . . بەڵام بێهـوودە بوو. بگـرەو بەردەیـەکی زۆر لەمێشکیدا ڕووی دەداو . . . لەناو گێژەنگی ژیانی ڕۆژانەیدا دوو چاوی ڕەشی گەش، لێرەو لەوێ دەر دەکەوتن. . (ئەم دوو چاوە سەریـان لێی شێـوانـدووم. . . وا دیـارە من یاری بەئاگر دەکەم. هەر ئەو دوو چاوە ڕەشانەی تۆ، گەرد و خۆڵ لە سەر بەهـاری ژیـانم لادەبـەن و کانیـاوی چێـژی جوانی لە ناخمـدا دەشلە قێنن دەبێ ی بنێم بە ناسکتــرین داوی هەستمـدا بۆ ئەوەی ڕوویان ێی وەربگێرم. . . ).لەو لایەوە پڕخەو هۆری خەو بەرز بووە و لە دڵــی خوێــیـدا خوزگــەی پێــی دەخــواست. . (کـوا نیش خەووم لێبکـەوتایەو. . . چیتر چاوە ڕەشــەکـانــی تۆ نەبــوایــە بە تیــشــووی کاروانــی خەوزڕانم. . . )شەوگار خۆی ئامادە دەکرد بۆ بە گژاچوون لە گەن گزنگی هەتاوودا. هەروەکو هەموو بەرەبەیانێك دەبەزێت و دەوارە ڕەشــەکـەی دەپێچێتـەوەو بە ناخی زەوییـدا دادەچۆڕێتە خوارەوە. ئەویش بە مێشکێکی ماندووەوە هەر ئەم دیوو ئەو دیـــووی دەکـــرد و. لە ئاوێنــەی پێلوکـانیـدا دوو چاوی ڕەش دەدرەوشــانــەوە. . . دەیــویــست ئەو دوو گۆمــە بریــکــەدارە ئەفسووناویە هەمیشە لە بەر چاوی بێت و بە مشت ئاوی لێی هەڵێنجێ و بیپـرژێنێتـە سەر پشکۆی ڕۆژگـاری ئاسۆردا کە لە ناخیدا سەری هەڵدا بوو. . . لە لایەکی تریشەوە دەیویست ڕوویان لێیوەربگێری و بۆ چەند ساتێك پشوویەك بدات و خۆی فڕێی بداتــە ناو شەپــۆلــە هێـمـنــەکـانــی شەوەزەنگەوە. . . بەڵام هەرکە ئەو چاوانە لە ئاسۆی هەستیدا مەلــەیـان دەکـرد، ئیتـر خەو دەبـوو بە خوزگـەیـەکی ئەزۆك و دەتــۆرا. . . ویـــستــی شوێـن پێی نووستن هەڵبگــری بۆی بگـەڕێت تاوەکـو چنگی لێگیـر دەبێت، ئەوسـا خۆی بدات بە سـەر دەست و پێـدا ولێی بپاڕێتەوە. . بەڵکو چی دی نەیکات بە نێچری دەستی خەوزڕان وەکو یەکێك بیەوێت لە بێژنگدا ئاو بخواتەوە، بەو جۆرە دەیویست لە بەر تیشکی ئەو چاوانەدا بۆ نووستن بگـەڕێت . . . لـە ئەنجـامـدا لە مانـدوو بوون بەولاوە هیچی تری دەستگیر نەدەبوو. . . پەل وپۆی لێ دەبڕاوو، لە سەرخـۆ چاوی تێدەبـڕین و باریکـە دوکەڵی وشەش ڕیچکەی دەبــەســت، . . . (دوور نیـیــە توانـیـبێـتم نیگـــاری زۆر شت بکێشم، بەڵام هەروەکـــو دەزانی تائێستـــا نەم توانیـوە نیگـاری چاوەکانی تۆ بکێشم. . . ).بیری لەو کاروانانە دەکردەوە کە لە ڕابـوردوودا ئەستێـرەیـان دەکـرد بە نیشان بۆ ئەوەی لە تاریکە شەودا ڕێـگــایــان لێی ون نەبێت. . . (منیش هەروەکـــو ئەو کاروانـانـە چاوو دەبـڕمـە چاوەکـانت، تاوەکـو دەگەمە دورگەی مەبـەست، . . . بـەڵام بڕوا بکـەو دڵنیـاشم کە نە چاوەکانی تۆو نەهەموو ئەستێرەکانی ئاسمان. ڕێگای ئەو دورگەیەم نیشان نادەن. . . )

# ئەو مشکەی ویستی ببێت بە شێر

نووسینی: حەکیم نوری

## پێشەکی

ئەم چیرۆکە، بەو شاعیرە پێشکەشە.. ببوورن بەو «نیمچە شاعیرەی» کە هەر ئەوەندە رۆژگار هەلێکی بۆ رەخسان و نیمچە لێپرسینەوەیەکی ئەدەبی پێ سپێررا ئیتر با ئەچێتە لووتیەوەو ئاڵۆزی دەروونی خۆیمان بۆ دەرئەکەوێت لەبەر ئەوەی بڕوای بەخۆی نییە بە راست و چەپدا ناو ناتۆرەو جمێنی بازاری سەر شەقامەکان لە ئەدیب و نووسەران دەگرێ، مشك ئاسا دەبێتە مایەی بڵاوبوونە وەی تاعوونیو پەتا ئاژاوەو دووبەرەکی لەنێو ئەدیب و نووسەران دا کێو بەر مێرووله دەدەن و هەرخۆی بە تاکە سواری ئەدیب و نووسەران دەزانێ لە شیعری خۆی بەولاوە کەس شیعری چاکی نییەو هەموو کرج وکاڵ و رزیون. رەنجی شاعیرو شەونخوونی نووسەرانی شەیدای وشەی بەشەرەف لەکەدار دەکاو ورەنج و وەنەوزو شەونخوونیان بە دەم باوە دەدات.

کە لێیدەپرسی: بەرهەمی فلانە شاعیر یا فلانە چیرۆکنووس چۆنە؟ بە لالووتێکەوە وەك کلیلی بوونە ئەدیب و نووسەر بە دەستی ئەوەوە بێ ئەڵێ: هەر هیچ نییە. ئەی شیعری فلان شاعیری لووتکەی خوا لێخۆشبوو. ئەو شاعیرە کە بە شانازییەوە مێژوی ئەدەبی کوردی ناوی دەبات ئەرێ چۆنی دەبینی؟ کەی شیعرن.. شیعری ئەم سەردەمە نین و رۆژگاریان بەسەر چوون.

- ئەی چەند پارچە شیعرە کاڵ وکرچەکانی جەنابت؟

- شیعری هاوچەرخ و لووتکەن و ئەدۆنیسێکم بۆ خۆم.

ئەم نیمچە شاعیرە دەمێکە وشك بۆتەوەو هیچی پێ نەماوە هەموو نووسینێکی ئەمرۆی ئەو نوقرچ و قەپاڵ گرتن و جوێنی بێسەلیقانەیە.. جوولەکەش کە مایەی نەما بە دوای دەفتەری کۆنا دەگەرێ.. بەڵام کەس بڕوا بە دەفتەری کۆنی ئەو ناکات.

جا بۆیە چیرۆکی «مشکە بۆرم» پێشکەش بەو کرد چونکی رەوشت و کرداری ئەفەندییەکەی لەمەر خۆمانیش لە مشك دەچێ هیوادارم چاك بیخوێنێتەوە. بۆ ئەوەی بەباشی لە خۆی بگات و بەخۆیدا بچێتەوە پێش ئەوەی ئەنجامی مشکە بۆری تووش بێ رۆژێکیش دێ ملی بامیە ئاسای لەناو پاشماوە گەنیوەکانی سەر نۆیلکەکاندا دەبێتە خواردنی مشکانی تری هاورێی ئەو ئەدیب و نووسەرە بەرێزانەی کە بەر قەپاڵ و نوقرچی کەوتوون کلکی دەگرن و دەیخەنە سەر سەرەنۆیلکەی لە بیرچوونەوەو لەژێر چەمۆڵەی ئەدیبان دا دەپلیشێتەوە.

سەرەنوێنکەکە پریەتی لە نانە رەقەو چێشتی ترشاوو پلەگۆشتی بۆگــەن. مشـەیـە. . بەڵێ بۆ مشکـە بۆر مشـەیـە لە کونێکـەوە سەر دەردەهێنێت. . چاوەکــانی دەتـر ووکێنێت و، تاڵـە مووەکـانی سمێڵی دەلەرێنێتەوە. بە «تەوژمی هۆش» بێئەوەی دەم بکاتەوە، لە مێشکی خۆیدا دەڵێـت «ـ دەك خوایـە لێت بە زیــاد بێت . . ئەم هەمــوو خواردەمەنی‌یە چەورو بە تامەت بەم سەرە نوێلکەوە بەخشیوە واتە ئەم نیعمــەتــەت بە من بەخشیـوە!. . با چاو بگێـرم. نەوا زەلامێـك، ئاژەڵێـك، درنـدەیێـك کە بێت و لە سەرەنوێلکەکەدا ئازارم بدات. . خواردنە خۆشەکانم لێ تێك بدات. . ئاخ خوایە گیان، بۆ ئەوەندە مشکی بەستــەزمــانت بێهێــزو بێدەستــەڵات درووست کردووە؟ هەمیشە دەبێت لەم کون بۆ ئەو کون پیشەی بێت دەرفرتێنی‌و، خۆمان حەشار بدەین. ژیانمان هەمیشە لە کون و کەلەبەردا بەسەر بەرین. هەرگیز چاومان بە خۆردا هەڵ نایەت. . بەڵام خوایە گیان دەزانم بە یەکجــاری لایــەنی ئێمــەت بەر نەداوە، ئێمـەش دەتـوانین تۆڵـەی بێدەستەڵاتی خۆمان بکەینەوە. ئەوەتا بەئاسانی نەخۆشیی تاعوون و زۆر شتی دیکە بڵاو دەکەینەوە. . بەو هۆیەوە دەیسەلمێنین ئێمەش بە هێزین و، دەتوانین ئازاری‌خەڵکی بدەین. کۆڕوکۆمەڵی هاوڕێ‌و دۆســت و یارو یاوەران تێــك دەدەیـن و، شارستــانی‌یــەت تووشی ئاشـووب و ئاژاوە دەکـەین!. . ئای خودایـە لە داخی بێدەستـەڵاتی‌و بێنرخیمان دا، دەروونمان چەند گرێ‌گرتی‌و ئاڵۆز بووە!»

بە ملە قوتێ کەللەی لە کونەکەوە دەردێنێت. . دەی‌باتەوە ناوەوە. . دەری دێنێتەوە. بەگوێی قیتی‌یەوە، پاش ئێستێك. . شان و ملی تا ناو قەدە لووســەکـەی دەردێنێت. چاوە بزەکـانی وەکو ڕوانگە دەگێرێت. سووەکانی سـمێڵی کەمێك لە زەوی‌یەکە دەخشێنێت. لەپڕ لە خشپەیێك ڕادەچڵەکێت و، خۆی لە کونـەکـەی دەخـزێنێتـەوە. . بەڵام بۆگـەنی چێشتی ترشــاو ئارەزووی دەورووژێنێت و لیکـاوی پێ دەرێـژێت. خۆی پێ ناگیرێت دیسانەوە لە کون سەری دێنێتە دەرەوە. . «ئۆی بە خودا منیش یەکجــار ڕێسنۆکم!. . کورە خۆ ئەو خشپـەیـە هی ئەو مارمێلکە بێ بایەخە بوو. . دەبەسە، با بێمە دەرەوە.»

بە فرکەیێك خۆی گەیاندە چێشت و گۆشتی کیف کردوو. . دەمی تێ ژەندو، لووتی تێ نا. لە مێرووجرو جانەوەرە بچکۆلانەکانی ئەو ناوە بەهێــزتر بوو. . بۆیە هەموویان لێی دەترسان و، ملی ڕێزیان بۆ کەچ دەکـرد. هەواو فیز ختوکەی گیانی‌دا. بە چرنووکەکانی کەمێك لرۆتە چێشتــاوی‌یەکەی خوراندو، بەخۆی وت: «کورە من تا ئێستا بە خۆم نەزانیبووە!. . وا دیارە من زۆر بەهێزم. . جێگای ڕێزی هەموانم. بزانە ئەم گشتــە مێش و مەگــەزەی سەر ئەم خوانــە چەورە، چۆن لێـم دەتـرسـێن!. . بەم لاو بەولادا هەڵ دەفرێن و ..ڕێم بۆ دەکەنەوە!. . بەڕاستی من بەهێزم.»

دەمی لە چێشت و گۆشتە گەنیوەکان ژەندەوە. ورگی بەرزبووە، پاش دوو سێ قرقێنەی عافێت، هەستی بە بەهێزی‌و دەمار پتەویی خۆی کرد. بیرێکی کوت وپڕ بە مێشکی‌دا هات. . «ـ تۆ بڵێیت من شێر نەبم؟. . .

بەڵێ بەڵێ من شێرم لە غەبغەبەی ملم و لۆچ و شولاوگی ورگم ورد بنـەوە. . چۆن بەســەر یەك دا کەوتـووە! ئەی کلکم؟. . ئەهـا چەند درێژە!. . تەواوە هەر کلکی شێرە!»

خۆری چێشتـەنگاو سێبەرێکی درێژە زەلامی بە لەشە بچکۆلەکەی بەخشیـوو. لە خۆشی‌دا قریوەیێکی کردو بە زیکەزیك وتی: «خەنکینە. سەیـری سێبـەرە زەبـەلاحەکەم بکەن. . بێ‌شك من شێرم و، ئەمەش سێبەری شێرە.»

بە هەموو هێزی‌یەوە زیکاندی. . «ئا ئەمەش نەرەی شێرە.»

بەخۆی وت: «بەڕاستی من زیرەك و زانام!. . بزانە چەند زوو بە خۆمم زانی کە من شێرم!» ئەمجا شێر ئاسا دەم و کەللەی ژەندەوە پلە گۆشتەکان، ئەوەندەی خوارد، گەدەی ڕەوایەوە. . سکی ئاوسا، ئامانی لێبـڕا! مێشکی بە تەمی زۆر خۆری گیرا. . بیروهۆشی تیکەڵوپیکەڵ بوو، باری ڕاستەقینەی خۆی لێ‌گۆڕرا. . بە بێ‌شك، خۆی بە شێر هاتە بەر چاو.

بڕیاری‌دا بەرەو دارستانەکەی خوار سەرەنوێلکەکە بکەوێتە ڕێ. . «ـ دەبێت ئەو شێرەی لەو دارستــانەدایە. . لووتی لە قوڕ بچەقێنم و، بیکـوژم. . بۆ ئەوەی خۆم بە پادشای دارستان ببم!» وەك نەڕڕە شێر کەللەی بڵنـدکـردو، کلکی بە قەف کراوی خستــە سەر پشتی‌و بەرەو دارستانەکە کەوتە ڕێ. ورگی، بەو گشتە خواردنەوە. . وەکو مەشکۆلە دەهات و دەچوو.

ئەی شێرە بەستەزمانەکەی دارستانەکە، هەتا زووە خۆت بشارەوە. . ئەوا (مشکە شێر) بۆت هات. بەڵام بە گەیشتنی مشکە شێر. . ئای چ کارەساتێکی جەرگ بڕ ڕووی دا!!

مشکی لە خۆبــایی. . لەگــەڵ پێی نایــە دارستــانــەکـە، شێرە ڕاستـەقینـەکـەی لێ پەیـدابـوو، ئەمیش لە ترس دا بۆ کونێکی نزیك ڕای‌کرد. . بەڵام ئەوەندەی خواردبوو بە کونەکەدا نەچوو.

کە شێرەکــە زۆر بێبــایـەخـانـە پێیێکی پێ دانـا، هەر ئەوەنـدە فریاکەوت. . لەناو جەستەی تێك شکاوی‌دا دووجار هاوار بکات. «زیك، زیك.» ئیتر هەموو شتێك برایەوە. . لەژێر چەمۆڵەی شێرەکەد پان و پلیش بووە.

* * *

■ چیرۆك ■

# سەرگەردانی تاوانێك

احلام منصور

وەرەکچی . توراویت؟ نەخێر . نەخێر دوور لە من و دوورلە تو لەچاوی ئەو کەسە کوێر بێت کە هەمیشە سەرنجەکانی قولابی هەنگاوەکانمانەو بەدوای دا وەکوو سەگ دەکەوێت و ناوبەناو دەحەپێت و دەوەرێت دوور لە چاوانە کە ئەشکەوتێکەو دەردە سەری و سەرلێشێواوی و پەشوکاوی هەردووکمان تیای‌دا نێژراون.

وەرە کچی سەرت بخەرە سەر سینگە رووتەکەم و تێر تێر بگری‌و با بەپەنجە خاموشەکانم یاری بە مووە سپی‌یەکانی سەرت بکەم و بیانلاوێنمەوە . مەتوری هەی لە خوم ( . . ) تر . سە من . . خو گوێت لێیە چاوت لێیە گزنگی هەتاو ئیمەو میوانمانەو موژدەی گەردوونی لەنێو چاوی هەتاو دزیوەو بەدیاری بو توی بێ دڵ و بێ هەتاو هێناوە . مانگە شەویش پاسەوانمانە لەچی دەترسیت؟ ئاخر توێەکی چاو قایە ئاخر دەسە نەکەرەوە با . . . تو تو توێت؟ خوتیت ؟ ئەی بو نینوکەکانت وەریون؟ سزایای دایت؟ دیسان لەسەر پردە بزماری‌یەکە رۆیشتیت؟ نە . . نە بەبێ من چون دەرۆیت؟ بونت زور خوشە بەڵام با بەکانیاوی فرمێسکەکانم خوت و تاوانە تازەو کونەکانت ئەوانەی کە مەیوون و بەئاگری دڵی من دەکوڵێن و دەبنە هەڵم و بەر چاوم دەگرن بشومەوە ئنجا . . بو کفنی خوت بەدەستی خوت هێناوە؟ مەگری ئەمجارەیان نابمە موتەکەو عزرائیل لەسەر سینگە رووتەکەت دا نانیشمەوە رێ نادەم میروولە چاوە کزەکانت بخوات دەترسم

رێچکە بیەستن و سومای چاوەکانت بمژن . . نە گوشتە نەرمەکەت نابێتە خوراکی کرم لاوازو لەر بوویت مەگری هو . شوانێکم لە گەڵ خواوەندی تاوانەکانت بەیەکەوە بو شەیتان نوێژ دەکەین.

کچی تو زور بەرەڵلاو بێ دەربەست بوویت هەمیشە عارەقی شەوانی نامویم مەستی دەکریت و ورێنەیشت دەکرد کەچی من لەو قسانەت هەر تێ‌نەدەگەیشتم خوزگەم بەو شەوانەی‌لە دوو توێی دا وەکوو لێفە کوی دەکردینەوەو یەکترمان دەگرت و وەکوو بەفر دەتواینەوە.

وەرە کچی لە ئامێزی تەنووره گرەکەت بمگرەو بمشارەوە لە نێو زیندە خەونەکانت لە نێو وێرانە خاکی دڵت چاڵێکم بو هەڵکەنەو بەئەسپایی و پێڵووی چاوە کزەکانت بمپوشە مەرو وەرە لام ئەو ئەو سەگبابە تازەیە دیسان فریوی داوی‌و سینەی چاوەکانتی کردوتە کفن و فرمێسکەکانتی پێچاوە؟ لە نێو دارمەیتی دڵت خەونەکانتی زیندە بەچاڵ کردووەو تویش دەبا . . وا دەزانیت لەسەر بەرماڵی خوشەویستە میهرەبانەکەت دا نوێژ دەکات؟

بەئاوی چاوەکانت دەست نوێژێکی هەمیشەیی دەگریت؟ سەرتاسەری ژیانی لە دوورو نزیکەوە بەردە بارانی حەزو تاوانە سەرگەردانەکانت ناکات؟ وەرە لام و رابووردووت لەنێو ئەم دڵە بوخچەیەدا بپێچەوەو لەنێو بیری یوسف دا ئەیشارینەوە.

وەرە لام و تفێکی خەست لە رووی ئاوێنەی روزگارت بکەو پەل و

پۆی تاوانەکانت بەمەقەستی داهاتووت بقرتێنە و با گەڵای حەزە کۆنەکانت بوەرێن و لە نێو تەنەکەی بەر دەرگای کڵێسەکان دا لاڵ و کەڕ بن و بەئەلالویای قەشە تاوانبارەکان سەوز نەبنەوە.
وەرە کچێ مەست بووم و یادی شەوانی جاران بۆتە بەنزین و بڵێسەی ئاگری‌چیلکەی داهاتووم بەرز دەبێتەوەو تاریکی‌ی ئەم شەوە ترسناکەم ڕەش تر دەکات یادێکم دەوێت قەترانی‌ی شەوانی ڕابووردووم سپی کاتەوە
هەی هاوار لە دەستی تۆولەو دۆزەخەی کە شەوو ڕۆژ لە نێو ئاگری دا نوێژ دەکەم و نە دڵەوە بە سرودێکی دێرین نووشتەیەکی هەمیشەییت بۆدەنووسم و کارەساتی ژیانم دەبنە زەنجیرێکی زێرین و خاچ و لە ملتی دەکووتم . . ئا. . سەرنجەکانم وەکوو بزمار تیژن، نەمەترسێ خوێنە مەییوەکەت دەستەکانم ناشۆنەوە تۆیش کە هەموو ڕۆژێ هەتاوی ژیانت ئاوا دەبێت و بەرەوماڵێ دەگەڕێیتەوەو ناوبەناو ئاوڕ دەدیتەوەو وا دەزانیت تاوانەکانت بەسەر ڕێ‌و شۆستەو شەقامەوشکە کان دەبارن و دەبنە درك و منیش وەکوو سەگ بۆنیان دەکەم و لەسەریان دەڕۆم و دەنووزێمەوە نە ناوەڕم دەرگا ئاسنینەکەی باغچە گەورەکە دادەخەیت و دەستت لەسەر دڵت دایەو نەوەك دووبارە سەرنجەکانی دایکت بینە تیشکی ڕادار و بەبێ تەل هەواڵەکانت وەکوو ئاژانس بڵاو بکاتەوەو دووبارە لە نێو هەمان ئاگردانەکەدا بتسوتێنێت و نامە گومان لێکراوەکانت لەگیرفان وکە نتۆرە شکاوەکەت دا دەربهێنێت و لەگەڵ پاشماوەی نووسینی دوێنێ و پێری وپەستر پێرێ وساڵانی ژوانمان دەربکات و بەتانە توانجە ژەنگاو سواوەکانی مەقەستیان لێ بدات و وەکوو خەڵۆز بەسەر سەرت دا بیانبارێنێت و خۆت و خوێن و وشەو مەرەکەبە سوورە وشك بووەکەی نێو دەروون و ئێسقانە هاڕاوو تونێلی ماسولکەکانت تێکەڵێ یەکدی دەبن و بە چرنۆکێك جەرگە ڕەشەکەت دەربکات و بەئاغزە جگەرەی تووڕە بوون و تینۆیەتیی خۆی نێچیریکی تۆ ئاسا بچزێنێت.
هەڵمەچۆ جارێ زووە ئاگری دەمی دایکت هەموو شەوێك نوێنە گومان کراوەکەت دادەگیرسێنێت و دەبێتە مەقەڵەو تۆیش تەنیا بەبێ دەنگی دوو دڵۆپە فرمێسکی سوێری پەشیمانیت دەبێتە مۆتەکەو خەونە ڕەنگینەکانت لەناو دەبات و لەسەر سینگت دەنیشێتەوە و هاوار هاوار دەکەیت و تۆبە وەکوو ڕێ‌وبار لافاو دەکات و تۆیش نەنە نایکەم مەمخنکێنن نەنە توخوا و ڕادەچەڵەکێیت وبە ئۆخەی ئۆخەی دڵە مردووەکەت گەرم دەکەیتەوەو یادی شەوێکمان دەبێتە هێلانەی ئارامیت و پەیژەی نیگەرانی پاڵ ئەداتە سەر پەرژینی سەربانەکەت و ئاسمانیش بەبێ‌دەنگی خەونە ئاڵۆزکانت دەمژێت و ئەستێرەکانیش دڵنیات دەکەنەوەو وا دەزانیت بۆ سبە بە چیرۆکێکی سادەو کاڵ بەرز دەبیتەوەو لەگەڵیان دا دەدرەوشێیتەوەو منیش لەدوا ڕۆژدا لە یەخەی خۆمت دەدەم. . بەڵام ئیمشەو تاوانێکی سەرگەردانت میوانمە وەکوو هەورێکی سووررو چڵکن و مانگرتوو یاخی بووە ، چەن هەوڵ دەدەم بەتیری سەرنجەکانم جەرگی لەت لەت بکەم و زوخاوی بەسەر سەرم دا بیبارێتەوە بمشواتەوە. مۆمی ئەمشەوەیشم توایەوەو لە سووچێك دا دانیشتووم وخوێنم وەکوو بەفری سەر چیاکانت مەیوەو درکی نائومێدیم دەچەقێتە بن پێیەکانم و نە بۆم هەیە .
ئارام بگرم و نەبۆم هەیە باڵ بگرم هەورە چڵکنە تاونبارەکەیش هێدی هێدی دەبێتە چادری‌و وەکوو ـــە راب تەکانی بۆ دەبەم و لەپڕ دوور دەکەوێتەوەو پێم پێ دەکەنێت و دەورووژێمەوە بەرز دەبێتەوەو بەقاقای پێکەنینی بەرزی سەرم لێ دەشێو ێنێت و منێکی پەپوولە شەیدای ئاگریم و نابێتە ئەسپ و لاغاوی خۆی بەدەست نادات ، سواری نابم مەترسێ هەمیشە هەر قەشەکەی جارانتم و تاوانی داهاتووت بەبرژانگەکانم دەماڵم و تۆوی تۆبەت ئەچنمەوە و بەبارانی شۆڕش و هەڵچوونی خوێنم ئاودێری دەکەم بەڵکوئێە گوڵێ موژدەت بداتی‌و خۆش بەحاڵت

هاڕراویت بەهەناسەی ساردی شەوانت منێکی ئاشەوان غەمەکانم دەهاڕم و خۆم بەدەمی زریان و ڕەشەبای داهاتوو یەکی تەم و مژاوی دەدەم و وشەکانم دەبنە کاروان و لەدەرگای تاوانەکانت دەدەن و وەکوو توتکە سەگ دەنووزێنەوە و بەئاوی چەڵکنی زێرابی حەزەکانت گلاویان دەکەیت. ببوورە هەڵچووم.
کاروانی وشەکانم ئاو گلاو نابێت سەگەکان هەموو شتێك گلاو دەکەن وریا بە نەکەوێتە ژێر ددانیان و گۆشتە تاڵەکەت بجۆین و ئێسانت لە گۆڕەپانەکان دا فڕێ بدەن و کاروانی مێرووله‌بیکاتە پرد ولە سەری بڕوات خۆیشم نازانم چی دەڵێم نازانم ماویت یان مردوویت؟ زۆر دەترسم کوت و پڕ دڵی هەردووکمان بوەستێت و خوێنمان بگەنێت و دارە مەیتەکەمان قورس بن و کەس نەتوانێت خۆمان و تاوانەکانمان لە سەر شانا هەڵگرێت و ئاوی مزگەوتەکان مان بگرن و تەنەشوورەکان هاوار بکەن وئەم ئەو بەتفیکی خەست و بە حەوت بەرد بەڕێمان بخەن و گۆڕەکانیش دەرگای خۆیان لە ڕوومان دا دا بخەن.
ئایا ڕوومان هەیە؟ بە چ ڕوویەکەوە ڕوو لە ڕێی‌ڕۆ چوون بکەین و ڕووچینە نێو ناخیانەوە؟ ناخی کێ ئەو ناخانەی کە دۆزەخ بوون و ئێمە وامان دەزانی منداڵ دانی دایکمانە و کەی بمانەوێت تیای دا خۆمان دەشارینەوە؟چەن جار هەڵ خەڵەتێنراین و چەن جار لەسەر بەتی درۆ یان یاری یان پێ دەکردین و وەکوو یاری زانەکانی سێرك جەستەمان بەرگری هەموو جۆرە کەوتنێك دەکردو بینۆشە!
ئاوی تاوانەکانت بنۆشەو لەسەر لەپی دەستە چەپم لەتر بدە وا خەریکە پەڵە هەورەکە تفم لێ دەکات و دەڵێت:
- چی دەکەیت وا لێرەدا بەتەنیا لانە لیز بوویت و داوێنی پاکی خۆشەویستەکەت بە داوی قێز دەدوورن و بەنووکی دەرزی‌یەکانیان

پفکەو تۆقڵەکان دەتەقێنن برۆ . . برۆ . . هەموو نەخشە چرەکانی وون بووە ڕێگاو بانی منیش لە نێو بازنەیەکی بەتاڵ دا بەرهەڵستی دەکەم ئارامم گرتووە جگەرەی نێو لێوەکانیشم ناوبەناو ئازار و خەمڵی و نیگەرانیم دەمژێت سەرم با دەدەم نازانم بەرەو چ لایەك هەنگاو بنێم بازنەکە وەکوو زنجیر بەیەگجاری سەرتاپا حەشاری داوم بۆ مناکری پاڵ بدەمەوە و لەژێر سێبەری خۆم دا خەونێکی تازە ببینم

هەموو شەوێ خەون بە تاقیکردنەوەی بەکالۆریا دەبینم ناتوانمەوەڵامی پرسیارەکان بدەمەوە. زۆر جار بێ ئەوەی وانەکان وەکوو تووتی لەبەرکەم و بێ پێناسنامە و بێ ئەوەی ناوم لەسەر تەختەیەك دا بنووسرێت بەرەو هۆڵی تاقیگە پەلەکێش دەکرێم و بەرامبەر بەکاغەزە

سپی‌کان دۆش دادەمێنم و چاوەکانم دەنووقێنم و دەم و چاوم زەرد دەبێت و گری‌یە ئاڵۆزەکانی ناخیشم پەرە دەسێنن و زمانم تەتەڵە دەکات و لە پڕ بە شەقە زلەیەك وەئاگادێمەوە. نازانم چۆن ئەم خەونە ئاڵۆزە ترسناکانم شی بکەمەوە؟ ناشزانم بۆ هەموو شەوێك دووبارە

دەبنەوە؟ جاری وا هەبوو بۆشەشی سەرەتایی دەگەڕێمەوە و پێم سەیرە چۆن زانکۆم تەواو کردووەو بڕوانامەیان داوەتێ و دووبارە تاقیم دەکەنەوە .لە بازنە ڕەشەکەدا سەرە بەتاڵەکەم وەکوو بێشکە بۆ

لای چەپ و ڕاست ئاوڕدەداتەوە و لە تاریکی زیاتر هیچ دیمەنێکی ئەو تۆ بەدی ناکەم بنمێچیش نی‌یە تاکوو چاوەکانم پێ ببڕم و نەختێك بەخۆم دا بێمەوە.

لەبەر خۆم هەر دەڵێم و سروودە دێرینەکان دووبارە دەکەمەوە:-

- تو بڵێی من لەنێو ئەم بازنە بەتاڵەدا بوگەن بم و هیچ پەنجەرەیەك نەبێت گەردوون بە دوو چاوی خەواڵووی تەماشایەکم بکات و هەواڵی ئەم و ئەوم پێ بگەیەنێت دەمێکە لەم بازنەیەم هەڵبژاردووە بەڵام نەمدەزانی بواری هاتنە دەرەوەم نی‌یەو ڕەنگە ڕۆژێك بێت لەپڕ لەسەر سنوورە خڕەکەی‌دا وەکوو تەنوور گۆڕێك بەرز ببێتەوە و تیای دا بە سووتاوی زیندەبەچاڵ ببم ! ئەی گۆرانی یەکانم؟ خۆ تا دێت دەنگم گڕ تر دەبێت و وشەکان هەراسانم دەکەن و زنجیری ئەم بازنەیە دەتوێننەوە و سەر لەنوێ بە ئاهێکی ساردم بەیەکا دەچن و قایم تر دەبن . . بەڵێ زنجیرەکانیش هەڵدەوەشێن و لەیەك دەترازێن وسەر لەنوێ بەیەکا دەچن کەچی من وەکوو خۆم دەمێنمەوەو خەونە ئاڵۆزەکانم بەپرسیاری بێ‌وەڵام پڕ دەبن وسەرم دەپەنەمێ بەقەدگۆی‌ی زەمین دەبێت و هەموو کانزاکانی دەتەقێن و لەبیلبیلەی چاوەکانمەوە دەم و چاوم سواغ دەبێت خۆ هەر من نیم زۆرکەسانی تریش هەن هەریەکەو بازنەیەکی تایبەتی بۆ خۆی هەڵبژاردووە و تیای دا ئارامی‌گرتووە. ئەوان دەوێرن پەنجەرە داخراوەکانیان بکەنەوەو کۆترەکانیان بەرەو ئاسمان بەرەڵڵا بکەن و بەرەو مزگەوت و کڵێساکان

دا ڕەوانەیان بکەن و داوای هەندێ نامەو هەواڵی سەیر سەیریان لێ بکەن وئنجا بەشەقەی باڵی ئەو کۆترانە دەرگاکەیان بکەنەوە ئێ چیم داوە لە ئەم و ئەو؟ ئەوان لە هەموو شتێکیان دا سەرپشکن بەڵام من تەنیا لە نێو بیرکردنەوەیەکی بێ دەنگ دا دەتلێمەوە چی بڵێم؟ خۆ ناتوانم بەربەستێك بۆ ئەم لافاوە دروست بکەم وخۆم و بازنەکەم لە ناو ببات. تا دێت ئەم بازنەیە تەسك دەبێتەوەو وگەمارۆم دەدات وەکوو داری لاولاویش ئاڵاوەتە لەشمەوە شەوان دەبێتە گوریس و ملم جەڕ دەدات و تەوژمی خوێنم لە گەردن و قوڕگم پەنگ دەخواتەوەو تا دێت خەونەکانم دەبنە دایکی ئاڵ و خەونە خۆشەکانم دەخنکێنێت .

ئێ‌یە!!خۆ ئەم بازنەیە ئەمەندە تەسکە هەر بەقەد ئەلقەی پەنجەی دەستی چەپمەو هەمیشەیشە نە دەتوانم بەدادنەکانم ببیرم و نەئەویش داس ئاسا لەناو قەدمەوە دەمکاتە دوو بەشەوە. .بۆتە. . . .دەی. . شەوەکە. .کە بەجێت هێشتم ودوو هەنگاو لێم دوور کەوتیتەوە، وردە وردە هەنگاوە گومان لێ کراوەکانت بەدزی بوونە زنجیری ئەم بازنەیە فێڵت لێ کردم وکلیلی قاسەی ناخمت لە گیرفانتا شاردەوەو بردت، ویستم بەدواتا بکەوم لەشوێنی خۆمەوە هاوارێك بکەم کەچی زنجیرەکە هەردوو قاچمی بەست و لێوەکانمی کلیل دا و نیو ملیمەتر نەمتوانی لە شوێنی خۆم دا بجووڵێمەوە. نەم زانی چی بکەم ناو بەناو ئاوڕت دەدایەوەو دەستی ڕاستت بەرز دەکردەوەو وەکوو بڵێی:

- بمێنە، بەم شێوەیە . . .تا دێمەوە خۆم ئازادت دەکەم.

نەهاتیت خۆت لە نێو بەرازەکان مەڵاس داوە و منیش لە بیابانێکی بێ ئاسۆ وبێ بنمێچ بۆ زریان و ڕەشەبا بە ڕووتی بە جێ هێشتووە. ئەڵقەکانی زنجیرە لەیەك ترازاوەکانیش وەکوو بڵێی بەبزمار کوتراونەتە زەمین و ئەمیش لەتاوا ناتوانێت بجووڵێتەوە. هەتاوو مانگیش ناوبەناو دێنە بەر پێم و هەوڵ دەدەن زنجیرەکە بتوێننەوە بەڵام گەرمی‌ی ڕاستی و تیشکیان لە ئاستی ئەم زنجیرە ڕەشەدا هەڵئەگەڕێن وپشتاو پشت دەگەڕێنەوە.

مەرجی زەنجیرەکەم زۆر قورسە ناتوانم بەجێ‌ی بێنم دەبێت خۆم بگۆڕم و بەرگێکی تر لەبەر بکەم ،ئەم کەللە ڕەقەیش بۆ خوا نەبێت بۆ کەس سەرشۆڕ ناکاتەوە. . وەرە ئەی پەڵە هەورە ڕەشەسوورە چڵکنە بیە بە بەرماڵ و با دەست نوێژێکی تایبەتی بە تاوانی ئەو بگرم و لێرەوە فوویەکی لێ بکەم بەڵکو باڵ بگرێت و بە چرنوکی ئەم بازنەیە لە پێستی پێ‌و پلم بکاتەوەو دەست بە ملی بکەم و بێ تاوانیم لەنێو تاوانەکانی دا بتوێتەوە!! وەرە وەرە ئەی پەڵە هەورە چڵکنە مەڕۆ وەرە کچێ مەڕۆ مەڕۆ وەرەباڵێوەکانمان لە نێو بازنەکە بەماچێکی بێ‌خاوەن بتوێنەوە وەرە مەڕۆ.

کورته چیرۆك

# کورسی



● مکرم رشید تاڵەبانی ●

فەرمـانی بۆ دەرچـوو، پێش ئەوەیش یارمـەتیـدەر پێوەندیی پێوە کردو لە گەڵی ئاخافت و، پێی ڕاگەیاند:

ـ ئەو پلەوپایەم بۆ تۆ هەڵبژاردووە!

بەتـاقیکـردنـەوەو هەڵس وکـەوت بۆی دەرکـەوتبوو لە تواناىدا هەیە ئەو ئەرکـە ڕابپـەڕێنێت، بۆ . . نـا . . ئـەوە چەند ساڵە لە هەمان ئەو شوێنەدا ئیش دەکـات و، بەتـەواوەتی شارەزای توانـاو لێهـاتوویی بووە، ئەمیش هیچ خۆی نەشڵەژاند، وەڵامی ئەوەبوو:

ـ هەرشتێکم پێ ڕاسپێرن ناڵێم نا . .

کارەکەی ئەنجام دەداو بێ پشوودان ڕایدەپەڕاند!!

بۆبـەیـانی بەپێلکـەکـان دا سـەردەکەوت، هێشـتاکە دەرگای ژوورەکەی نەکـردبـووەوە، مامۆستا (دلێر)لەبەردەمیدا قوت بووەوە، مەچەکی توند گرت و بەرەو ژوورەکــەی خۆیـی برد، خۆی لێی دانـیـشـت و، ئەم بەپێـوەوە، بەدەم دانیشتنـەوە چەنـد کاغـەزو نووسـراوی دایـە دەست و لەگەڵیان دا ووتی:

ـ ئاگـات لە ئەمـانـە بێت . . دەمـەوێت زوو چاو هەڵبهێنن!! دۆست و خاوەندەکانیان پەیوەندییان پێوە کردووم دەبێت دەست وبرد بکەیت!! ئەم هەر سەری بۆ لەقـانـدو، بەهـەزار ویـەك بیـانـوو خۆیی لەدەست ڕزگار کرد، کەلـە ژوورەکـەی خۆی جێگیر بوو . . ئەوەندەی زانی بوو بەشارە مێروولـەو . . چەنـدان ناسیـاوو نەناسیاو تەنگیان پێ هەڵچنی . . ئەوی سـەرقاڵیش دەبوو کارەکانی ئەنجام بدات و بۆشوێنە کەی تر . . بگەڕێتەوە . . !

ئەم نووســراوی دەدایـە . ئەوی‌تـر هەواڵی نووسـراوێکی پێـراری لێ دەپـرسی . . ئـەوەکەیتر گللەیی‌و گازەندەی لە دواکەوتنی چاوهەڵهێنانی نووسینەکەی دەکرد . . ئیتر کابرایان وورو کاس کرد . . نەی دەزانی چۆن دەم بکاتەوە . . جار ناجاریش لەگەڵ دۆزینەوەی وەڵامی ڕاست و ڕوون دا . . دەمی بەتەڵەی تەقیوو، چاوی ئەبڵەق دەبوون، مێشکی لە کار دەکەوت!!

شتێکی سـەیــریش گوزەرانی ئەو ڕۆژانـــەی لێ تاڵ کردبــوو سەرەڕای سـەرقـاڵی وکـەم کاتی!! . . نـەی دەتوانی‌لێرە بۆ ئەوێ بجووڵێتەوە، لەناو ژووردا، لە بەر دەرگــادا، لە ئۆتــۆمبیــل دا، لەنـاو ڕێـڕەودا، لەکـاتی دابـەزین بەپێلکـەو، لە هەرشـوێنێـك دا بوایـە . . هەرخەڵك بوون و، بەڕووخـۆشی و پێکـەنین وبـزە لەسـەر لێـوەوە تاویـان دەدایەو تەوقەیان لەگەڵ دەکرد . .

ـ هەر لە خۆت دەوەشێتەوە!

ـ پیاوی شیاو . . لەشوێنی شیاودا!

ـ ئەو شوێنە هەر شایانی تۆیە . . !

زڕەی تەلـەفـۆنـیش لەولاوە ڕابــووەستێت، یەکێــك پیــرۆزبــایی دەکرد . . یەکێك گلەیی دەکرد . .

ـ کاکی برا خۆت شاردووتـەوە، باچـاومـان پێت بکەوێت . . هەرنە بێت تاوێك دانیشین . . دووقوم هەڵ بدەین و چوار قـسەی لێ بکەین . . !

یەکێکی تر:

ـ من هەر گوتــوومــە لەملی مـا ئەو شوێـنـەیـت . . شوێنی دەست ڕەنگینیشت دیارە . . ئەوەنییە . . تەماشاکە . . بەخوا هەر لە هەموو لایەك باسم کردوویت!! دە . . . دیار بە . . دیار!! نەی دەتوانی بەناو بازاڕدا تێ

بپەڕێت. هەر ناسیاوو نەناسیاو بوون مەچەکیان ئەگرت

- بەخوا ئەم شەو دەچین. لەیانەی(...)ئەحمەت سەری خۆمان گەرم دەکەین..!

ئەویش بەهەزاران بیانوو.. بەهەزاران پەرسەوەو تکەو سوێندو بەڵێن. خۆی لێ ڕزگار دەکرد.. بستێك ئەچوو.. یەکێکی تر.. لەولاتر تەنگی پێ هەڵ دەچنی. هەمان داخوازیی بە گوێ دا دەدا!! هەڵچوونی دەگەیشتە ترۆپك. بەپاڕانەوە خۆی لەئەویش دەرباز دەکرد!!

ماوەیەك ژیانی بەو جۆرە کەوتە بەر شاڵاوی مەترسیی سەرقاڵیو تەلەفۆن بۆ کردن و سۆراخ پرسین و لەدوو گەڕان، کە ئەرکەکەی خۆی بەسەرکەوتوویی ڕادەپەڕاند!.. تارادەیەك یارمەتیدەر زۆری پێ خۆش بوو، ئەو ووشانەی لەزار ترازابوون:

- لەزووەوە چاووم بڕیبوویە!

لەم لاوە ئەم هەر سکاڵاو ئاخ و ئۆفی لە دەستی ئەو ئەرکە دەردەبڕی. حەزی لەوشوێن و پایەیە نەبوو. لێوی لێ هەڵ دەقورتاند.. زۆر جاریش لەبەردەم برادەرانیناسیاوان دا دووبارەو سێ بارەی دەکردەوە:

- ئەو شوێنەم ناوێت.. نامەوێت.. لەوێ دانیشم. نا نا..!!

وەڕسی نەیگرتبوو، ڕێگەی داهێنان و ئازادیی بیرکردنەوەی لێ تەنیبووەوە!! ئەویش حەزی بە ئازادیی بیرکردنەوەو داهێنان و خوێندنەوەو خۆخەریك کردن بە ووشەوە بوو.. شەیدای خامەو ووشەو کاغەز بوو!!

سەر لە بەیانییەك یارمەتیدەر.. بەدوویدا نارد:

- تۆناڵێیت لەو ژوورەدا دانانیشم.. ئەو شوێنەم پێناخۆشە..!

ئەویش بە زەردە خەیەکەوە وەك بڵێیت چۆلەکەیەکە دوو باڵی ئازادبوونی لێ ڕوواوە گوتی:

- بەڵێ گوتوومەو.. پێی لێ دەنێم!

یارمەتیدەر لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی:

- بۆیە بڕیارمان دا.. ئەو شوێنە بەجێ بهێڵیت و.. لە ژوورکەی تر دابنیشیت. کلیلەکەیش بە(دڵدار)بدە.. ئەو لەو شوێنە دادەنیشێت!!

گێتیەك شادیو کامەرانی خۆی هاویشتەنێو دەروونیەوە.. وەك پاساری تازە فێری باڵەفڕێ بوویێت. فڕی.. فڕی. ئیتر خەڵکەکە کە بینییان وای لێهات.. دوێنێ وەك نیسك، ڕوویان تێ دەکرد.. بۆی پێ دەکەنین. لەدووی دەگەڕان. پەیوەندییان پێوەدەکرد. سۆراخیان دەکرد. بانگە ڕاهێشتنیان بۆساز دەدا.. هەردوو ڕووەکەی خۆیان ڤەشێردو چاویان نوقاندو ڕۆیشتن!! ئەمیش لە شوێنەکە مۆر بووەوە.. بۆی بکرایەت دەیسووتاند. هەموو تاوانەکە تاوانی شوێنەکە بوو.. ئەو خەڵکەی واڵێ کرد.. بۆیە دروشمێکی بۆخۆی هەڵبژارد.. تا لە ژیان دا مابێت ئوقرەی شوێنی لەو جۆرە نەکەوێت!!

١٩٨٨/٣/٢٨

---

# یانەی بەیان

سیڤەر

## چرپەیەك

جێگەی شادمانییە وخۆم بەبەختەوەر دەزانم کە ها ئێستا خەرمانەیەك کورتە چیرۆکی هونەری وفۆلکلۆریو ئەفسانەیی وەرگێڕدراو لە بەردە ستمایە وخەریکە یەکەیەکە دەیانخوێنمەوەو لەتەك برایانی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤارەدا منیش رای خۆم وبۆچوونی خۆم هەڵئەخەم...!

شادی وبەختەوەرییەکە لەوەدایە کە خەریکە بەشێ لەم وەچەیە پەیتا پەیتا دەرك بە دەوروگەورەیی ئەم (هونەرەبەرز)و (شارستانی)یە دەکات ورووی بۆ وەرچەرخاندووەو ساتوسەوای لەگەڵ دەکات..! هەرچەندەیش هێشتا مەسەلەکەی لەلادا کاڵەو بەباشی پێنەگەیوە، بەڵام دەرك کردنەکە خۆی لەخۆیدا مایەی شادمانی وتێرامانێکی وردە..!!!

هەربۆشە ئەبێ هەموو لایەکمان مشووری ئەم (دیاردە)یە بخۆین وئەوەی پێمان دەکرێ بۆ بە جێگەیاندنی دیاردەکە وجۆشدانی بەهرەوتوانای ئەم لاوانە دریغی نەکەین.. لە ئەنجامیشا بێگومانم ئەگەینە شتێك ولەوانەشە چەندین بەهرەمەندی ئەم هونەرە بەرزە، لەکۆری ڕۆشنبیری وژیانی ئەدەبیمانا سەرهەڵبدەن و بین بەشت و ئامادەبوونی خۆیان بسەلمێنن.. بەمەیش هەم خزمەتی فیکروجوانی وهونەر ئەکەین، هەم لەئاستی لێپرسینەوەدا ئەبین وهەم گەڵێ توانای متبوو ئەدۆزینەوە وهەم لە جۆش و کوڵی (شیعرۆکەومیعرۆکە!)ئەو لاوانە دوردەخەینەوەو ڕاستە ڕێیان پێنیشان ئەدەین..!!

مایــەوە ئەوەش هەڵنــەبــوێــرم وبڵێم : بۆ ئەوەی شادمــانی هەمــوو لایــەکمــان تا سەر بێت وئــەم دیــاردەیــەش پەکی نەکــەوێت وبگاتە ئەنجام، ئەبێ ئەو لاوانــە، بەوردی بەخــۆیاندا بچنەوە، بەوردی و بەردەوام شاکــاری خۆمــاڵی وجیهــانی بخــوێننــەوەو بەوردیش لە جیهانی بەربڵاوو باری قورسی ئەم هونەرە تێبگەن وهەڵگرن وسڵ نەکــەن، بەتــەجــرەبــەیــەك ودووش نەکــراوە ونــەبیستــراوە یەکێ بێ وبــەهــەڵــەداوان بڵێ : بەخێــر وامنیش بووم بە(چیرۆکنووس!) وچش. . نــەء! لێپــرسینەوەکە زۆر قورسە، زۆریش قورس، ئەم هونەرەش زۆر گرانە وزۆریش گەورەو بەهێز، بۆیە کە گەیشتن بە ئامــانــج و ئەنجــام، مانــدووبــوون و شەوەبخــوون و پشــودرێژی وسوتان وعیشقی بەردەوامی ئەوێ، ئەگینا هیچ بە هیچ ناکرێ!؟

## بروسکە وەڵام

* بۆ خاوەنی چیرۆکی(غەمگین - بۆنی نان - ئۆردوگای هیندیە کان - نامەکــانمــان)کــاك(ع . ف) : کاکــەگیــان تۆ زۆر بەختەوەری کە زمــانێکی بیگــانــە ئەزانیت، هەوڵــەکــانت زۆر پیــرۆزن وشــایانی رێــزلێنــانن، بە لام خۆزیــا زیــاتــر خۆت بە(زمــان)ی زگمــاکــەوە خەریــك بکــەیت وزیــاتــریش لەکــاتی تەرجــەمەکردندا ئاگاداری کەشــوهەوای هەریەکێ لەو چیرۆکنووسانە بیت و بەوردیش بچیتە نێوتان وپۆی ئەم هونەرە زیندووەوە. . بەردەوام بە. . !

* بۆ خاوەنی چیــرۆکی(بــرینــەشــاراوەکــە - گوڵــەشێت - فرین لە دووتــۆوی ئەڤینێکی نامــۆدا - یەکــەم هەوڵــدانی فرین - مردنی موچــەخــۆرێك - قەت تێ ناگات - چۆن ئەتوانم - لەسەر شانۆکە - خۆ دۆزینــەوە - ئافــرەتێکی تێکشکــاو - فانــا - نەنــاس - دەس پێشکــەریــەکی رۆژنــامەنووسانە - ئەوشەوەتیش بەسەرچوو - تۆمی گرێ- بەدرێــژایی شەورادەکــات - ورینــە - ئەرکی نەتــەوایــەتی - دەستــە ی بەرێوەبــەر - رزگــار - پاڵەوانی رم هاوێژ - باخچە - پێش دەرگــای ماڵــەوە - تەنیــایی - دوو راوچیــەکە - پاشاو وەزیر - دەردی کۆمــەڵ - کوری چیــا - مامــەڵــەی نەعــامــەکــان - سعیــدوسعدی - پەشیمانی- تە روشك. . »

برایان، خوشکان :

هەر هەمــوو هەوڵــەکــانتان پیرۆزە، بەتایبەتیش کە رووتان کردۆتە ئەم هونــەرە بەرزەی شارستــانیــەت، هونــەری چیرۆك وخۆتان پێ خەریــك کردوە وئــەتــانــەوێ شتێ بکــەن! کەچی ئەوەی کە - نەك هەرتەنیا من لەم گۆشە یەدا - بەڵکو هەر هەموو دەستەی نووسەران لەو بەرهــەمــانــەی ئێوە بەرپرسیارن وهەر یەکە جۆرە رایەکی خۆی دەربــارەی هەر یــەکــێ لەو هەیــە ، ســەربــاری رای منیش، راوبۆچوونەکانیش - دەستەی نووسەران - بەم شێوەیە کەوتۆتەوە :

١ - بڕیــاردراوە هەر بەرهــەمی تەرجەمەئەکرێت لە ئەسڵی زمانەکە بێت و بەرچاوی زوربەی خوێنەرانیش نەکەوتبێت.

٢ - گەر لە زمــانێکی ئەوروپــا یــەوە بوو، وا پەســەنــدتــرە ئەســڵ وسەرچاوەکە بنێرن بۆ دەستەی نووسەرانی بەیان.

٣ - هەنــدێ لەم بەرهــەمــانە زۆر خراپ و بەخەتێکی شروناشرین نووسراونەتەوە، بۆیە خرایە پشت گوێ.

٤ - هەندێ لە هەردوو دیوی لاپەڕە نووسراوەتەوە هەمدیس خرایە پشت گوێ.

٥ - هەندێ بەخەتێکی زۆر زۆر ورد نووسراوەتەوەو ناخوێنرێتەوە وخرایە پشت گوێ.

٦ - هەندێ چیرۆکی هونەریی نین، خرانە پشت گوێ.

٧ - هەندێ زمانی وەرگێرانەکەی زۆر ناقوڵاو خراپە خرایە پشت گوێ.

٨ - هەنــدێ هەر زۆری ماوە - نووســەرەکــانی - لە زمــان بگــەن و هەروا بەئاسانی تەرجەمەیان کردووەو خرایە پشت گوێ.

٩ - هەنــدێ لەو نووســەرانــە، هێشتا زۆریان ماوە لە ئەلف وبێی ئەم هونەرە بگەن خرایە پشت گوێ.

١٠ - هەندێ چەند شتێکی لە گۆڤارو رۆژنامەکانی وڵات وەرگێراوە هەموو لایەك خوێندویە تیەوەو خرایە پشت گوێ.

جا ئێــوە خۆتــان ســەرپشــك بن لەم (پشت گوێیــانــە)و بزانن هۆی بڵاونــە کردنــەوەکــەی چی بووە. . ئومێدەواربشین قەڵەمتان هەر لە برەو دا بێت و دو دڵ مەبن وبەردەوام. . !!!



## دوو وشە

کوردم ئەمەوێ بڵێن کورد بووە — بۆ کــــوردایەتی مـــۆم وپردبووە

ئەگینا هەرچەند بانگم کەن زانا — بێ وشەی کوردی پووچە و بێ مانا

# لــــــە یــــادی ڕۆژی
# کۆچ کردنی «د. کامل البصیر» دا

لە ڕۆژی ٢٢ / . ١ی ساڵی پاردا، پیاوێکی هەڵکەوتووی میللەتەکەمان و ئەستێرەیەکی گەشی کاروانی ڕۆشنبیری و ئەدەبیمان لە ناکاو کشاو لە کۆڕی ئەدیب و نووسەران ماڵ ئاوایی کردو جێگای بە بەتاڵی مایەوە.

کاتێ کەسێکی ئاسایی دەمرێت هەر لە گەڵ مردنیا بەرە بەرە ناویشی دەکەوێتە نێو دەفتەری لە بیرچوونەوەوە، بەڵام کۆچ کردنی زاناو ئەدیب و ئەوانەی لە خزمەتی نەتەوەکەی خۆیان و مرۆڤایەتی دا جێ دەستیان دیارە، با لە بەر چاوانیش نەبن، لە ویژدان و ناو دڵی ڕۆڵەکانی میللەتەکەیان دا دەژین، تاکو تاقە کەسێکی ئەو میللەتەش بمێنی یادی خێری دەکرێتەوەو فەرامۆش ناکرێ. ژیانی پڕ لە خزمەتی «د. کامل حسن البصیر»و بەرهەمە بە نرخ و سوود بەخشەکانی، ڕێ نمایی پێگەیاندنی دەیان قوتابی خوێندنی باڵا، ڕای زانستیانەی لە بوارەکانی ئەدەب داو چالاکی نێو لیژنەکانی زمانی کوردی لە کۆڕی زانیاری، ئەمانە تێکڕا شایەتێکی چاکن بۆ ئەم پیاوە. لەخزمەت کردنی ئەدەبی عەرەبیش دا ڕۆڵی دیاری هەبووەو برا عەرەبەکان خۆشیان پێی لێ دەنێن و گەواهی بۆ دەدەن.

هەروەها مامۆستای خوا لێخۆشبووەد. کامل البصیر» لە مەیدانی ڕەخنەی ئەدەبی دا بەرهەمی دیارو نایابی وای بۆ بەجێ هێشتووین کە کەلێنێکی گەورەیان لە کتێبخانەی ئەدەبی کوردی دا بۆ پڕ کردووینەوەو هەمیشە وەکو سەرچاوەیەکی پرشنگداری نووسینی ڕەخنەی کوردی نووسەران سوودیان لێ وەردەگرن.

لە مەیدانی ناساندنی ئەدەبی کوردیش، بە برایانی عەرەب، کارو کۆششی مامۆستا لە بیر ناچێتەوە. باس و لێکۆڵینەوەکانی لە گۆڤارو کۆڕو کۆبوونەوەکان دا بەرهەمێکی بە نرخ و بەهادارن، لە کۆڕی ئەدەبی عەرەبیش دا لە ڕەوانبێژی و زانستی جوانناسی دا گۆی هونەری بردۆتەوەو کتێب و دانراوەکانی بە زمانی عەرەبی نموونەی دەست ڕەنگینی و زیرەکیی نووسەرانی کورد دەگەیەنێ لە مەیدانی خزمەت کردنی ئەدەبی کۆن و تازەی عەرەبی دا. ڕەنج و تەقەلاکانی مامۆستا لەم ڕووەوە نموونەی پتەوکردنی برایەتی کوردو عەرەبەو بناغە دانانی پێشکەوتنی ڕۆشنبیری یە لەم وڵاتەدا دەزگای ڕۆشبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی کەلە ١٩٨٧/١١/١٥دا کە هەمیشە ڕێز لە نووسەرو ئەدیب و خزمەت گوزاران و پیاو چاکانی ئەم میللەتە دەگرێ بە ئەرکی سەرشانی خۆی زانی کە چلەی بۆ گێرا، ئێستاش یادی ڕۆژی کۆچ کردنی دەکاتەوەو چەپکە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگیش لەسەر گۆڕی دادەنێ. هەزار سەڵاو لە گیانی پاکی د. کامل البصیر و هەموو ئەوانەی لە خزمەتی میللەتەکەی خۆیان دادوانەکەوتن

بەیان
مجلة ادبية شهرية
تصدر عن وزارة الثقافة والاعلام
دار الثقافة والنشر الكردية
بغداد

رئيس التحرير
مصلح مصطفى الجلالي




**BAYAN**
Literary Monthly Magazine
Ministry of Culture and Information
Issued by: The Kurdish House for Culture and Publishing
Baghdad - Iraq

EDITOR IN CHIEF
***MUSLEH MUSTAFA JALALY***

دار الحرية للطباعة

نرخي «٤٠٠» فلس